## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی - القسم العربي



### بەشی ئینگلیزی

## ڕێنمایی بڵاوکردنەوە لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی

- گۆڤـاری ئـەکادیمیای کـوردی، گۆڤـارێکی زانسـتی وەرزییـە، بـاس و توێژینـەوەی زانستی تایبەت بە مەسەلەکانی کـورد و کوردسـتان بـڵاو دەکاتـەوە، بەمـەرجێك لـە هیچ شوێنێکی دیکە بڵاو نەکرابێتەوە یاخود بۆ بڵاوکردنەوە وەرنەگیرابێت.
- زمانی بڵاوکردنەوەی باس و توێژینەوەکان لە گۆڤارەکەدا کوردی و عەرەبییـە، ئـەو باس و بابەتانەش کەوا سەروکاریان لەگەڵ مەسەلەکانی کورد و کوردستان هـەبێت، ئەگەر بە زمانی دیکەش بن، بڵاودەکرێنەوە.
- پێویستە توێژەر لە لاپەڕەی یەکەمی توێژینەوەکەیدا، ناونیشـانی باسـەکەی، نـاو و ناسناوی زانستی، شوێنی کارەکەی، ئیمێڵ و ژمارەی تەلەفۆنی خۆی بنووسێت.
- لـە هەڵبـژاردنی ناونیشـان و نووسـینەوەی توێژینەوەکانـدا، پێویسـتە ڕەچـاوی بنـەماکانی میتـودی زانسـتی بکرێـت. لەمەسـەلەکانی پەیوەسـت بـە ڕێکخسـتنی سەرچاوە و چۆنیەتی سوودوەرگرتن لێیان، وەکو چۆن پێویستە نووسـینی بـاس و بابەتـەکان بـە زمـانێکی زانسـتی شـیاو بێـت، بـە پێچـەوانەوە هـەر توێژینەوەیـەك پێڕەوی لەم بنەمایانە نەکات لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە وەلادەندرێت.
- پێویسـتە توێـژەر پوختـەی توێژینەوەکـەی بـە دوو زمـانی دیکـە، جگـە لـە زمـانی نووسـینی دەقەکـەی لـە کۆتـایی توێژینەوەکەیـدا بنووسـێت، بەمـەرجێك لـە یـەك لاپـەڕەی A4 زیـاتر نـەبێت و تیایـدا گرینگـی باسـەکە و ئەنجامـە سـەرەکییەکانی توێژینەوەکەی بخاتە ڕوو.
- هـــەر بـــاس و بابـــەتێك لـــەبارەی ســـاغکردنەوەی (پەیـــدۆزی، تحقیـــق) ی دەستنووسـەکانەوە بێـت. پێویسـتە پەیدۆزییەکـە بـە گـوێرەی بنـەما زانسـتییە کارپێکراوەکانی ئەو بوارە ئەنجام بدرێت. هەروەها چەند لاپەڕەیـەکی کۆپیکراو و، زانیاری تەواو سەبارەت بە دەستنووسەکە و شوێنی هەڵگرتنی بخرێتە ڕوو.
- دەبـێ بـاس و بابەتـەکان بـەجۆری فـۆنتی یونیکـورد بنووسـرێن. لەمەسـەلەی بـەکارهێنان و ڕێکخسـتنی سەرچـاوەکان پێـڕەوی لـە شـێوازی هارفـارد بکرێـت. ناونیشـانی بـاس و توێژینـەوەکان بـە فـۆنتی قـەبارە (١٥) بێـت، نـاوی توێـژەر و توێژەران لەگەڵ ناونیشانە لاوەکییەکان بە فۆنتی (١٤) و دەقی باسەکەش بە فۆنتی (١٣) بێت.

- لەکاتی سوود وەرگرتن لەو باس و بابەتانەی کە لە گۆڤارەکاندا بڵاوکراونەتەوە، بەم شێوەیە ئاماژە بە سەرچاوەکەی دەکرێت: ناسناو و ناوی نووسەر، ڕێکەوتنی دەرچوون، ناونیشانی باسەکە، ناوی گۆڤارەکە (لەنێوان دوو کەوانەدا)، ژمارەکەی، شوێنی دەرچوون.
- هەموو باس و بابەتێك بە (٣) دانەی سەرکاغەز و دانەیەکی سەر (CD) پێشکەش دەکرێت، بەمەرجێك ژمارەی لاپەڕەکانی، بە هەموو وێنە و خشتە و سەرچاوەکانەوە لە (٢٥) لاپەڕە تێپەڕنەکات.
- دوا بەدوای پەسەندکردنی هەر توێژینەوەیەك لەلایەن هەڵسەنگێنەرانی پسپۆڕەوە، توێژەر دانەیەك لە نووسراوی پەسەندکردنی توێژینەوەکەی لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە پێدەدرێت. لەدوای ئەوە توێژەر بۆی نییە باسەکەی پێشکەش بە هیچ لایەنێکی دیکە بکات، بە بێ نووسراوێکی ڕەزامەندی لە لایەن سەرنووسەری گۆڤارەکەوە.
- دەستەی نووسەران ئەو مافەی دەبێت کەوا هەندێك برگەو دەستەواژەی توێژینەوەیەك لابدات، یا بگۆڕێت و دووبارە دایبڕێژێتەوە تاوەکو لەگەڵ ڕێنماییەکانی بڵاوکردنەوە لە گۆڤارەکە دا بگونجێت.
- چۆنیەتی ڕیزکردنی باس و بابەتەکان پەیوەندی بە ڕێبازی بابەتبەندی گۆڤارەکەوە هەیە نەوەکو بابەت و بایەخی توێژینەوەکان، یاخود پلەو پایەی زانستی توێژەرەوە.
- گۆڤاری ئەکادیمیا ئەو باس و توێژینەوانەی کەوا لە نامەکانی ماستەر و دکتۆرا وەردەگیرێن، واتە (مستل) ن، بڵاوناکاتەوە.
- هەرباس و بابەتێك کە ڕەزامەندی لەسەر بڵاوکردنەوەی نادرێت، بۆ خاوەنەکەی ناگەڕێندرێتەوە.

# بنياتی بنجی وشەی (حەز) و هاوڕیشەکانی لە زمانی کوردیدا

**پ.د. فاروق عومەر سدیق**
ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی
کۆلێجی زمان - زانکۆی سلێمانی

**پێشوتە:**

یەکێک لەو چەمکە گرنگە ئونیڤەرساڵانەی کە لە دێرزەمانەوە تا ئەمڕۆ بەشێکی هەستپێکراوی لە مێشکی مرۆڤدا، گرتبێت، ئەوەیە کە لە زمانی کوردیدا بە وشەی (حەز) دەربڕاوە.

وشەی (حەز) لە فیڵدە واتایەکی دەوڵەمەندی فرەئەندامدا کە هەریەکەیان دەربڕی بەشێکن لە واتاکەی سەنتەری گرتووە. لە زمانناسی کوردیدا، تایبەتێتییە سیمانتیکی و لێکسیکی و مۆڕفۆلۆژییەکانی وشەی (حەز) و هاوڕیشەکانی لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی تەرخانکراو، بۆیان، تا نوسینی ئەم باسە ڕوناکی نەبینیوە.

لابردنی تەمومژ لەسەر لایەنە شاراوەکانی ئەم وشە ئەکتیڤە و گەیشتن بە جەوهەری ڕاستەقینەی بنج و بناوانی، هاندەری هێنانە کایەی ئەم باسەن کە بۆ یەکەم جارە، زمانناسی کوردی پێ دەوڵەمەند کراوە.

ئەم باسە لە پێشوتە و سێ بەش و ئەنجام پێک هاتوە(١):

لە یەکەم بەشدا: تایبەتێتی سیمانتیکی و لێکسیکیی (حەز) نیشاندراون.

لە دووەم بەشدا: ئێتمۆلۆژی وشەی (حەز) یەکلایی کراوەتەوە.

لە سێیەم بەشدا: تایبەتێتییە مۆڕفۆلۆژییەکانی (حەز) خراوەتەڕو.

# یەکەم بەش

## تایبەتێتی سیمانتێکی و لێکسیکیی وشەی (حەز)

بەپێی یەکێک لە پۆلێنکردنەکانی وشەکانی زمان لەسەر بناغەی گەیاندنی چەمکی کۆنکرێت و ئەبستراکت، دەکرێت. وشەی (حەز)ی دیالێکتی خوارو، (حەز)، یا (حەژ)ی سەرو، (حەز)ی گۆران، دەچنە ناو گروپی ناوە ئەبستراکتەکانەوە. وشەی (حەز) هەرچەندە لەبنجدا لە ڕەگ و ڕیشەیەکی ئێرانی کۆنەوە داکەوتوە، بەڵام بەم فۆڕم و چست و چالاکییەی ئەمڕۆ لە کوردیدا لە کاردایە، ئەوەندەی ئێمە بزانین لە هیچ زمانێکی ئێرانیی هاوگروپی کوردیدا بەرچاو ناکەوێت، واتە ئەم وشەیە، تەنیا لە کوردیدا بەکاردێت، ئەمەش، بەڵگەی بەرەو سەربەخۆ چونی فەرهەنگی کوردییە لەناو گروپەکەی خۆیدا. وشەکانی زمان لەسەر بنەمای لەیەکچون و یەکبون و نزیکی سیمانتیکی کە پێکەوە گرێیان دەدات بەیەکەوە دەبەسترێن، بەپێی لۆجیک و بە گوێرەی ئەو واتایەی کە دەری دەبڕێن لە فیلدە واتادا خۆیان ڕێک دەخەن و هەر یەکێکیان بگریت دەربڕی بەشێک لە واتای ئەو چەمکەیە کە بوە بە ئەندام تیایدا.

هەمو فیلدە واتایەک بەگوێرەی پێویستیی کۆمەڵ بەو چەشنە واتایانەی کە لە ئەنجامی جموجۆڵ و ئاڵوگۆڕ و نوێبونەوە و ئەو گۆڕانانەدا، سەرهەڵدەدەن کە بەسەر پەیوەندییە هەمە جۆرەکانی نێوان عەقڵ و هۆش و بیری ئەندامانی کۆمەڵدا، دێن، دێنەکایەوە. نەشونماکردنی ئەو فیلدانەش لە ڕووی ژمارە و چۆنێتی و سستی و چالاکیی ئەندامەکانییەوە بەستراوە بەو پێویستییانەوە.

ئەندامی هیچ فیلدێک تا سەر چەسپاو و جێگر، نییە، بەڵکو بەپێی پێویستییەکانی ڕۆژانەی خەڵکی بەواتاکانیان هەمیشە لە بەرز و نزمیدان، جگە لەوە، وشە بۆی هەیە لە یەک کاتدا لە چەند فیلدێکدا، ئەندام بێت، بۆ نمونە: (شێر) دەشێت و بۆی هەیە لە فیلدی: گیانلەبەر، شیردەر، گۆشتخۆر، دڕندە.... و هی تریشدا، ئەندام بێت.

وشەی (حەز) کە سەنتەری فیلدەکەی گرتوە لە زمان و قسەدا، بە هەماهەنگی لەتەک فیلدەکانی تردا، کاردەکات، واتە هیچ فیلدێک پەرەوازە، نییە، بەڵکو بە هاوکاری ئەوانیتر، دەتوانێت ئامانجەکانی بپێکێت، مەبەست ئەوەیە کە پێکهاتەکانی فەرهەنگ و هەمو ئاستەکانی تری زمان، بەپێی قانون و دەستور کاردەکەن، واتە یەکانگیریی دانەکانی

زمان، هەڕەمەکییانە ئەرک، نابینن، هەرلەبەر ئەمەشە کە هەرگۆڕانێک بەسەر هەر ئاستێکی زماندا بێت، درەنگ یا زو، ئەوانیتریش، دەگرێتەوە، ئەم قسەیە، ئەوە دەگەیەنێت کە لە دەزگای زماندا، لە نێوان پێکهاتەی ئاستە جیاوازەکانیدا، پتەوترین یەکیەتی هەیە و بە هیچ جۆرێک، دورەپەرێز لەیەکتری ناوەستن، ئەگەروانەبوایە، زمان، نەیدەتوانی لە کۆمەڵدا، گەورەترین و گرنگترین چەکی خۆگونجاندن بێت.

فیلْدە واتای (حەز) فرە ئەندامە، لە ڕوی مۆرفۆلۆژییەوە، دەشێت ئەندامەکانی بکرێن بە (٢) بەشەوە.

آ- لە قاڵبی وشەدا.

ب- لە قاڵبی ئیدیۆمدا.

**دایەگرامی فیلْدی حەز لە قاڵبی وشەدا**



**دایەگرامی فیلْدی حەز لە قالْبی ئیدیومدا**




ئاستی فەرهەنگ بە بەراورد لەگەلْ ئاستەکانی تری زماندا، هیچ وەختێک، خاووخلیچک و سست و ڕاوەستاو و قەتیسماو، نەبوە، بەلْکو هەمیشە لە جولْە و شلْەقاندن و نوێبونەوە و گۆڕاندایە، بەجۆرێک کە لە تەمەنی قسەکەرانی پشتێکدا، هەست بەو گۆڕانکارییە دەکرێت کە بەسەر فەرهەنگدا، دێت. هەر بۆ نمونە: ماوەیەکە لە قسەکردندا، نەک لە زماندا، وشەی (هیوایەت) کە لە فیلْدی (حەز)دا، تازە بەتازە بوە بە ئەندام لەپێناو جێ قایمکردنی خۆیدا و لە خەباتی مانەوەیدا، زۆر سەرسەختانە دژی (حەز) لەجەنگدایە بە چەشنێک، توانیویەتی زۆر بە باشی تەنگی پێ هەلْچنێت و بەرە بەرە لە زۆر شوێندا و لای زۆر خەلْک بەتایبەتی لە بازاڕدا و لای پیشەوەران جێی پێ لەق کردوە و سنوری بەکارهێنانی تەسک کردوەتەوە. لە چەندەها پێکهاتەدا کە جاران بە وشەی (حەز) سازدەکرا بەکارهێنانی ئەوەندە فراوان بوە بە تەواوی جێی ئەوی

گرتوەتەوە و ئەمڕۆ، زیاتر بە بەشداری ئەم، واتە (هیوایەت) بەسەر زاری خەڵکییەوەن، هەر بۆ نمونە لەم پێکهاتانەدا، چوەتە شوێنی (حەز) و تاڕادەیەکی زۆر، ئەوی لەکار خستوە، وەک:

هیوایەتی ئتومبیلی یابانییە، هیوایەتی سەفەرە، هیوایەتی سەیرانە، هیوایەتی ڕیازەیە، هیوایەتی یاری ئاسنە، هیوایەتی بالەیە، هیوایەتی جلی کوردییە، هیوایەتی کەبابە، هیوایەتی سەرو پێیە، هیوایەتی یاپراخە، هیوایەتی فیلمی کارتۆنە، هیوایەتی بەخێوکردنی تەیروتورە، هیوایەتی حەمامە، هیوایەتی ڕەسم گرتنە، هیوایەتی پاک و تەمیزییە.

## دوەم بەش

## ئێتمۆلۆژی وشەی (حەز)

لە زمانناسیی کوردیدا، وردتر بڵێین لە زانستی ئێتمۆلۆژیدا کە لقێکە لە لێکسیکۆلۆژی، ئەوەندەی ئێمە بزانین، ڕاستەو ڕاست و لە چوارچێوەی باسێکی زانستیی تایبەتیدا، دەست بۆ ڕەگ و ڕیشە و بنج و بناوانی وشەی (حەز) تا نوسینی ئەم باسە، نەبراوە، بەڵکو لابەلا و لە (٢) دو فەرهەنگدا کە واتای وشەی کوردییان، تیادا شەرحکراوە بەرامبەر بە (حەز) نوسیویانە:

لە فەرهەنگی یەکەمدا کە لەلایەن زانای ڕوس (پێوتەر لێرخ)ەوە دانراوە، نوسراوە: (ĥaz) لە (حظّ ؟ عەرەبی)یەوە هاتوە، (ĥaz kir) واتە (حەزی لێ کردبو)ی بە نمونە هێناوەتەوە. ( پێوتەر لێرخ ١٨٥٨: ٩)

وەک، دەردەکەوێت (لێرخ) بە دانانی نیشانەی پرسیار لە ڕاکەی خۆی دودڵە و دڵنیا نییە لێی.

لە دوەمیاندا: (تسەبۆلۆڤ) ئێتمۆلۆژی وشەکانی: (حز، هەز، حس)ی کرمانجی سەروی بردۆتەوە سەر (حظّ)ی عەرەبی. وشەی (حز)یشی لەم ڕستەیەدا بە نمونە هێناوەتەوە:

سەبا خەباتا من ئاغا ژ من حز دکر.

واتە: بەهۆی ئیشەکەمەوە ئاغا منی خۆش دەویست.( تسەبۆلۆڤ، ر. ل.٢٠٠١: ٤٦٣)

وەک دەبینین، هەردوکیان، (لێرخ و تسەبۆڵۆڤ)، ڕایان وابوە کە (حظّ)ی عەرەبی سەرچاوەی (حز)ە، تەنیا، ئەوەندە نەبێت کە (لێرخ) بە دو دڵییەوە و (تسەبۆڵۆڤ) بە قەناعەتەوە ئەو ڕایەیان، دەربڕیوە.

بۆ گەیشتن بە جەوهەر و بنجی (حەز) و ئەو واتایەی کە ئەمڕۆ دەیبەخشێت، دەڕوانینە (٢) دو فەرهەنگ:

١- لە فەرهەنگی (خاڵ)دا بەم شێوەیە واتای (حەز) لێکدراوەتەوە:

حەز: ئارەزو: (حەز)م لە پیاوی درۆزن نییە؛ (حەزکردن): ئارەزوکردن؛ (حەزلێ کردن): ئارەزووکردن و ویستنی شتێک.(خاڵ١٩٨٧: ٢١)

٢- لە هەنبانە بۆرینەدا، زیاتر لە واتایەکی ئەم وشەیە ڕونکراوەتەوە لە تەکیانیشدا، فارسییەکانی بەرامبەریان بەم چەشنە، خراونەتە ڕو:

خۆشەویست: (پیروت وەتەن حەزە)، پەسەند و بەدڵ، دڵداری، ئەوین، دۆست، جوان، بەدەو.

فارسییەکانی هاوواتایان، ئەمانەن:

آرزو، اشتها، پسندیده، عشق، دوست، زیبا.

ئەم وشانەش بە نمونە بۆ بەشداریکردنی (حەز) لە سازبونیاندا لەگەڵ کردنیان بە فارسی، هێنراونەتەوە:

حەزکردن: خواستن، بەتەمابون = خواستن

حەزلێکردن: ئارەزووکردن، عاشق بون = آرزوکردن، عاشق شدن

حەزلێکردویی: دڵداری نێوان دو کەس = عاشقی

حەزلێکەری: دڵداری = عاشقی (هەژار١٣٨٤: ٢٢٨)

لە ئەنجامی کنەکردن بەدوای ئێتمۆلۆژی وشەی (حەز)دا لە یەکێک لە زمانە ئێرانییە نوێیەکاندا کە فارسییە و هاوگروپی کوردییە، ڕوبەڕوی وشەی (انگیز) و واتاکانی بوینەوە.

ئەم وشەیە، وەک دەرکەوتوە لە کوردیشدا، بەکاردێت، واتە وشەیەکی ئێرانی هاوبەشە و لە (هەنبانە بۆرینە)دا لەگەڵ بەرامبەرەکەی لە فارسیدا، وا نیشاندراون:

(ئەنگێز): هەڵایسێن، هاندەر، دنەدەر= انگیز.

وشـەی (ئەنگێزە)ش کە لەو سـازبوە، واتـای: هـۆ، مـایەی سـەرەکی دەبەخشـێت = انگیزە. (هەژار١٣٨٤: ٢٨)

وشــەی (شــەڕەنگێز)یش لەم فەرهەنـگەدا لەگەڵ بەرامـبەری لە فارسـیدا ئـاوا لێکدراوەتەوە:

شەڕەنگێز: جنگن، ئاژاوەچی = فتنەانگیز(هەژار١٣٨٤: ٤٨٤)

## واتا و ئێتمۆلۆژی وشەی (انگیز) لە فارسیدا

لە چەندین سەرچاوە کە بە زمانی فارسی و زمانی تر، نوسراون، دەست بۆ واتا و لە هەندێکیشــیاندا بــۆ ئێتمۆلــۆژی (انگیـز) بــراوە، کە بە ڕیزبەنــدییەکی مێژویــی لە بەشێکیان، ورد دەبینەوە:

میلەر دەربـارەی (انگیز) نوسـیویەتی: (انگیز) ڕەگی ئێسـتای (انگیختن)ە، و واتـای (وروژانـدن، پاڵپێوەنـان) دەبەخشـێت، ئەم واتایانەشی خسـتۆتەپاڵ (انگیزە): جـوڵێنەر، پـاڵپێوەنەر، وریـاکەرەوە، ڕاکێشـەر، هۆ(سـەبەب)ی وروژێـنەر. واتـای (شرانگیز)یشـی بە شەڕانی، هاندەری یاخیبون، لێک داوەتەوە.(میلەر ب ف.١٩٥٠: ٨٣، ٥٠٣)

علی اکبر دهخدا، (انگیختن)ی بە چەندین واتا لێکداوەتەوە، وەک: جوڵەپێکردن، هێنانەجوڵە، تەکاندان، ڕاکێشان، هاندان....هتد.

ئەم نمونانەشی لە فارسیدا، هێناوەتەوە کە بە بەشـداریکردنی (انگیز) سـازێنراون: شـورانگیز، آتش انگیز، آرزوانگیز، اشتها انگیز، خشم انگیز، مهر انگیز، رغبت انگیز، ترس انگیز، خیال انگیز، عبرت انگیز، فسادانگیز، دشمن انگیز(علی اکبر دهخدا ١٣٧٧: ٣٦٠٤، ١٤٢٠٦)

مصطفی پاشنگ، ئەم واتایانەی (انگیختن)ی نیشانداوە:

جوڵەپێکردن، تەکاندان، خستنەجۆش و خرۆش، ناچارکردن.

لە لێکدانەوەی (انگیز)یشـدا، نوسـیویەتی: هەرچییەک هـۆی وروژانـدن و هانـدان بێت، ئەم وشانەشی بە نمونە، هێناوەتەوە:

شورانگیز، فیتنەانگیز، غم انگیز.

بەلای (پاشـــنگ)ەوە (انگیـزشangzeš) واتــای (هەڵچــون و وروژانــدنی زۆر)ی گەیاندوە بە ئەسڵیش بردویەتیەوە سەر ڕەگی ئاوێستایی $\sqrt{ank -}$ کە واتای (وروژاندن و هاندان و جوڵاندن) بووە. (مصطفی پاشنگ١٣٨١: ١٤١)

مەکەنـزی، (hangēxtan) ی پەهـلەوی بە (انگیخـتن) و (hangēzišn) دیسـان پەهلەوی بە (انگیز)، داناوە. (دیوید نیل مکنزی ١٣٨٨: ١٨٩)

مهشید میرفخرایی، (hāxt) پەهلەوی کە ڕەگێکی ڕابوردو بوە بەستۆتەوە بە (hāz) کە (هانـدان و وروژانـدن)، یـان گەیانـدوە لەگەڵ (hāzišn)ی پەهـلەوی بە (انگیخـتن)، یەکسان کردوە. (مهشید میر فخرایی١٣٩٠: ٥٦٣)

ناتــل خــانلری، بنجــی (خاســتن)ی فارســی بــردۆتەوە ســەر ڕەگــی $\sqrt{hiz - haiz -}$ی ئێرانی کۆن. (پرویز ناتل خانلری ١٣٩٣: ٩١)

لە زۆربەی ئەو سەرچاوانەدا کە ناومان بردن، ئێتمۆلۆژی (انگیختن) و (ڕەگی ئێستای انگیز) و (خواستن) لە فارسیدا براونەتەوە سەر یەک ڕیشەی ئێرانی کۆن کە بەم فۆڕمـانە ($\sqrt{haxt -}$، $\sqrt{h\bar{a}z -}$، $\sqrt{hiz -}$ ، $\sqrt{haiz -}$) لە ئـارادابوە و بەم واتایانەش: (وروژاندن، هاندان، جوڵەپێکردن، پاڵنان، خواست) لەکاردابوە.

## یەکلاییکردنەوەی ئێتمۆلۆژی وشەی (حەز)

ئەمـڕۆ لە کوردیـدا، (حەز) سـەنتەری فیڵـدێکی گرتـوە، کە ئەنـدامەکانی واتـای (ئـارەزو، مەیـل، ڕەغـبەت، ئیشـتیا، خولیـا، ویسـت و خواسـت) و چەنـدین وشـەی تـری هاوئەندامانی ئەو فیڵدە، دەگەیەنێت.

دیـارە کە مـرۆڤ، حەزی لە شـتێک بـو، هەر ئەو (حەز)ە، دەیوروژێنێت، یـا هـانی دەدات، یا دەیجوڵێنێت، یا پاڵی پێوە دەنێت، یا ڕایدەکێشێت، هەنگاو بەرەو پێکانی ئەو ئامانجە بنێت کە دەیەوێت، یا مەبەستێتی پێی بگات. لێرەدا، (حەز) بە وروژێنەر و هاندەر و جوڵێنەر و پاڵپێوەنەر و ڕاکێشەر، دادەنرێت.

لێرەوە دەگەینە ئەو ڕاستییەی کە (حەز)ی کوردی، هەر ئەو واتایانە دەگەیەنێت کە ڕەگە ئێرانییە کۆنەکە بەخشیویەتی، واتە (حەز)ی کوردیش، سەرچاوەی ڕیشـەکەی هەر ئەو ڕەگەیە.

ئەمە لە ڕووی واتــاوە، لە ڕووی فۆڕمیشــەوە بــۆچی لە (هەز)ەوە بــوە بە (حەز)، ئەمەیان، پێویستی بە ڕونکردنەوەیە:

(تسەبۆلۆڤ) دەربارەی فۆنێمی [ح ḥ] نوسیویەتی: فۆنێمی [ح ḥ] دەنگێکی سەرو قورگییە و ئەوەندە نییە لە زمانی کوردیدا، پەیدا، بوە، زیاتر لەگەڵ، یا لەڕێی وشە عەرەبییەکانەوە، خۆی خزانۆتە ناو زمانی کوردییەوە، تاکو ئێستاش، بەزۆری هەر لەو وشانەدا، بەرگوێ دەکەوێت.

[ح] بەرە بەرە و هێواش هێواش خۆی خنیوەتە سستێمی فۆنەتیکی کوردییەوە. لە سەرەتاوە بەشێوەیەکی مونتەزەم چوەتە جێی فۆنێمی [هـ h] کە دەنگێکی خوار قورگییە و گۆڕیویەتی بە [ح]، بەڵگەمان لێرەدا، ئەو ژمارەیە لە وشەکە لەڕێی [هـ]وە گۆڕاون بە [ح]، بێ گومان قسەکەرانی کورد تاڕادەیەکی باش، هەست بەجیاوازیی فۆنەتیکیی هەردوکیان، دەکەن.

وەک لەم وشانەدا، کە لە عەرەبییەوە هاتونەتە ناو کوردییەوە و فۆنێمی [ح]یان تێدایە، هەر بەو [ح]یەوە هێڵراونەتەوە. واتە، نەیانگۆڕیون بە [هـ]: حاف(لا)< حافە؛ حەب(تۆو)< حب؛ حەیڤان< حیوان؛ حەکیم< حکیم؛ حەد< حد؛ ڕیحان< ریحان؛ ساحیل< ساحل.

لەگەڵ ئەمەدا، نابێت بوترێت کە ئەو جیاوازیکردنە فۆنەتیکییە زۆر توند و تۆڵە، نمونەی وا لەبەردەستایە کە بە دو فۆڕم، لە یەکێکیاندا، [هـ] و لەو تریاندا، بە [ح] لە ئارادان، وەک: هەژاندن ~ حەژاندن؛ هەلیسە (هەریسە) ~ حەلیسە؛ هەری (پیسی) ~ حەری؛ هەیف ~ حەیف؛ هور (ورگ) ~ حور ...... هی تریش.

جێگۆڕکێی ئەم (٢) دو فۆنێمە بە جۆرێک چالاک بوە کە [هـ]ی هەندێ وشەی بە ئەسڵ عەرەبی گۆڕاون بە [ح]، وەک:

هجوم > حجوم؛ هناء> حەنەک (نوکتە)؛ هیدایة> حەدایەت کرن...... هی تریش.

ئەم ئاڵوگۆڕە، هەندێ لەو وشانەشی گرتوەتەوە کە بە ئەسڵ ئێرانی کۆن و نوێن، وەک:

حشک < ئاوێستا (هوشک)؛ حەمو< ئاوێستا (هەمە)؛ حەشت < فارسی (هفت)...... هی تریش.

حــاڵەتی تــریش، هەیە، کە لە ئەســڵدا، وشــەکە [ح]ی تیــادا، نیــیە، لێـرە بــۆی زیادکراوە، وەک: حەسپ< ئاوێستا (ئەسپە-)؛ ڕەحن < ئاوێستا (ڕانە-)؛ مەحین (ماین)< فارسی ناوەڕاست (ماتیکان).

نمــونەی تــریش هەیە کە فــۆنێمی [ج] گــۆڕاوە بە [ح]، وەک لەم (٢) نمــونەیەدا، ڕویانداوە:

حەوشــان (گیـایەکی بـۆن خۆشـە دەکرێـت بە عەتـر) < تـورکی (جەوشــەن؛ حــالی (چەور) < تـورکی (جەغلی). دابەشـبونی وشـە لەنێـوان [ه] و [ح]دا بەپێی هیـچ یاسـایەکی دیـاریکراو، نەبـوە، بە بۆچـونی ئـێمە (تســەبۆلۆڤ)، سروشــتی هەڕەمەکی، پێوەدیــارە. (تسەبۆلۆڤ١٩٧٦: ٦٦، ٦٧)

لە ڕاستیدا، فاکتەری خۆخزاندنی فۆنێمی [ح] بۆ ناو ڕستی فۆنیمە کوردییەکان و چالاکانە کەوتنە خەباتی جێ لەقکردن بە [ه] و قایمکردنی خۆی، نەک هەر تەنیا لە ڕێی زمـانی عەرەبیـیەوە وەک (تسـەبۆلۆڤ) نیشـانی دا ڕوی داوە، بەڵکـو فـاکتەری تـریش لەو بوارەدا لە ئارادابون.

هەرچەندە نکوڵی لەو تەوژم و بەلافاو هاتنە ناوەوەی وشـەی عەرەبی، نەک هەر بۆ نــاو زمــانی کــوردی و چەنــدەها زمــانی میللەتــانی مســوڵمانی تــر، ناکرێــت، بەڵام لەو مەیدانەدا، ئەوە تەنیا فاکتەر، نەبوە، بەڵکو فاکتەری کاریگەرتر لەو مەسەلەیەدا ڕۆڵیان لە ڕێگاو زەمینە خۆشـکردن و ئامادەکاریی و ڕێی تەخـت و لەبـارکردنی قبـوڵکردنی [ح]دا، بینیوە.

بـۆئەوەی لە جەوهەر و سروشـتی ئەو فـاکتەرانەی تـر بگەیـن، بە باشـمان، زانی لە ڕاکانی (ئارانسـکی، ای، م) کە دەربـارەی یەکەم جـاری سـەرهەڵدانی زمـانە ئێرانییەکان و زمـان و دانیشــتوانە هەرە ســەرەتاییەکان (بومییەکــان)ی ئەم نــاوچەیەدا، نوســیویەتی وردبینەوە، ئەوسا، قسەی خۆمان، دەبێت:

لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زاین، جموجۆڵی گروپە گەورەکانی خێڵە ئێران زمانییەکان لە ڕۆژئاوای خواروی ڕۆژئاوای ئاسیای ناوەڕاست، زیاتر بەرەو بەشی ڕۆژئاوایی دەشت و دەرو بیابان و بانەکانی ئێران، هەست پێکراوە.

(نێوان هەردو ڕوبار) و بەشـێکی دەشـت و بانی ڕۆژئاوای ئێران کە دراوسێی ئەوان، بـو لە سـەردەمی کۆنـدا، شـوێنی نیشـتەجێبونی ئەو خێـڵ و قەومـانە بـوە کە زمانەکانیـان

سـەر بە گروپـی زمـانە هینـدۆ ئەوروپاییەكـان، نەبـون. ئەوان لە دۆڵە بە پیـت و بەرەكەتەكانی دیجلە و فوراتـدا، دەژیان و زیاتر بە زمانی (ئاشـوری و بابلی و هی تریش)، دەدوان. لە خواروی ڕۆژئاوا و دۆڵی كارون و كەرخە (خۆزستانی حاڵی حازر).

ئیلامی، یەكێـك بـو لە زمـانە هەرە كۆنەكـانی دەوڵەتـانی پێشـوی ئاسـیا، واتە لە (ئـیلام) كە پـایتەختەكەی (شـوش) بـو، لە بـرەودا بـو. ئەو ئاسـارانەی كە بەم زمـانە مـاونەتەوە، هی (٣) سێ هەزار سـاڵ پـێش زایـنن و لە ناوەڕاسـتی ئێران و نـاوچەی پـارس دۆزراونەتەوە.

لە كوێسـتانەكانی ڕۆژئـاوای ئێران، خـێڵە كێونشـینەكانی (كاسی و لۆلـۆبی) دەژیـان، ئەمانە بە زمانی جۆراوجۆر كە لە ئیلامییەوە نزیك بون، دەدوان.

لە خـواری ڕۆژئـاوای دەریـای خەزەر، (كاسـپی)، خـێڵە كاسـپی و مانییەكان كە لای نوسـەرە گرێكە كۆنەكان، ناسـراو بون، دەژیان، بەڵام هیچ مەدرەك و دەكۆمێنتێكیـان لێ بەجێ نەماوە، تا بتوانرێت لە ڕێگایانەوە، درك بەزمانەكانیان، بكرایە.

كەواتە، ئەو خێڵە ئێرانییـانەی كە لە هەزارەی یەكەمی پێش زایندا بەرەو دەشـت و سـەحراو بانەكانی ڕۆژئـاوای ئێران، هەنگاویـان، نـا، دانیشـتوانی ئەسـڵی (بـومی) ئەو ئەرزو ئاوانە، نەبون.(ئارانسكی ای م. ١٣٧٩: ٥٧، ٥٨)

بە بۆچـونی ئێمە، فـاكتەری زەمین لەبـاریی زمانـانی قسـەكەرانی دانیشـتوانە سـەرەتاییەكان (بومییەكان)ی ئەم ناوچـانە بـۆ ئامـادەیی و بـاوەش گـرتنەوە بـۆ [ح] و جێ خـۆ قـایمكردن و كەوتنە سـەر زاری خەڵكی، مەنتیقیتر و گرنگترو كاریگەرترن لە فـاكتەری تێرژانی وشـەی عەرەبی.

لە ئەنجامدا، بەدڵنیـاییەوە، دەڵێین كە وشـەی (حەز) لە بنجـدا، دەچێتەوە سـەر ڕەگی ئێرانی كۆن $\sqrt{h\bar{a}z}$ — و پەیوەندی بە (حظّ)ی عەرەبییەوە، نییە.

# سێیەم بەش

## تایبەتێتییە مۆڕفۆلۆژییەکانی (حەز)

وشـەی (حەز) بە یەکێـک لە وشـە چـالاک و بە بەرهەمەکانی دیـالێکتی خـواروی زمانی کوردی، دادەنرێت و خاوەنی چەنـدین شـێوە، یا ڤەریـانتی تـرە، وەک: (عەز، خەز، خەز، خەس، خۆز، خواز). لە مۆڕفۆلۆژیدا، مۆرفیمێکی ئازادە و لە لێکسیکۆلۆژیدا، بە دژی، یا پێچەوانەی وشەی (ڕق < ڕک) و (قین < کین)ە. (دوید نیل مکنزی ١٣٨٨: ٢٩) لە (حەز) چەنـدین وشــە سـازبوە، لەوانە: حەزکـردن، حەزلێکـردن، حەزپێکـردن، حەزو ئارەزو، حەزلێکردو، ناحەز.... هی تریش.

ڕۆڵە! گەر حەز دەکەی بیە شا کوڕ
پەندی (مەحوی) لە گوێ گرە وەک دوڕ
مەردی ئازاد قەت مەڕەنجێنە
(کلّ شیءٍ وَلا شیتمهُ حُرّ)

مەحوی (دیوانی مەحوی ١٩٨٤: ٣٣٧)

ئەگەر دێوی دزێوی مردن
بەپێکەنینی ناحەزی هەمیشەییەوە
بەسەرما بدا
گیان و دڵی پڕ خەمم لەناو بچێ
وا مەزانن من مردووم من زیندووم

سوارە (سوارەی ئیلخانی زادە ٢٠٠٧: ٥٢١)

ڤەریـانتی (عەز) گۆڕاوێکی فـۆنەتیکی (حەز)ە و پەیوەنـدی بە نـاوچەی گیۆگرافیـای ڕانیە و قەڵادزێوەیە کە زیاتر لەوێ بەکاردێت، بۆ نمونە دەوترێت:

عەزم لێیە ~ حەزم لێیە

لە ڤەریانتی (خەز)، وشەی (خەزور) بەم شێوەیە سازێنراوە:

خەز + سوفیکسی (-ئور ur) > خەزور

لە ڤەریانتی (خەس)، (خەسو) بەم چەشنە دروست کراوە:

خەس + (سوفیکسی ئوک uk) خەسوک > خەسو.

لە ڤەریانتی (خۆز)یش، (خۆزگە) پێکهێنراوە. بە بۆچونی ئێمە، (خۆزگە) لە بنجدا، پێکهاتوە لە:

(خۆز) + گا > خۆزگا > خۆزگە

مرۆڤ، کاتێک (خۆزگە) بەکاردەهێنێت کە ئاواتەخوازێت بۆ هاتنی، یا گەڕانەوەی ئەو سات و وەختەی مەبەستێتی.

وشەی (گە) لە (خۆزگە)دا، سەربەخۆیە و سوفێکس، نیيە، لەڕوی ئێتمۆلۆژییەوە، گۆڕاوی فۆنەتیکییە، بەم شێوەیە نیشانی دەدەین: وشەی (gāthu)ی فارسی کۆن و (gātu)ی ئاوێستایی. (مصطفی پاشنگ١٣٨١: ٨٨١) کە واتای زەمان و تەختی پاشایی و شوێنیان گەیاندوە، بون بە (گاە) ئەمیش بوە بە (-گا) و دواتر بوە بە (-گە). بەتێپەڕبونی کاتیش لە سەربەخۆیی کەوتو و بوە بە سوفێکسی (-گا) و دواتریش بوە بە (-گە)، هەردو فۆڕمەکە ئێستا لە ئارادان و ناوی شوێن ساز، دەکەن، وەک:

سەیرانگا، یا سەیرانگە، لەوەڕگا، یا لەوەڕگە، خوێندنگا، یا خوێندنگە، پرسگە، پێشانگا..... هی تریش.

وشەی (گا) بە واتای (کات و سات و زەمان)، سەردەمانێک بە سەربەخۆیی بەکارهاتوە:

شاخی ڕەنگاو ڕەنگی گۆیژە، باعسی کەیف و سروور
هەر دەمە بەرگێ ئەپۆشێ، گا سپی، گا سەوزو سور
بێ کەس (دیوانی بێکەس٢٠١١: ٢١٦)

دیگ دەرونم ئاوردەن وە جۆش
گا مات.. گا مەجزوب گا جۆش گا خرۆش
گا فەوت گا مانی گا سۆز گا نەجات
هەم نەخۆف بیم حەيات و مەمات
(خەلیفە کەیخوسرەو٢٠٠٠: ١٣٩)

خۆزگە یار ئەبوو بە خاوەن قەرز لێم
لە هەموو شوێنێک باتایە سەر ڕێم
پیرەمێرد (دیوانی پیرەمێرد ٢٠١٦: ٣٠١)

خۆزگەم بە ساڵی ڕابردوو،
عومری کورتی دڵداریم بوو،
لەپڕ هات و لە ناکاو چوو....

گۆران (دیوانی گۆران١٩٨٠: ٢١)

لە پاڵ (حەز)دا، یەکێکتر لە ڤەریانتەکانی تر (خواز)ە. (خواز) کە وەک ڕەگی ئێستای ناوی ڕوداوی (خواستن) بەکاردێت بە مۆرفێمێکی (ئازاد) دادەنرێت و دەها وشەی بە واتای (حەز و ویست)ی لێ سازێنراوە، لەوانە: دڵخواز، ئاشتی خواز، شەڕخواز، ئاواتە خواز، دڵ و دڵخواز، خوازبێنی، خوازبێنیکەر، ژن و ژن خوازی...... و هی تریش.

ئاشتی خواز! ئاشتی خواز، ئاشتی خوازی کورد
بە ئاشتی سەر ئەگرێ گشت نیازی کورد

گۆران (دیوانی گۆران١٩٨٠: ٤١٣)

دوو دڵ، یەک بۆ یەک ئاواتە خوازبێ
نەک بە نەنگەویس نیاز و ناز بێ

پیرەمێرد (دیوانی پیرەمێرد ٢٠١٦: ٨١)

دڵ و دڵخواز، ئەبێ بە نان و پیاز

پەندی پێشینان (خاڵ٢٠٠٧: ٢٠٥)

پێویستە، ئاماژە بەو خاڵە بکرێت کە ڕەگی ئەنگێز— $\sqrt{}$ ئەمڕۆ زیاتر لە فارسیدا بەکاردێت و ڕەنگ و بۆی ئەو زمانانەی پێوەدیارە، بەڵام لە ئەدەبیاتی کوردیشدا کە لەوە دەچێت بەکاریگەری زمانی فارسییەوە بوبێت، بەرچاو دەکەوێت، بۆ نمونە:

بەرەڵداکردنی نەفست زەرەر خێزە و فەساد ئەنگێز
بەڕەحمەت بن قەدیمی فەرمویانە: (خەربەستە)...

مەحوی (دیوانی مەحوی ١٩٨٤: ٢٦٥)

**بە لێکسیکبون (lexicalization) هەندێ پێکهاتەی سینتاکسی سازبو لە (حەزکردن، خواستن > ویستن)**

لێرەدا، پێویستە بوترێت کە (ویستن) گۆڕاوی فۆنەتیکیی (خواستن)ە. ئەمڕۆ هەردو فۆڕمەکە بەکاردەهێنرێن. (خواست، ویست) کە داکەوتەی ئەو دو (٢) ناوی ڕوداوەن، وەک دو (٢) وشەی تاک مۆرفێمی ئازاد لە جێی یەکتر بەکاردێن، وەک:

بە خواستی خۆی نەبو گەڕایەوە. ~ بە ویستی خۆی نەبو گەڕایەوە. دەشتوانرێت بوترێت: بەحەزی خۆی نەبو گەڕایەوە.

لە سینتاکسدا: ویست—√ وەک ڕەگی ڕابوردو ئەرک دەبینێت، وێ—√ وەک ڕەگی ئێستا لەکاردایە.

لە لێکسیکۆلۆژیشدا، (پێویست، پێویستی، پێداویستی) لە (ویست) سازکراون.

لە سینتاکسدا، بۆ گەیاندنی سیمانتیکیی (سیغەی مەرج و ئارەزو) Subjunctive mood) چەندین پێکهاتەی سینتاکسی بەر پرۆسەی (بەلێکسیکبون) کەوتون، کە بە گوێرەی زەمانی ڕابردو و ئێستا و داهاتو فۆڕمەکانیان دەگۆڕێن و بەکاردەهێنرێن، وەک:

پێش قسە: پێویست بو، لازم بو، واجب بو، فەرزبو، حەق بو، لەوانەبو، دەبو و ...... هی تریش.

بۆ دوای قسە: پێویستە، خەریکە، لازمە، واجیبە، فەرزە، حەقە، لەوانەیە، دەبێت و ..... هی تریش. ئەم پێکهاتانە لە زمانناسیدا، زاراوەی ( Modality and auxiliary verbs) بۆ بەکاردێت و تەنیا لە ڕوی واتا (سیمانتیک)ەوە گەیەنەری (سیغەی مەرج و ئارەزون).

پاش بەلێکسیکبونیان یەکسانن بە یەک وشە، ئەمانە پەیوەندییان بە فرێزەکانی ناو ئەو ڕستانەوە نییە کە پێشیان دەکەون.

لەناو ئەو پێکهاتانەدا کە گەیەنەری ئەو واتایانەن، ڕەگی : ویست—√ و، وێ—√ لە هەرە چالاکەکانن، بۆ نمونە:

ویستم تۆ بچیت. ← دەمەوێت تۆ بچیت.

ویستت ئەو بچێت. ← دەتەوێت ئەو بچێت.

ویستی من بچم ← دەتەوێت من بچم.

ویستمان ئەوان بچن ← دەمانەوێت ئەوانە بچن.

ویستتان ئەوان بچن ← دەتانەوێت ئەوان بچن.

ویستیان ئێمە بچین← دەیانەوێت ئێمە بچین.

(حەزكردن)یش بەر پرۆسەی بەلێكسیكبون كەوتوە، وەک بەم نمونەیە، نیشانی دەدەین:

حەزم كرد تۆ بچیت. ← حەزدەكەم تۆ بچیت.

حەزت كرد من بچم ← حەزدەكەیت من بچم.

حەزی كرد ئێمە بچین ← حەزدەكات ئێمە بچین.

حەزمان كرد تۆ بچیت ← حەزدەكەین تۆ بچیت.

حەزتان كرد من بچم. ← حەز دەكەن من بچم.

حەزیان كرد ئێوە بچن. ← حەز دەكەن ئێوە بچن.

وەک تێبینی دەكەین: (ویستم، ویستت، ویستی، ویستمان، ویستتان، ویستیان، دەمەوێت، دەتەوێت، دەیەوێت، دەمانەوێت، دەتانەوێت، دەیانەوێت)، (حەزم كرد، حەزت كرد، حەزی كرد، حەزمان كرد، حەزتان كرد، حەزیان كرد)، (حەزدەكەم، حەزدەكەیت، حەزدەكات، حەزدەكەین، حەزدەكەن، حەزدەكەن.) ئەمانە هەمویان پێكهاتەی سینتاكسی لە كاركەوتوی بە لێكسیكبونن. لە ڕاستیدا ئەو كەس گۆڕینەوانە، تەنیا پەیوەندییان بە كەسی قسەكەرەوە هەیە، نەک ناو ڕستەكان.

لە دیالێكتی سەرو، بەرامبەر بە (حەز)ی خوارو و هاوشێوەكانی (هاوڤەریانتەكانی)، (حەز، حز، حەژ، خوێز، خواز) بە واتای (حەز و ئارەزو، ویستن، داواكردن، ڕوخسەت وەرگرتن و ..... هی تریش) لەكاردان.

لای (باكایێف)، (حەز، حز) یەكسانن بە (خۆشەویستی، دڵداری، ویستن)، وەک لەم نمونە و ڕستانەدا، نیشانی داون: (حەزكردن hazk6r6n) و (حزكرن h6zk6rn) لەم ڕستانەدا:

ئەو تۆی خۆش دەوێت. ~ Aw ta h6z d6ka

ئەگەر دەتەوێت ئێمە ناچین. (باكایێف. چ. خ. ١٩٥٧: ٤٠٤، ٤٢٥، ٤٣٦) ~ H6z d6ki am nač6m

دیســـانەوە، هەر لای (باكـــایڤ)، (خوێســـت xwest)، ڕەگــی ڕابـــردو، (خـــواز $\sqrt{xwaz-}$ ) ڕەگی ئێستای نـاوی ڕوداوی (وێسـتن xwestin)نـن، وەک لەم ڕسـتەیەدا، نیشانی داوە:

B6xwazi- naxwazi öe hari.

بتەوێت و نەتەوێت تو دەڕۆیت.

لای كوردۆێڤ، (حەز، حز)، واتای (هەست و شعور، خۆشەویستی) دەبەخشن. (خواز $\sqrt{xwaz-}$ )، (خوێز $\sqrt{xwez-}$ ) ڕەگی ڕابوردو ئێستای ناوی ڕوداوی، (خواستن و ویستن)نن. (كوردۆێڤ، ک. ک.١٩٦٠: ٣٤٧، ٣٥٠)

## ئەنجام

١- (حەز) سەنتەری فیڵدە واتایەکی ئەبستراکتی ئونیڤەرسالّی چالاک و زیندوە، خۆی و ئەندامەکانی جێیەکی فراوان و بەرچاویان لە گەنجینەی وشەی کوردیدا، گرتوە، دیارە وەک سروشتی هەمو فیڵدێک، بەگوێرەی پێویستی کۆمەڵ و سەردەم و بە تێپەڕبونی زەمان ، ئەندامی تیادا، کزبوە و لێی پوکاوەتەوە و لێشی وەریون.

بێگومان لەبەر گرنگیی چەمکەکەی و ئەو واتایەی کە ئەندامەکانی دەری دەبڕن، بەردەوام کراوە بوە و هەمیشە باوەشی بۆ ئەندامی نوێ گرتوەتەوە.

٢- سەرچاوەی (حەز) وشەی (حظّ)ی عەرەبی نییە، بەڵکو بە دڵنیاییەوە و بێ سێ و دو، ئێتمۆلۆژییەکەی، یا ڕەگ و ڕیشەکەی لە بنجدا، ئێرانی کۆنە.

٣- فیڵدی (حەز)، دەوڵەمەندە بە فرە ئەندام لە سازکردنی وشەی نوێدا بە بەرهەمە و لە سینتاکسیشدا یەکێک لە هاوڤەریانتەکانی کە (خواز)ە، بێ سنور گورج و کارامەیە.

٤- (حەز) لە هەندێ پێکهاتەی سینتاکسیی وەک: (حەزکردن، خواستن، ویستن)دا، بەر بە لێکسیکبون کەوتون، ڕۆژانە زۆر چست و چالاکانە لە سینتاکسدا، کاردەکەن.

## پەراوێز:

١- لەم باسـەدا، وەک تـاقیکردنەوەیەک لەو جێیـانەدا کە نوسـینەکان، هـی ئـێمەن، خۆمـان لەقەرەی بەکارهێنـانی دو (وو:Ū) نەداوە، چـونکە بە دڵنییـاییەوە، دەڵێین لە زمـانی کـوردی ئەمـڕۆدا، باوەڕمـان بە بـونی نیـیە، جـارێ لە دیـالێکتی سـەرودا بەرگـوێ ناکەوێـت، لە خواروشـدا، ئەگەر هەستی پێ بکرێت ئەوە (فۆنەتیکە) نەک (فۆنۆلۆژی)، و بە یەک (و)، یا دو (وو) بنوسرێت هیچ لە مانا ناگۆڕێت.

ڕاستە (وو:Ū) ئوی قـوڵ، یا درێژ لە زمانە ئێرانییە کۆنەکانی، وەک، فارسی کۆن و ئاوێستا لەتەک (آ Ā) و (ئی Ī) دا لە رستی فـۆنیمە ڤاوڵەکانی ئەو زمانـانەدا لەکاردابون، بەڵام بەپێی سـەرچاوە مێژوییەکان بەرە بەرە ئەو (و:Ū) قـوڵە لە زمـانە ناوەڕاست و نوێیەکانی بـۆ نمـونە فارسی ناوەڕاسـت و سـوغدی و خـوازمی و فارسی نوێدا لەبەر چەنـدین فـاکتەری نازمـانیی، وەک فـاکتەری گیـۆگرافی و کارەسـاتی سروشـتی و کۆچکردن و پەیداکردنی دراوسـێی نـوێ کە بە گروپی زمـانە غەیـرەز ئێرانییەکانی وەک (سـۆمەری و ئەکەدی و ئاشـوری و بـابلی..... هی تریش) دواون، لەپاڵ پەیدابونی شارۆچکە و شارو نزیک بونەوەی شوێنی کارو ژیانی خەڵکی، ئەمانە، هەمویان ڕۆڵیان لە کورتکردنەوەی ڤاوڵە قوڵەکانی نەک تەنها زمانی کوردی، بەڵکو لە زمانانی تریشدا، بینیوە.

نوسـینی، یـا بەکارهێنـانی (وو:Ū)ی قـوڵ لە ڕێنوسی ئەمڕۆمانـدا، یەکێکە لە گیروگرفـت و کێشە سـەرەکییەکانی ئیملاکەمان، کە بەخۆڕایی خۆمان خزانومانەتە ناو نوسینەکانمانەوە. نوسینی ئەم باسە بەیەک (و) هەوڵدانە بۆ ڕزگاربونمان لەو مەسەلەیە. جێگای خۆیەتی کە بڵێین، ئێمە لەو سەرچاوانەدا کە (وو:Ū)یان بەکارهێناوە، وەک ئەمانەتی زانستی دەستمان لێ نەداون.

٢- هەردو بەشەکە بێ گومان لەیەک فیڵدا کۆدەبنەوە، ئێمە لەم باسەدا، بۆ بەرچاوڕونی بە (٢) دایەگرام، چەند ئەندامێکی وشەو ئیدیۆم، نیشان دەدەین.

ئێتمۆلـۆژی ئەو وشــە و ڕەگ و سوفیکسـانەی کە بـۆ یەکەم جـار لەم باسـەدا ئاماژەیان پێکراوە:

ئەنگێز، حز، حس، حەژ، عەز، خەز، خەزور، خەسو، خەس، خۆز-، خۆزگە، خواز، خواست، ویست، پێویست، پێداویستی، هەز، -گا، -گە

## سەرچاوە

**بەزمانی کوردی:**


- سوارەی ئێلخانی زادە (٢٠٠٧)، زمزەمەی زوڵاڵ، هەولێر.
- شێخ محەمەدی خاڵ (٢٠٠٧)، پەندی پێشینان، چاپی چوارەم، سلێمانی.
- دیوانی بێ کەس (٢٠١١)، چاپی دووەم، سلێمانی.
- دیوانی پیرەمێرد (٢٠١٦)، بەرگی یەکەم، دووەم، سێیەم، سلێمانی.
- دیوانی گۆران (١٩٨٠)، بەغدا.
- دیوانی مەحوی (١٩٨٤)، چاپی دووەم، بەغدا.
- خاڵ (١٩٨٧)، فەرهەنگی خاڵ، جزمی دووەم، سلێمانی، چاپی دووەم، ئێران.
- خەلیفە کەیخوسرەو (٢٠٠٠) گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژمارە (٢١)، سلێمانی.
- هەژار (١٣٨٤)، هەنبانەبۆرینە (فرهنگ کردی- فارسی)، چاپ چهارم، تهران.


**بەزمانی فارسی:**


- ای . م . ارانسکی (١٣٧٩) مقدمۀ فقه اللغۀ ایرانی، ترجمۀ کریم کشاورز، چاپ دوم، تهران.
- دیوید نیل مکنزی (١٣٨٨)، فرهنگ کوچک زبان پهلوی، ترجمه دکتر مهشید میر فخرایی، تهران.
- علی اکبر دهخدا (١٣٧٧)، لغت نامه، چاپ دوم، ج٣، ج٩، تهران.
- مصطفی پاشنگ (١٣٨١)، فرهنگ پارسی پاشنگ، جلد یکم، تهران.
- مصطفی پاشنگ (١٣٨١)، فرهنگ پارسی پاشنگ، جلد دوم، تهران.
- مهشید میر فخرایی (١٣٩٠)، روایت پهلوی، تهران.


**بەزمانی ڕوسی:**


- باکایێف. چ. خ. (١٩٥٧) فەرهەنگی کوردی – ڕوسی، مۆسکۆ.
- پێوتەر لێرخ (١٨٥٨) کوردی ئێران (خالیدییەکانی سەرو) سێیەم بەرگ، فەرهەنگی کرمانجی، سان پێرس بۆرگ.
- تسەبۆڵۆڤ، ر. ل (١٩٧٦) لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی فۆنەتیکی زمانی کوردی، مۆسکۆ.
- تسەبۆلۆڤ، ر. ل(٢٠٠١) فەرهەنگی ئێتمۆلۆژی زمانی کوردی، یەکەم بەرگ، مۆسکۆ.
- کوردۆێڤ ک. ک.(١٩٦٠) فەرهەنگی ڕوسی - کوردی مۆسکۆ.
- میلەر. ب. ڤ (١٩٥٠)، فرهنگ فارسی بروسی، مۆسکۆ.

## ملخص البحث

## " البنية الأساسيّة لكلمة (حه ز) ومتجذراتها في اللغة الكوردية "

أ.د. فاروق عمر صديق
العضو العامل في الأكاديميا الكوردي
كلية اللغات/ جامعة السليمانية

تناولت هذه الدراسة كلمة (حه ز) التي معناها "الرغبة" وهي المعبرة عن مفهوم ذي أهمية وحسّاس ودائم الحضور في أذهان كل فرد من أفراد المجتمع الأنساني.

إنَّ كلمة (حه ز) تحتل مركزَ حقلٍ دلاليّ واسعٍ متشعب، وهي ومشتقاتها كثيرة الدوران على ألسنة الناس في الخطاب اليومي.

بقيت دراستها من الناحية الدلاليّة والمعجمية، ولاسيما الإتمولوجيّة " علم أصول الكلمات " والصرفية والنحوية، ناقصة ومخفية غير مكشوفة، لحد هذا البحث، غير أننا تمكننا في دراستنا هذه من إماطة اللثام عن دلالتها، وتوصلنا إلى كلمة الفصل في العثور على الجذور الإيرانية القديمة لكلمة (حه ز) في ضوء علم تأصيل الكلمات (الإتمولوجيا)، وبهذا فنّدنا الآراء التي ترى أنها ترجع إلى كلمة (حظّ) العربيّة ، وأثبتنا بطلان عربيتها جذراً ومرجعاً، وفضلاً عن هذا تم الكشف عن حدودها وضروب عطائها المعجمي، وخصائصها الصرفية والنحوية.

يشتمل هذا البحث على تمهيد وخاتمة بأهم النتائج، وقائمة بالكلمات التي أشير إليها إتمولوجياً في أثناء البحث ، ثم المصادر والمراجع، ويقع صلب الموضوع في ثلاثة مباحث، وهي:

المبحث الأول: الدلالة والحقل الدلاليّ لكلمة (حه ز).

المبحث الثاني: تأصيل كلمة (حه ز) إتمولوجياً.

المبحث الثالث: الخاصية الصرفية والنحوية لكلمة (حه ز).

**ABSTRACT**

## The Basic Structure of the Word ‘Haz=Wish’ and Its Cognates in Kurdish

**Dr. Farooq Omer Sidiq**
**Active Member of the Kurdish Academy**
**Professor of linguistics- Sulaimani University**

The title of this study expresses one of the most significant, abstract, sensitive and lively concepts in every human’s mind, including the Kurdish, i.e., ‘wish’ or ‘haz’ in Kurdish.

The word ‘haz’ forms the core of a polysemous semantic field whose variants are actively used by its speakers on a daily basis. Hence this study uncovers some semantic and lexical, specifically etymological, morphological and syntactic aspects of this word which have yet remained vague and incomplete.

For the first time in Kurdish linguistics, we have removed the vagueness surrounding the term, verified its etymology sufficiently, and finally arrived at the old Iranian root leading to the word ‘haz’. Thus, we have refuted the argument that the word has stemmed from the Arabic word ‘hadh=luck’. Moreover, the study has delimited the scope and the type of productivity of the term in its lexicology and morphological and syntactic properties.

In addition to the prelude, conclusions and the list of words whose etymologies have been explored, the study consists of the following sections:

Section one is devoted for the semantics and the semantic field of the word ‘haz’. Section two deals with word’s etymology while the third section covers the morpho-syntactic properties of the word ‘haz’.

# دارشتن
# چەمک و جۆر و هەنگاوەکانی وتنەوەی

**پ.ی.د.نەریمان عەبدوڵڵا خۆشناو**
بەشی زمانی کوردی ـ کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی
زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی**

**١. ناوونیشان و بواری لێکۆڵینەوەکە:**

ناونیشانی لێکۆڵینەوەکە (**دارشتن ـ چەمک و جۆر و هەنگاوەکانی وتنەوەی**)یە، بۆ باسکردنی چەمک و لایەنە گرنگەکانی دارشتن تەرخانکراوە، ئامانجی سەرەکی لە بابەتی دارشتن، فێرکردنی زمان بەگشتی و زمانی کوردییە بەتایبەتی، تا فێرخواز بگاتە ڕادەی ئەوەی، بتوانێت لە ڕووی زمانەوانییەوە بەشێوەیەکی ڕوون و ڕاست و دروست پەیوەندی بەوانی دیکەوە بکات، جا چ پەیوەندییەکە زارەکی بێت، یان نووسین بێت. هەموو هەوڵ و کۆششەکانی فێربوونی زمانی کوردیش پێویستە بۆ بەجێهێنانی ئەم مەرامانە بێت، کە ئاماژەمان پێدان، هەروەها پەیوەندیی زمانەوانی لە بنەڕەتدا بە دوو شێواز دەبێت، یەکەمیان پەیوەندییەکە لەنێوان قسەکەر و گوێگردا دەبێت، یان لەنێوان نووسەر و خوێنەردا دەبێت، لەسەر ئەم بنەمایەش زمان چوار هونەر لەخۆ دەگرێت، کە لەمانە پێکهاتوون: گوێگرتن، ئاخاوتن، خوێندنەوە و نووسین.

ئەم چوار هونەرە بە کۆڵەکە و بنەمای سەرەکی پەیوەندیی زمانەوانی هەژمار دەکرێن و هەمووشیان پەیوەندییان بەیەکدییەوە هەیە، جگە لەمەش هەر یەکێکیان کاریگەری لەسەر ئەوی دیکەیان هەیە، بۆیە دەبینین لە هەندێ باردا گوێگری باش بە هەمان شێوە ئاخێوەر و خوێنەر و نووسەرێکی باشیشە، هەروەها خوێنەری باش، ئاخێوەر و نووسەرێکی باشیشە.

**٢. هۆی هەڵبژاردنی بابەتەکە:**

بەداخەوە ئێمەی کورد زۆر کەم ئاوڕمان لەم بابەتە داوەتەوە، بەجۆرێک ئەم بابەتە چەند لێکۆڵینەوەیەکی کورت و ناگشتگیری لەسەر کراوە، بۆیە ئێمە ئەم هەلەمان قۆستەوە بە تەرخانکردنی کاتمان بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم لقە گرنگەی زمانەوانی، بۆ ئەوەی ببێتە سەرچاوەیەکی یاریدەدەر بۆ کتێبخانەی کوردی.

تێڕوانین بۆ زمان لەسەر بنەمای تەواوکاری دەوەستێت، کە لەنێوان هونەرەکانیدا دروست دەبێت، ئەم تەواوکارییە لەجیاتی ئەو پەرتبوون و پارچەبوونەیە، کە لە پرۆسەکانی وتنەوەی وانەکانی پەیوەست بە لقەکانی زمانەوانییەوە سەری هەڵداوە، کە شتێک یان بۆتەیەک نییە هەموویان بە یەکەوە ببەستێتەوە، زمان وەکو بوونەوەرێکی زیندوو وایە، کە لایەنەکانی کار لەیەکدی دەکەن و کاریگەرییان بەسەر یەکدییەوە هەیە، ئێمە لە هەموو حاڵەتەکاندا و لە هەموو قۆناغەکاندا دەتوانین فێری ئەوە بین، چۆن بە خوێندنەوە گوزارشت دەکەین و دەشتوانین فێری ئەوە بین چۆن داڕشتن و ڕێزمان بەیەکەوە ببەستینەوە، هەروەها چۆنیش داڕشتن و ڕێنووس بەیەکەوە گرێ بدەین...هتد.

**٣. ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:**

ڕێبـــازی لێکۆڵینەوەکەمـــان، ڕێبـــازێکی وەســـفیی شـــیکارییە، کە بەهـۆیەوە باسـی چەمـک و پێناسـین و جـۆر و ئەنجـام و هـەنگاوەکانی داڕشـتن دەکـات، بە وەرگـرتن و پشتبەسـتن بە سـەرچاوەی ڕەسـەن و شرۆڤەکردنی ئەو دەقانەی بەم بابەتەوە پەیوەستن.

**٤. گیروگرفتی لێکۆڵینەوەکە:**

گەورەترین گیروگرفت لەکاتی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکەدا تووشمان هاتبێت، وەرگێڕانی ئەو هەموو دەقە عەرەبییە بوون، کە پەیوەست بوون بە بابەتی داڕشتن بۆ سەر زمانی کوردی، چونکە بەڕاستی کتێبخانەی کوردی لەم بابەتە زمانەوانییە زۆر هەژارە،

بەجۆرێ چەندین سەرچاوە هەن، کە تێیدا باسی زمانەوانی دەکەن، کەچی بەداخەوە نەخراونەتە سەر زمانی کوردی، کە ئەمەش هەژاریی کتێبخانەی کوردی و ناوەندە زانستی و زانیارییەکانی کوردی دەگەیەنێت.

**٥. ناوەرۆکی لێکۆڵینەوەکە:**

لێکۆڵینەوەکە لە پێشەکییەک و چوار بەش پێکهاتووە:

**بەشی یەکەم،** کە بە ناونیشانی (چەمک و پێناسەی داڕشتن)ە، دوو تەوەرە لەخۆدەگرێت، تێیدا باسی(چەمکی داڕشتن، پێناسەی داڕشتن) کراوە.

**بەشی دووەم،** کە بە ناونیشانی (جۆرەکانی داڕشتن)ە، دوو تەوەرە لەخۆدەگرێت، تەوەرەی یەکەم بە ناونیشانی (جۆرەکانی داڕشتن لە ڕووی تواناوە)یە، لە (داڕشتنی زارەکی، داڕشتنی نووسراو) پێکدێت، تەوەرەی دووەم بە ناونیشانی (جۆرەکانی داڕشتن لە ڕووی بەکارهێنانەوە)یە، لە (داڕشتنی ئەرکی، داڕشتنی داهێنەرانە) پێکدێت.

**بەشی سێیەم،** کە بە ناونیشانی (کارامەیی و گرنگیی داڕشتن)ە، دوو تەوەرە لەخۆ دەگرێت، تێیدا باسی (کارامەیییەکانی داڕشتن، گرنگی داڕشتن) کراوە.

**بەشی چوارەم،** کە بە ناونیشانی (وتنەوە و ئامانج و بنەماکانی داڕشتن)ە، چوار تەوەرە لەخۆ دەگرێت، تەوەرەی یەکەم بە ناونیشانی (هەنگاوەکانی وتنەوەی داڕشتن)ە، لە (هەنگاوەکانی وتنەوەی داڕشتنی زارەکی، هەنگاوەکانی وتنەوەی داڕشتنی نووسراو) پێکدێت، تەوەرەی دووەم بە ناونیشانی (ئامانجەکانی فێربوونی داڕشتن)ە، تەوەرەی سێیەم بە ناونیشانی (بنەماکانی داڕشتن)ە، لە (بنەما دەروونییەکانی داڕشتن، بنەما پەروەردەیییەکانی داڕشتن، بنەما زمانەوانییەکانی داڕشتن) پێکدێت، تەوەرەی چوارەم بە ناونیشانی (هۆکارەکانی لاوازی قوتابییان لە داڕشتن)ە.

لە کۆتاییدا ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان و پوختەی لێکۆڵینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراونەتەڕوو.

# بەشی یەکەم
# چەمک و پێناسەی دارِشتن

## ١-١: چەمکی دارِشتن:

زمان ئەو ئامرازەیە، بەهۆیەوە مرۆڤ دەتوانێت لە هەموو ئەو شتانەی لە مێشک و لە دڵ و دەروون و هەست و نەستیدان، گوزارشت لە بیر و سۆز و هەستە جۆراوجۆرەکانی بکات، ئەم پرۆسەیەش بە بەکارهێنانی ئامرازەکانی دیکەی دارِشتن بەرِێوە دەچێت، وەک هێما و ئاماژە و وێنە و جووڵە و...هتد، هەموو ئەم ئامرازانەش مرۆڤ پەنایان بۆ دەبات، تاکو بەهۆیانەوە بتوانێت کاری جەختکردنەوە و ڕوونکردنەوە و چەسپاندن، بۆ هەموو ئەو شتانە ئەنجام بدات، کە وەک واژە گۆیان دەکات، جاری واش هەیە ئەو هێمایانە لەجیاتی واژەیەک بەکاردەبرێت، کە گۆنەکراوە، یان ناتوانێت مرۆڤ ئەو کاتە لە یادیدا ئامادەی بکات و بیخاتە سەر زاری، ئینجا چ گۆکردنی واژەیەک بێت، یان هەر گۆرِانێکی دیکە بێت. واتە مرۆڤ بیرۆکەی بۆ دێت، باشتر وایە ئەو بیرۆکەیە تۆمار بکات، بەڵام کاتێک دێتە سەر ئەوەی تۆماری بکات، تووشی شڵەژان و ڕارِایی دەبێت، لە کاتێکدا ڕۆژانە بەو زمانی نووسینە قسە دەکات و کارەکانی خۆی پێ ڕادەپەرِێنێ، لە هەمان کاتدا فەرهەنگێکی باشی لە وشەی زمانەکەی لە مێشکدایە، یاساکان بەکاردەهێنێ، بەڵام کە دێتە سەر ئەوەی ئەو فەرهەنگ و یاسایانە پراکتیزە بکات و بۆ مەبەستێکی بابەتی دیاریکراو بیخاتە گەڕ، ئەوا گرفتەکە لێرەوە سەرهەڵدەدەن. (مستەفا زەنگەنە و ئیسماعیل قەرەداغی: ٢٠٠١، ل٥).

بێگومان زمانی کوردی چەندەها لقی هەیە، وەک خوێندنەوە ماددەیەکی زمانەوانی بە خوێنەر پێشکەش دەکات، ڕێزمانیش ئامرازێکن بۆ پاراستنی زمان لە هەڵە و هەڵەکاری، دەقە ئەدەبییەکانیش جێگای داهێنانی ئەدەبین، واتە هەر لقێک لەم لقانەی زمان، ئەرکێک و فەرمانێک

جێبەجێ دەکەن، کەچی داڕشتن بە ئامانجی سەرەکیی هەموو ئەم لقانە هەژمار دەکرێت، داڕشتنیش پێناسەکانی هەمەجۆرن، کەچی هەموو بیروبۆچوونەکان لەسەر ئەوە کۆکن، کە داڕشتن پرۆسەیەکە بۆ دەرخستنی هزر و بیر و ئەندێشە و بۆچوونەکانی ناخی مرۆڤ.

**١-٢:پێناسەی داڕشتن:**

تا ئێستا چەندین پێناسەی جیاجیا لەبارەی داڕشتنەوە کراون، ئەو پێناسانەش چ لە ڕووی زاراوەییەوە بێت یان لە ڕووی زمانەوانییەوە بێت، لێرەدا هەندێک لەو پێناسانە دەخەینەڕوو:

- داڕشتن گوزارشت لەو شتانە دەکات، کە لە ویژداندایە.(أبوبكر عبدالقادر الغازي: ٢٠٠٧، ص٢٤٢).

- داڕشتن ڕا و بۆچوونی تاکەکەسە بەرانبەر بە شتێک یان بابەتێک، کە پشت بە سەرمایەی زانیاریی نووسەرەکەی دەبەستێ.(مستەفا زەنگەنە و ئیسماعیل قەرەداغی: ٢٠٠١، ل٧).

- هەروەها داڕشتن بە قسەکردن، یان بە هەر شێوازێکی دیکە بێت، کە بەهۆیەوە گوزارشت لە شتەکانی ناخی خۆی کردووە.(مجموعة من كبار اللغويين العرب: ١٩٨٩، ص ٨١٧).

- داڕشتن مانای گۆکردن بە زمان، یاخود بە نووسین دەگەیەنێت، لەو شتانەی لە ناخی مرۆڤدان، ئینجا چ بیروبۆچوون، یان مانا بن، بەو مەرجەی داڕشتنەکە بە زمانێکی ڕاست و دروست بێت و بە شێوازێکی جوان و ڕێکوپێک بێت و دڵی مرۆڤ شاد بکات.(علي أحمد مذكور: ١٩٩٧، ص ٢٢٦).

- داڕشتن زانستێکە، شارەزابوون لێی، توانای ڕەوانبێژی و دەربڕینی مانا لای مرۆڤ زیاد دەکات، ئەمەش تەنیا بە بژارکردنی واژەی گونجاو دەستەبەر دەبێت (فراس السليتي: ٢٠٠٨، ص ٧٧).

- داڕشتن لە بواری قوتابخانە و فێربووندا کارێکی میتۆدییە، کە پێویستە بە گوێرەی نەخشە و پلانێکی تەواو بەڕێوە بچێت، تاکو قوتابی

بگاتە ئاستێک، کە بەهۆیەوە بتوانێت بیروبۆچوون و هەست و بینینەکانی خۆی، بە زمان و لێوەکان و بە نووسینەوە بگوازێتەوە، ئەویش بە زمانێکی سادە و ساکار و بە شێوازێکی هزریی دیاریکراو. (سعاد عبدالکریم الوائلي: ٢٠٠٤، ص ٧٧).

ـ داڕشتن بە ئەنجامی کۆتایی بۆ فێربوونی زمانێک هەژمار دەکرێت، واتە ئامانجی گشتگیر و گشتی فێربوونی زمانەکەیە، هەموو هونەرەکانی زمان و لقەکانی لە چوارچێوەی داڕشتن کۆدەبنەوە (علي أحمد مذکور: ١٩٩٧، ص ٢٢٦).

کەواتە داڕشتن توانایی و کارامەیی قوتابی یان فێرخواز لە ڕووی زارەکی یان نووسراوەوە دەگەیەنێت، کە بەجۆرێک ئەوەی لە ناخیدایە، هەوڵدەدات دەریانببڕێت و لەم ڕێگەیەوە بیانگەیەنێت بە خوێنەران و وەرگران.

## بەشی دووەم

## جۆرەکانی دارشتن

### ٢ـ١: جۆرەکانی دارشتن لەرووی تواناوە:

جۆرەکانی دارشتن لە رووی تواناوە، دابەش دەبێتە سەر دوو جۆر، ئەوانیش بریتین لە: دارشتنی زارەکی و دارشتنی نووسراو.

**١ـ دارشتنی زارەکی:** ئەم جۆرە دارشتنە بە هەمان شێوە پێشی دەوترێت دارشتنی گفتوگۆ، ئەم پرۆسەیە لەلایەن تاکەکانی مرۆڤەوە لەوانی دی زیاتر بەکاردەهێنرێت، چونکە ئامرازێکە بۆ پەیوەندییەکی خێرا لەنێوان تاکەکاندا، هەروەها بۆ ئاوێتەبوون و تێکەڵبوونی نێوان تاکەکان بەکاردەهێنرێت. دارشتنی زارەکی پشت بە ئاخاوتن دەبەستێت، بەتایبەتی لە قۆناغەکانی یەکەمی سەرەتاییدا، ئەم دارشتنە بە ئاوێنەی دەروون هەژمار دەکرێت، ئەویش لەبەر ئەوەی گوزارشت لە سۆزی مرۆڤ دەکات، وەک بیرۆکە و هزری ئەوتۆ، کە مرۆڤ بە شێوەیەکی زارەکی گوزارشتی لێدەکات و باشترین مانا و جوانترین واژەیان تێدا بەکاردەهێنێت.(راتب قاسم عاشور و محمد فؤاد الحوامدة: ٢٠٠٣، ص ٢٠٢ ـ ٢٠٣).

شێوازەکانی دارشتنی زارەکی زۆرن، کە ئەمانە هەندێکیانن:

١ـ دارشتن لە وێنەی هەمەجۆر، چ ئەو وێنانەی قوتابییان، یان مامۆستایان ئامادەیان کردووە، بە هەمان شێوە ئەو وێنانەی لە سەرەتای هەر وانەیەکی خوێندنەوەدا، بوونیان هەیە.

٢ـ گێرانەوەی چیرۆک و کورتکردنەوە و تەواوکردنیان، یان فراوانکردنیان.

٣ـ باسکردنی ئەو چالاکییانەی قوتابییان ئەنجامیان دەدەن، وەک: سەردانیکردن، گەشتکردن و کاروبارەکانیان.

٤ـ ناساندنی ئاژەڵان و رووەکی ژینگەیی...

٥ـ باسکردنی بابەتەکانی ئایینی، نیشتمانی، نەتەوەیی و دڵداری،...هتد.

**٢ ـ دارشتنی نووسراو:**

ئەم جۆرە دارشتنە، شێوازێکە بۆ پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان، کە مەودای شوێن یان کات لەنێوانیاندا هەیە، ئەمانەش هەندێکیانن لەم شێوازەی دارشتن:

١. نووسینی هەواڵی سیاسی، وەرزشی و کۆمەڵایەتی...هتد.

٢. دارشتنی نووسینی ئەو وێنانەی قوتابییان و مامۆستایان کۆیان دەکەنەوە.

٣. کورتکردنەوەی بابەتێک، یان چیرۆکێک، پاش خوێندنەوەی یان پاش گوێگرتن لێی.

٤. نووسینی نامە و برووسکە و راپۆرت لەبارەی بابەتێکی هەمەجۆرەوە. (راتب قاسم عاشور و محمد فؤاد الحوامدة: ٢٠٠٣، ص ٢٠٣).

هەروەها دارشتنی نووسراو ئەو بوارەیە، کە بەهۆیەوە مامۆستاکان هەڵەی قوتابییانیان لە رووی زمانەوانی و لە رووی شێوازەوە بۆ دەردەکەوێت، ئەویش لە کاتی باسکردنی هزر و بیروبۆچوونەکان، لە هەمان کاتیشدا هەوڵدانە بۆ چارەسەرکردنی ئەم هەڵانە. (فراس السليتي: ٢٠٠٨، ص ٨٠)، واتە لە کۆتاییدا قوتابییان بتوانن لە رووی رێنووس و خاڵبەندی و رێکخستنەوە بە نووسینێکی دروست بنووسن.(سميح أبو مغلي:١٩٩٩، ص٤).

کەواتە نووسین هۆکار و ئامرازێکی گرنگە بۆ گواستنەوەی بیر و هەستمان بۆ کەسانی تر، یان تۆمارکردنی بۆ خۆمان، بۆ ئەوەی هەر کاتێک ویستمان بگەرێینەوە سەری، بۆیە ئەم ئامرازە گرنگییەکی گەورەی لە مێژوودا بەدەستهێناوە(عبدالله علي مصطفى: ٢٠٠٢، ص ١٦١).

**٢ـ٢:جۆرەکانی دارشتن لەرووی بەکارهێنانەوە:**

جۆرەکانی دارشتن لە رووی بەکارهێنانەوە دوو جۆرە، ئەوانیش بریتین لە دارشتنی ئەرکی و دارشتنی داهێنەرانە.

**١- داڕشتنی ئەرکی:**

ئەم داڕشتنە ئەرکێکی تایبەت لە ژیانی تاک و کۆمەڵگە جێبەجێ دەکات، وەک تێگەیشتن، ئەمەش بوارەکانی بەکارهێنانی زۆرە، وەک ئاخاوتن لەنێوان خەڵکی و نووسینی نامە و برووسکە و بانگهێشتە هەمەچەشنەکان و نووسینی تێبینی و ڕاپۆرت و یاداشت و...هتد، چ ڕاگەیەنراو بێت، یان ڕاسپاردە، وەک مەرامێک ئاراستەی خەڵک دەکرێت، کە بەهۆیەوە داڕشتنی ئەرکی لە ڕووی زارەکی، یان نووسراو جێبەجێ دەکات.

**٢- داڕشتنی داهێنەرانە:**

ئەم جۆرە داڕشتن لە هزر و بۆچوونەکان بە مەرام دەگرێت و بە شێوازێکی ئەدەبی بۆ ئەوانی دی دەگوازێتەوە، لەپێناو کارتێکردن لە دەروونی خوێنەران و گوێگران، بەشێوەیەک بیانوروووژێنێت، بە هەمان ڕادەی وروووژاندنی خاوەن بەرهەمەکان.

ئینجا ئەگەر داڕشتنی ئەرکی پێداویستییەکانی ژیان و کاروبارە ماددی و کۆمەڵایەتییەکان دابین بکات، ئەوا داڕشتنی داهێنەرانە دەبێتە هاریکارێک بۆ قوتابی، تاکو گوزارشت لە خۆی و هەست و نەستی بکات، بەشێوەیەک ڕەنگدانەوەی خودی خۆی بێت و کەسایەتییەکەی دەربخات. (راتب قاسم عاشور و محمد فؤاد الحوامدة: ٢٠٠٣، ص ٢٠٤).

## بەشی سێیەم
## کارامەیی و گرنگیی دارِشتن

### ٣-١: کارامەییەکانی دارِشتن:

دارِشتن پرۆسەیەکە هەمیشە لەگەڵ قوتابیدایە، هەر لە سەرەتای چوونی بۆ ناو بواری پەروەردە و فێرکردن، تاکو کۆتایی قۆناغەکانی ژیانی، و هەمیشەش لە هەوڵی گەشەکردنی تواناکانی خۆیەتی، کە ئەمانە هەندێکیانن:

١- بەکارهێنانی هێماکانی خاڵبەندی لە شوێنەکانی خۆیاندا.

٢- بەکارهێنانی زمانێکی پەتی.

٣- توانای هێنانەوەی بەڵگە بە ئایەتەکانی قورئان، یان فەرموودەکانی پێغەمبەر، یان دەقە شیعرییەکان، یان دەقی پەخشان لە شوێنی گونجاوی خۆیاندا.

٤- توانای بەکارهێنانی ڕستە و گوزارشتی پتەو.

٥- توانای نووسینی نامە، یان وەسفکردنی دیاردەیەک، یان ڕووداوێک، یان وێنەیەک بەشێوەیەکی گشتگیر بە مامۆستا دەبەخشێت. (فهد خلیل زاید: ٢٠٠٦، ص ١٥١).

٦- کورتبڕی بکات، واتە نابێ زیادەڕۆیی لە ڕستە و بیرۆکەکانیدا بکات.

٧- بایەخ بە ڕاستیی ڕووداوەکان دەدات و پشت بە تاقیکردنەوە و شارەزایی بە کردار دەبەستێ و خۆی لە قەرەی شتی بیردۆزی نادات، ئەگەر نەبێتە کردار. (مستەفا زەنگەنە و ئیسماعیل قەرەداغی: ٢٠٠١، ل١٥).

٨- نووسەر و لێکۆڵەر مکوڕ دەبێت لە ئەنجامدانی تێبینییەکانی مامۆستاکەی یان سەرپەرشتەکەی.(فخري خليل النجار:٢٠١١، ص ٢٢١).

**٣-٢: گرنگیی داڕشتن:**

داڕشتن بە بەشێکی زیندووی ژیانی خەڵکی هەژمار دەکرێت، چونکە گرنگترین ئامرازەکانی پەیوەندییە و لە هەمووش زیاتر خەڵک تێکەڵ بە یەکدی دەکات، بەهۆی داڕشتنەوە تاک دەتوانێت ناخی دڵی خۆی دەربخات و بیروڕاکانی خۆی بۆ ئەوانی دی بگوازێتەوە، هەروەها بە ئامرازی سەرەکی فێرکردن و فێربوون هەژمار دەکرێت.(عبدالرحمن الهاشمي: ٢٠٠١، ص ١٧٦).

گرنگیی داڕشتن لەوەدایە، هونەرێکە لە هونەرەکانی پەیوەندیی زمانەوانی، ئەو قاڵبەیە مرۆڤ بۆچوونەکانی خۆی تێدا هەڵدەڕێژێت، ئەویش بە زمانێکی جوان و پاراو، ئەمەش بە مەبەست و مەرامی فێرخوازی دادەنرێت، جگە لەوەش ئامرازێکە بۆ تێگەیشتن و تێگەیاندن. (فهد خليل زايد: ٢٠٠٦، ص ١٥٠).

هەروەها گرنگیی داڕشتنی نووسراو لەوەدا دەردەکەوێت، کە گرنگترین پرسی چالاکی زمانەوانییە و بەهۆیەوە کۆمەڵگەکان ڕۆشنبیریی خۆیان دەپارێزن، چونکە نووسین ئەلتەرناتیڤی نییە، مرۆڤ لە سەرەتاوە پێویستی بە گواستنەوەی مانا گرنگەکان هەبوو، دەستی دایە نووسین، بۆ نزیککردنەوەی ماناکان لەنێوان ئەو کەسانەی لەیەکترییەوە دوورن.(رشدي أحمد طعيمة و محمد السيد مناع: ٢٠٠١، ص ١٧٦).

## بەشی چوارەم
## وتنەوە و ئامانج و بنەماکانی دارِشتن

هەرچەندە کۆمەڵە شێوازێکی داهێنەرانە هەن، کە مامۆستایان لە کاتی دەربرین و دارِشتندا، بۆ راستکردنەوەی هەڵەی فێرخوازان بەکاریدەهێنن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا بە دەست چەندەها گرفتی زمانەوانییەوە دەناڵێنن، کە قوتابییان لە کاتی خوێندنەوەدا دووچاری دەبنەوە، هەرچەندە دارِشتن پرۆسەیەکە لە کاتی دروستکردن و پێکهێنانی رِستەکان، هەنگاوی میتۆدیی تایبەت بە خۆی هەیە، کەچی قوتابییان دەکەونە ناو چەندەها هەڵەوە، بێگومان ئەمەش بۆ ئەوە دەگەرِێتەوە، کە ئەو زمانەی لەسەری راهاتوون، زمانێکی زارەکییە، لەبەر ئەوە لە کاتی دارِشتن رووبەرِووی چەندەها ئاستەنگ دەبنەوە.

### ٤-١: هەنگاوەکانی وتنەوەی دارِشتن:

### أ- هەنگاوەکانی وتنەوەی دارِشتنی زارەکی

لە وتنەوەی دارِشتنی زارەکیدا، چەندین هەنگاو دەنێین، لەوانە:

**١- پێشەکی یان بەرایی:**

مەبەست لێی ئامادەکردنی منداڵان و فێرخوازانە، بۆ وەرگرتنی بابەتەکە، ئەویش لەرِێگەی یادهێنانەوەی بژاردەکانی پێشوویان، کە پەیوەندی بەو بابەتەوە هەیە، خوازیارن دایبرِێژنەوە، ئەمەش بەوە دەستەبەر دەبێت، چەند پرسیارێک ئاراستەی قوتابییان بکرێت، کە پەیوەندی بە بیرۆکەی بابەتەکەوە هەیە، یان لەرِێگەی پێشکەشکردنی چەند وێنەیەک، یان گێرانەوەی چەند هەواڵێک لەلایەن قوتابییەکەوە، لەگەڵ جەختکردنەوە لەسەر گوێگرتن و بەئاگابوون.(فهد خلیل زاید: ٢٠٠٦، ص١٤٢).

**٢- پێشکەشکردنی بابەتەکە:**

بابەتەکە لەگەڵ هەموو توخمە سەرەکییەکانی لەسەر تەختەرِەشە دەنووسرێت، بەو مەرجەی شێوازی پێشکەشکردنەکەی لە رِووی

بیرۆکە و زمانەوە گونجاو بێت، هەروەها پێویستە مامۆستا بیرۆکە فەلسەفی و خەیاڵییەکانی خۆی لەم پرۆسەیە بەدوور بگرێت و نەیانخاتە ناو بابەتەکەوە.

**٣. ئاخاوتنی قوتابی:**

دوای ئەوەی قوتابی بیرۆکەیەکی ڕوون دەربارەی بابەتەکە وەردەگرێت، قۆناغی سەرەکی دەربارەی داڕشتنی زارەکی سەرهەڵدەدات، کە ئاخاوتنی قوتابییە دەربارەی ئەو بابەتەی هەڵیدەبژێرێت، لەوانەشە مامۆستا پەنابەرێتە بەر ئاراستەکردنی چەند پرسیارێک، بەشێوەی پلەبەندی، کە سەرئەنجام پەل بۆ بونیادنانی بابەتەکە بەشێوەیەکی تەواو دەکێشێت.(سعاد عبدالكريم الوائلي:٢٠٠١، ص ٩٥).

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، ئەم قۆناغە (هەنگاوەکانی داڕشتنی زارەکی) وا دەخوازێت هەڵوێستی مامۆستاکە ئەرێنی بێت و تەنیا خۆی بە تەنیا قسە نەکات، بەڵکو قوتابییەکانیش بەشداری پێبکات، یان نابێ تەنیا قوتابییەکان قسە بکەن، بەڵکو خۆشی دەبێ قسە بکات، چونکە لەم حاڵەتەدا هەڵوێستی مامۆستاکە نەرێنی دەبێت و کەشێک دروست دەکات، کە قوتابییان وا گومان دەبەن، کارێکی پووچ و بێ بنەما ئەنجام دەدات.

**ب ـ هەنگاوەکانی وتنەوەی داڕشتنی نووسراو:**

لە وتنەوەی داڕشتنی نووسراودا، چەندین هەنگاو دەنێین، لەوانە:

**١. پێشەکی:**

لە قۆناغی پێشەکیدا قوتابییان بەئاگا دەکرێنەوە و سەرنجیان بۆ بابەتەکە ڕادەکێشرێت، ئەمەش وا دەخوازێت زانیارییەکانی پێشوویان بیربخرێتەوە، کە مانای وایە مامۆستاکە قوتابییان بخاتە کەشێکی دەروونیی ئەوتۆوە، کە بگاتە کرۆکی بابەتی وانەکە و مێشکی قوتابییان ڕابهێنێت.

**٢. گفتوگۆ:**

ئەم پرۆسەیەش بەم شێوەیە بەڕێوەدەچێت:

مامۆستا گفتوگۆ دەربارەی بابەتەکە لەڕێگەی پرسیاری ئەوتۆوە ئەنجام دەدات، کە بۆ گەیشتن بە بابەتە پێشنیازکراوەکە، ڕێنمایی قوتابییان بکات، لە هەمان کاتیشدا زنجیرەبەندی و هەڵبژاردن تێیاندا ڕەچاو بکات، بەشێوەیەک لە وەڵامی قوتابییان، توخمە سەرەکییەکانی بابەتەکە ڕەنگبداتەوە.

مامۆستا دەستنیشانی هەندێک ڕستەی قوتابییەکان دەکات، بە مەرجێ باش دارێژرابێتن، ئینجا بەشێوەیەکی کورت و پوخت لەسەر تەختەڕەشەکە دەیاننووسێت.(فهد خليل زايد: ٢٠٠٦، ص١٤٥).

**٣. هەڵسەنگاندن:**

دوای تەواوکردنی ئەم پرۆسەیە و دوای ئەوەی مامۆستاکە هەڵە باوەکانی قوتابییان دەستنیشان دەکات و بۆیانی ڕوون دەکاتەوە و ڕاستیان دەکاتەوە، داوایان لێدەکات پەڕاوەکانیان بکەنەوە و هەڵەکانیان ڕاست بکەنەوە، وا باشترە مامۆستا لەسەر تەختەڕەشەکە هەندێک پرسی زمانەوانی بنووسێت، کە قوتابییان بەجوانی دایانڕشتووە، ئەویش وەک هاندان و جەختکردنەوەیەک لەسەر ئەو پرسانەی بۆیان باسکراون.(فهد خليل زايد: ٢٠٠٦، ص١٤٦).

**٢-٤: ئامانجەکانی فێربوونی دارشتن:**

فێربوونی دارشتن چەند ئامانجێک دەپێکێت، کە ئەمانە گرنگترینیانن:

١. بەکارهێنانی ڕاست و دروستی زمان و سنوور و پێکهاتەکانی دارشتن، وەکو ڕەوانی و پاراوی ڕستە، هەروەها بەستنەوە و دابەشکردنی بابەتەکە بۆ چەند تەوەر و کۆپلەیەک.

٢. توانای ڕوونکردنەوەی بیروبۆچوونەکان، ئەویش بە بەکارهێنانی وشەی گونجاو و شێوازی گونجاو.

٣. توانای ڕێکخستنی توخمەکانی بیرۆکەی دارشتنەکە، بەشێوەیەک قوتابییەکە چەند ڕستەیەکی خۆی پێ ببەخشێت، کە کار لە گوێگر و خوێنەر بکات.

٤. پێویستە مرۆڤ توانای ئەوەی هەبێت تێڕوانینی خۆی بە هەردوو شێوازی زارەکی و نووسین بەوانی دی پێشکەش بکات و ڕوونی بکاتەوە.

٥. ڕاشکاوی لە وتن و دەستپاکی لە گواستنەوەی زانیارییەکان، بەشێوەیەک قوتابی وا لێبکات لە کاتی دەربڕینی بیروبۆچوونەکانی و لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەڵوێستەکان ئازا بێت.(فراس السليتي: ٢٠٠٨، ص ٢).

٦. گەشەدان بە هەستی قوتابی، بەو هەڵوێستە کۆمەڵایەتییە هەمەچەشنانەی، کە وا پێویست دەکات نامەیەک بنووسن، یان کارتێکی پیرۆزبایی بنووسن، یان تێیدا کەسێک بە یەکێکی دی بناسێنن...هتد.

٧. گەشەدان بە توانستەکانی قوتابی لەسەر گفتوگۆ و مشتومڕ. (علي أحمد مذكور: ١٩٩٧، ص ٢٦٨).

### ٤-٣: بنەماکانی دارشتن:

دارشتن چەندین بنەمای گرنگی هەیە، کە هەندێکیان بنەمای دەروونین، پەیوەندییان بە هەست و ئارەزووی قوتابییەوە هەیە، بۆ دەربڕین و گوزارشتنکردن لە ناخیان، هەندێک لەو بنەمایانەش پەروەردەیین، وەکو ئازادی هەڵبژاردنی بابەتەکان و گوزارشتکردن لێیان، هەندێکیشیان بنەمای زمانەوانین، پەیوەندییان بە گەشەدانی هەگبەی زمانەوانییەوە هەیە، دەتوانین ئەم بنەمایانەش بەم شێوەیە باس بکەین و تیشک بخەینە سەریان:

**أ- بنەما دەروونییەکانی دارِشتن:**

لە ڕاستیدا ئەم بنەمایانە لەلایەن قوتابییانەوە پەیوەندییان بە ئارەزووی ئاخاوتن و دارِشتنەوە هەیە، بەهۆیەوە خوازیاری گوزارشتکردن بن لە ناخیان، پێویستە فێرخواز ئەم مەسەلەیە بقۆزێتەوە، تاکو قوتابییان هانیان بدات، ئەویش بە پشتبەستن بۆ نموونە بە (وێنە)، ئینجا ئەو بنەمایانەی پەیوەندییان بە لایەنی دەروونییەوە هەیە، پێویستی و پێداویستی قوتابییانە بۆ بەگوڕبوون و کاریگەربوونێکی کارا، کە ببێتە هاندەرێک، بۆ ئەوەی جووڵەیان پێ بکات، تاکو دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو بتوانن گوزارشت بکەن، پێویستە مامۆستاش بە زمانێکی جوان و پاراو و پەتی قسە بکات، تاکو ببێتە پێشەنگ بۆ قوتابییەکانی (طه علي حسين الدليمي و سعاد عبدالكريم عباس الوائلي: ٢٠٠٥، ص ١٣٧).

هەروەها پێویستە مامۆستا شارەزای زانست و زانیارییەکان بێت، تاکو بتوانێت بڕیاری ڕاست و دروست دەربارەی بیروبۆچوون و زانیارییەکانی قوتابییان بدات.

بە هەمان شێوە پێویستە قوتابی لەکاتی دارِشتن بە وردەکارییەکانەوە پابەند بێت و هەمیشە پشت ببەستێت بەو شتانەی هەستیان پێدەکات، چونکە ئەمە دەبێتە پاڵپشتییەک بۆی، تاکو وشەکان هەڵبژێرێت و ڕستەی گونجاو بەکاربێنێت، هەروەها هێمای خاڵبەندی بەڕاست و دروستی بەکاربێنێت. (سعاد عبدالكريم الوائلي:٢٠٠٤، ص ٨٣).

**ب - بنەما پەروەردەییەکانی دارِشتن:**

لەم بنەمایەدا دەبێ ئازادی بە قوتابییان لە هەڵبژاردنی بابەتەکان، یان نمایشکردنی بیروبۆچوونەکان بدرێت. هەروەها پێویستە مامۆستا بزانێت وانەیەکی دیاریکراو بۆ فێرکردنی دارِشتن بۆ قوتابییان نییە، چونکە هەموو لقەکانی زمان بەگشتی و(زمانی کوردی - بەنموونە) بە بوارێکی بەپیت بۆ دارِشتن دادەنرێن، هەروەها یەکێک لە بنەما

پەروەردەییەکان ئەوەیە، کە ئەو بابەتانە هەڵبژێرین، کە قوتابییان شارەزاییان دەربارەی هەیە، ئەمەش مانای وایە ئێمە قوتابییان لە بابەتی دژوار هەڵنەقورتێنین. (طه علي حسين الدليمي و سعاد عبدالكريم عباس الوائلي: ٢٠٠٥، ص ١٣٧).

**ج ـ بنەما زمانەوانییەکانی داڕشتن:**

ئەم بنەمایە لەو وشە زمانەوانییانەدا بەرجەستە دەبن، کە لای قوتابییان هەن، پێویستە مامۆستا سروود و چیرۆک و دەقی وا بە قوتابییان ببەخشێت، کە سامانی زمانەوانییان زیاد بکات، تاکو بتوانن لەو وشانە ڕزگاریان بێت، کە هەمیشە لە زمانی زارەکیدا بەکاریدەهێنن. (طه علي حسين الدليمي و سعاد عبدالكريم عباس الوائلي: ٢٠٠٥، ص ١٣٨).

هەندێک مامۆستا هەن وشە و واژە و پێکهاتەی زمانەوانی هەمەجۆر بە قوتابییان ئاشنا دەکەن، تاکو هەگبەی زمانەوانییان تێر و تەژی بێت و بتوانن بەهۆیانەوە گوزارشت لە ماناکانیان بکەن، بەڵام لێرەدا گفتوگۆ لەسەر چۆنێتی بەخشینی ئەو وشانە بە قوتابییەکان هەیە، هەندێک پێیان وایە قوتابی پێویستە خۆی ئەو وشانە دیاری بکات و لە خۆیەوە وشە بە ماناکانەوە بلکێنێت، هەندێکی دیکە پێیان وایە قوتابی لە ڕووی بیروبۆچوونەوە هەژارە، بۆیە پێویستە مامۆستا بیروبۆچوونی پێ ببەخشێت، تاکو لە ڕووی هزر و زمانەوانییەوە گەشە بکات، هەندێکیش لەو باوەڕەدان دەبێ بەپێی پێویست مامۆستا زانیاری و مانا و هزرەکان بە قوتابی ببەخشێت.

داڕشتی زارەکی لە داڕشتی نووسین لەپێشترە و توانای قوتابی لە ڕووی ئاخاوتن و هێز و تواناوە زیاتر دەکات و لە بواری نووسین بەگوڕتری دەکات، داڕشتنیش لە قۆناغی سەرەتایی و ناوەندیدا ئەرکی دەبێت، بەڵام لەوانەیە داڕشتنی داهێنەرانە لە کۆتاییەکانی قۆناغی ناوەندیدا لای قوتابی سەرهەڵبدات (عبدالرحمن الهاشمي: ٢٠٠١، ص ٤٥).

**٤ـ٤: هۆکارەکانی لاوازیی قوتابییان لە دارشتن:**

هەرچەندە ئەو فاکتەر و هۆکارانە زۆرن، کە لاوازی لە دارشتن و پرۆسەکانی دەربڕیندا دروست دەکەن، کەچی دەتوانین ئەم هۆکارانە لە دوو تەوەردا چڕبکەینەوە، یەکەمیان تەوەری مامۆستایە و ئەوی دیکەشیان تەوەری قوتابییە، لەپاڵ هەردوو ئەم تەوەرەدا، چەند هۆکارێکی دیکەش هەن، دەبنە ئاستەنگ بەرانبەر بە توانای دارشتنی قوتابی، هەندێکیان پەیوەندییان بە پەروەردەی ماڵەوەی قوتابییەوە هەیە و هەندێکی دیکەشیان پەیوەندییان بە پلانی خوێندنەوە هەیە و هەندێکی دیکەیان پەیوەندییان بە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە هەیە، کە زۆر و هەمەچەشنن، یەکێک لە لایەنە نەرێنییەکانی ڕاگەیاندن ئەوەیە، هەندێک ئاستەنگ دروست دەکات، لەگەڵ بیر و هزری قوتابیدا ناگونجێن، یان لەگەڵ بژاردەکانی ئەو قوتابییە یەک ناگرنەوە، لەوانەشە ئەو قوتابییە شارەزایی دەربارەی ئەو بابەتە نەبێت، چونکە دیاریکردنی بابەتەکە بەجوانی لەگەڵ ئارەزووی قوتابییاندا یەک دەگرێتەوە، ئەمەش پەل بۆ ئەوە دەکێشێت، قوتابییەکە بەجوانی پرۆسەی دارشتن ئەنجام بدات. (سعاد عبدالكريم الوائلي:٢٠٠٤، ص ٨٤ ـ ٨٥).

هەروەها یەکێکی دیکە لەو هۆکارانەی پرۆسەی دارشتن لای قوتابی لاواز دەکەن ئەوەیە، کە بەشێک لە مامۆستایان بە زمانی زارەکی لەگەڵ قوتابییەکانیاندا قسە دەکەن، چونکە قوتابی لە قۆناغی سەرەتاییدا چاو لە مامۆستاکەی دەکات و لاسایی دەکاتەوە و لێوەی فێر دەبێت، لێرەوە ئیدی زۆر پێویستە زمانی مامۆستاکان لە کاتی وانەوتنەوەدا لەناو پۆلەکان پاراو و پەتی بێت.

ئەو هۆکارانەی لە بواری لاوازبوونی پرۆسەی دارشتن، پەیوەندییان بە قوتابییانەوە هەیە، زۆرن، کە ئەمانە هەندێکیانن:

١. ئارەزوو نەکردنی قوتابییان لە خوێندنەوەی دەرەکی.

٢. کەم نووسین، لەوانەیە ساڵێک بەتەواوەتی تێپەڕێت، کەچی قوتابی تەنانەت یەک بابەتیش نەنووسێتەوە، چونکە بەردەوامبوون

لەسەر نووسین، دەبێتە هۆی ئەوەی شێواز و هەگبەی هزری و زمانەوانیی قوتابی بەرەو پێشەوە ببات.

٣. سەرقاڵبوونی قوتابییان بە چالاکی زمانەوانی، کە لە قوتابخانە و نواندن و گوتاربێژی و گفتوگۆ و وانەکاندا بەرجەستە دەبێت. (سعاد عبدالكريم الوائلي: ٢٠٠٤، ص ٨٦).

**ئەنجام**

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەدا گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١. زمان زۆر گرنگە و بە ئامرازێک لە ژیانی فێربوون و فێرخوازیدا هەژمار دەکرێت، بۆیە دەتوانین ئەم ئامرازە گرنگە فێر بین، ئەویش لەرێگەی ئەنجامدانی دارشتنی زارەکی و نووسراو.

٢. چالاکی دارشتن چەند وێنەیەکی هەیە و مامۆستا هەڵیاندەبژێرێت و فێرخوازیش جێبەجێیان دەکات، چونکە دارشتن لە چەند بوارێکدا دەبێت.

٣. دوو تەوەر لاوازی لە پرۆسەی دارشتن دروست دەکەن، کە یەکەمیان تەوەری مامۆستایە و ئەوی دیکەشیان قوتابییە.

٤. دارشتن لە رووی تواناوە دوو جۆرە، زارەکی و نووسراو.

٥. دارشتن لە رووی بەکارهێنانەوە دوو جۆرە، ئەرکی و داهێنەرانە.

## سەرچاوەكان

**بە زمانی کوردی:**

١ـ مستەفا زەنگەنە و ئیسماعیل قەرەداغی (٢٠٠١)، شێواز و ڕێگاکانی وتنەوەی دارشتن، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر.

**بە زمانی عەرەبی:**

٢. أبوبكر عبدالقادر الغازي (٢٠٠٧)، مختار الصحاح، ط١، مؤسسة المختار، القاهرة.

٣. راتب قاسم عاشور و محمد فؤاد الحوامدة (٢٠٠٣)، اللغة العربية بين التنظير و التطبيق، ط١، دار الميسرة، عمان.

٤ـ رشدي أحمد طعيمة و محمد السيد مناع (٢٠٠١)، طرائق تدريس اللغة، دار الميسرة، عمان.

٥ـ سعاد عبدالكريم الوائلي (٢٠٠٤)، طرائق تدريس الأدب و البلاغة و التعبير بين التنظير و التطبيق، ط١، دار الشروق، عمان، الاردن.

٦. سميح أبو مغلي (١٩٩٩)، الأساليب الحديثة لتدريس اللغة العربية، دار مجدلاوي للنشر و التوزيع، عمان ـ الأردن.

٧. طه علي حسين الدليمي و سعاد عبدالكريم الوائلي (٢٠٠٥)، اللغة العربية ـ منهاجها و طرائق تدريسها، ط١، دار الشروق، عمان، الاردن.

٨ ـ عبدالرحمن الهاشمي (٢٠٠١)، التعبير ـ فلسفته واقعه ـ تدريسه ـ أساليب تصحيحية، دار الفكر العربي، القاهرة.

٩. عبدالله علي مصطفى (٢٠٠٢)، مهارات اللغة العربية، دار الميسرة، عمان ـ الأردن.

١٠. علي أحمد مذكور (١٩٩٧)، تدريس فنون اللغة العربية، دار الفكر العربي، القاهرة.

١١. فخري خليل النجار (٢٠١١)، الأسس الفنية للكتابة و التعبير، الطبعة الأولى، دار صفاء للنشر و التوزيع، عمان ـ الاردن.

١٢ـ فراس السليتي (٢٠٠٨)، فنون اللغة ـ المفهوم ـ الأهمية ـ المقدمات ـ البرامج التعليمية، عمان، الاردن.

١٣. فهد خليل زايد(٢٠٠٦)، أساليب تدريس اللغة العربية بين المهارة و الصعوبة، دار اليازوري، عمان، الاردن.

١٤. مجموعة من كبار اللغويين العرب (١٩٨٩)، المجمع العربي الأساسي، الأوراس.

## ملخص البحث

### (التعبير ـ المفهوم و أنواع و خطوات تدريسه)

أ.م.د.نريمان عبدالله خوشناو

**١ـ عنوان ومجال البحث:**

عنوان البحث هو (التعبير ـ المفهوم و أنواع و خطوات تدريسه)، مخصص للحديث عن مفهوم وجوانب مهمة للتعبير، ان الهدف الأساسي لتعليم اللغة الكردية، هو اكتساب المتعلم القدرة على الاتصال اللغوي الواضح السليم، سواء كان الأتصال شفويا أو كتابيا. وكل محاولة لتدريس اللغة الكردية يجب أن تؤدي إلى تحقيق هذا الهدف.

هذه الفنون الأربعة هي أركان الأتصال اللغوي، وهي متصلة ببعضها تمام الاتصال وكل منها يؤثر بالفنون الأخرى، فالمستمع الجيد هو بالضرورة متحدث جيد، و قارىء جيد و كاتب جيد، و القارىء الجيد هو بالضرورة متحدث جيد و قارىء جيد و كاتب جيد، والقارىء الجيد لابد أن يكون مستمع جيد و قارىء جيد.

**٢ـ سبب أختيار الموضوع:**

لقد التفتنا نحن الكرد قليلاً لهذا الموضوع، بشكل هناك بحوث قليل حولها، و لذا استغلينا هذه الفرصة بتخصيص وقتنا لدراسة هذا الفرع المهم من علم اللغة، لكي تصبح دراستنا مصدراً مساعداً للمكتبة الكردية.

**ـ منهج البحث:**

منهج بحثنا هو وصفي تحليلي، وعن طريقها تحدثنا عن مفهوم وتعريف وأنواع ونتائج وخطواط التعبير عن طريق الاستيعاب واعتماد على المصادر الاصيلة وتحليل تلك النصوص التي لها علاقة بهذا الموضوع.

**٤ـ مشكلة البحث:**

من أكبر المشاكل التي واجهتنا أثناء كتابة البحث، هو ترجمة تلك النصوص العربية الى اللغة الكردية، التي لها صلة بموضوع التعبير، لأن المكتبة الكردية في هذا

المجال اللغوي غير غنية، بشكل عشرات المصادر التي تتحدث عن مواضيع علم اللغة، ولكن لم تترجم الى اللغة الكردية، وهذا يظهر فقر حال المكتبة الكردية والأوساط العلمية.

**٥ـ مضمون البحث:**

يتألف البحث من مقدمة وأربعة أقسام:

القسم الأول: الذي هو بعنوان (مفهوم وتعريف التعبير)، يتكون من مبحثين، تحدثنا فيها عن (مفهوم التعبير، تعريف التعبير).

القسم الثاني: الذي هو بعنوان (أنواع التعبير)، يتكون من محورين، المحور الاول بعنوان (أنواع التعبير من حيث الأداء)، تتألف من (التعبير الشفوي، التعبير الكتابي)، والمحور الثاني بعنوان (أنواع التعبير من حيث استعماله)، تتألف من (التعبير الوظيفي، التعبير الإبداعي).

القسم الثالث: وهو الذي بعنوان (مهارات وأهمية التعبير)، يتكون من محورين، تحدثنا فيها (مهارات التعبير، أهمية التعبير).

القسم الرابع: الذي هو بعنوان (تدريس وأهداف وأسس التعبير)، يتكون من أربع محاور، المحور الأول بعنوان (خطوات تدريس التعبير)، والذي يتكون من (خطوات تدريس التعبير الشفوي، خطوات تدريس التعبير الكتابي).

المحور الثاني بعنوان (أهداف تعليم التعبير) والمحور الثالث بعنوان (أسس التعبير)، والذي يتألف من (الأسس النفسية، الأسس التربوية، الأسس اللغوية). المحور الرابع بعنوان (أسباب ضعف التلاميذ في التعبير).

# Introduction

## The Concept, The Types and Methods of Teaching Composition

**Ass.Pro.D.Nariman Abdullah khoshnaw**

### 1- Title and Thesis Statement of The Research

The paper entitled (The Concept, The Types and Methods of Teaching Composition) is devoted to explain the concept and important sides of composition. The main objective of composition, teaching language in general and Kurdish language in particular is to enable students linguistically to communicate appropriately with others either orally or in a written form. All the attempts and efforts of learning Kurdish language should be to achieve these mentioned purposes.

These four skills are considered as basic important skills of linguistics relation, which are all interrelated and in return they can affect each other. For this reason, a good listener is also a good speaker, a good reader, and a good writer, and a good reader is a good speaker and a good writer as well.

### 2- Reason of Choosing the Topic

Unfortunately, we as Kurds are lagging behind studying on this topic, as there are only incomplete and short studies. For this reason, we have seized this opportunity to carry out a study on this branch of linguistics and to make it as a supportive reference for Kurdish library.

### 3- Methodology

The methodology is an analytic descriptive method through which it explains the concept and definition of policy, language, language policy, and the procedures of language policy. Moreover this depends on authentic resources, and illustrating manuscripts related to this topic.

### 4- Thesis Problem

The most difficult problem and challenge facing us during this study was the translation of all these Arabic and English texts into Kurdish which were related to language policy. As Kurdish library is lagging behind these resources, there are tens of resources about applied linguistics in general and sociolinguistics in particular. These resources are not translated into Kurdish.

This means that the Kurdish library and the science and knowledge centers are poor and deprived.

**5- The Content of The Study**

The paper comprises of the introduction and four chapters:

Chapter one is devoted to (The Concept and Definition of Composition Writing). There are two sections, which are the concept of composition and the definition of composition writing.

Chapter two which is entitled (Types of Composition) comprises of two sections. The first one is about the types of composition in terms of ability; this includes oral composition and written composition. The second section is concerned with the types of composition in terms of use; this includes task composition writing, and creative composition writing

Chapter three is entitled (The Efficiency and The Importance of Composition). This chapter is made up of two sections which they shed a light on the efficiencies of writing composition and the importance of composition.

Chapter four is devoted to (The teaching, The Results, and The Basics of Composition Writing). It consists of four sections: The first section is about the steps of teaching composition; it includes the steps of teaching oral composition and written composition. The second section is dealt with the objectives of learning a composition. The third section is concerned with the basics of composition; it comprises of psychological basics of composition, educational basics of composition, and linguistics basics of composition. The fourth section is about the reasons of students' weakness in writing composition.

Finally, the conclusion, list of references, and the summary of the study in Kurdish and Arabic are cited.

# گۆڕان لە زماندا

**م. ی. سارا حسێن خالید**
پەروەردەی دەشتی هەولێر

**م. ی. ئەمیر مستۆ محەمەد**
بەشی شوێنەوار - کۆلیژی ئاداب
زانکۆی سەلاحەددین- هەولێر

**پێشەکی**

باسی کورتەیەک لە زمان دەکەین، ئاشکرایە هەموو بوونەوەرەکانی دونیا گۆڕانی بەسەردا دێت، هەر لە بووژانەوەی زەوی بگرە تا جەستەی مرۆڤ ڕۆژانە گۆڕان ڕوودەدات ئەگەر بە چاویش هەستی پێنەکەین ئەوا لە ڕووی بایەلۆجییەوە هەستی پێدەکرێت. زمانیش بەدەر نییە لەو گۆڕانکارییانە و گۆڕانی بەسەردادێ، بەڵام مەرج نییە ئەو گۆڕانە خێرا ڕووبدات و زوو هەستی پێبکرێت، گۆڕان لە زمان هێواشە، لەوانەیە دوای چەندەها ساڵ هەست بەو گۆڕانە بکرێت، چونکە گۆڕان زۆرجار لەلای کۆمەڵ نەویستراوە و کاتی دەوێت بۆ ڕاهاتن و کاریگەری لەسەر کۆمەڵ، زمان ئاوێنەی کۆمەڵ نەبێت زمانیش نابێت، زمان و کۆمەڵ دوو ڕاستە هێڵی تەریب بەیەکن کە بێیەک نابن ..(زمان هەمیشە بەرەو ئاسانی دەڕوات) بۆ ئەوەی توانا و وزە لەسەر قسە پێکەرانی کەم کاتەوە. بە کەمترین وزە زۆرترین بیر بگەیەنێت.

توێژینەوەکە لە پێشەکی و دوو بەش پێکدێت. لە بەشی یەکەمدا، باس لە گۆڕان لە زمان دەکات بەپێی تیۆرەکان. لە بەشی دووەمدا باس لە گۆڕان لە ئاستەکانی زماندا دەکات و لە فۆنەتیک و فۆنۆلۆجی، ڕێزمان (مۆرفۆلۆجی، سینتاکس).

لە کۆتاییدا خستنەڕووی ئەو ئەنجامەی پێی گەیشتووین، لەگەڵ لیستی سەرچاوەکان و کورتەیەک لە توێژینەوەکە بە زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراوەتە ڕوو

## بەشی یەکەم
## گۆڕان لە زماندا

چۆن زمان دەگۆڕێت و دەبێت بەچەند زارێکی جیاجیاوە. هەروەها زمانیش بە تێپەڕبوونی کات، دەگۆڕێت. بەم پێیە کوردی سەدەی حەڤدە و هەژدە دەبێت لە کوردی ئەمڕۆ جیاواز بێت. دەربارەی گۆڕان بە شێوەیەکی گشتی دەبێت سێ ڕاستی لە یاد نەکەین:-

١- هەموو زمانەکانی جیهان هەمیشە لە گۆڕاندان و لە توانای کەسدا نییە ئەم گۆڕانە ڕاگرێ یان کەمی کاتەوە، یان بەتەواوی نەیهێڵێت، چونکە گۆڕان لەگەڵ هەڵکەوتی زمان خۆیدایە.

٢- مەرج نییە گۆڕان زمان بەرەو تێکدان و هەڵوەشاندنەوە و لەناوچوون ببات. وەک هەندێ کەسی ساویلکە باوەڕیان وایە، بەڵکو گۆڕان لەوانەشە زمانەکە ئاسانتر بکات و وزە پارێز بێت.

٣- گۆڕان بەپێی یاسا و دەستوور ڕوودەدات، لە خۆوە نییە، هەر لەبەر ئەمەشە کە تەنها چەندین جۆرێک لە گۆڕان لە زمانی مرۆڤدا دەبینرێت و هەر ئەمانەش بە گۆڕانی ئاسا دادەنرێت (فتاح -٢٠١١، ١١٨-١١٩).

### تیۆرەکانی گۆڕان لە زماندا

### ١- تیۆری وزە پاراستن (وزە بەفیڕۆ نەدان):

بەپێی ئەم بیرە هەموو ئەو گۆڕانانەی کە لە زماندا ڕوودەدەن. دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئارەزووەی، کە لەمرۆڤدا هەیە. بۆ ئاسانکردنی دەربڕین بەواتایەکی تر هەموو گۆڕانێک بەمەبەستی سووککردنی ئەو ئەرکەیە کە دەکەوێتە سەر ماسوولکەکانی ئەو ئەندامانی ئاخاوتن. ئەم تیۆرە لە لایەن (زیف و تینی و کبورتسەوە ) پەسەند کراوە بەڵگەشیان بۆ ڕاستیی بیرەکە لەوەدایە:

أ- زمانەکانی ئەمڕۆ لە قۆناغەکانی پێشتریان ئاسانترن بۆ درکاندن.

ب- هەندێ گۆڕان بەهۆی ئەم بیردۆزەوە چاک لێکدەدرێتەوە.

**٢- تیۆری مارتنێت:**

بە باوەڕی زمانەوانی فەرەنسی (مارتنێت) هەموو زمانێک لەگەڵ پەیدابوونیا هۆکاری گۆڕانی لەگەڵدایە، چونکە هەموویان ئەو ئارەزووەیان تێدایە، کە ئاسان بێت و ئەرکێکی زۆر نەخاتە سەر ئەو کەسانەی کە قسەی پێدەکەن و بەکاریان دەهێنن. جا لەبەر ئەوەی زمانیش نارێکی زۆری تێدایە ئەم دیاردە ناوێزانەش تاڕادەیەک زمانیان لاسەنگ کردووە، قسەکەران تاڕادەیەک بەدوای هێنانەوەی ئەو لاسەنگییانە وێڵن و هەموو ئەو گۆڕانەی دێتە ئاراوە بۆ ئەم مەبەستە تەرخان دەکرێت. بێگومان ئەم ئامانجەی قسەکەران هەرگیز نایەتە دی، چونکە هێنانەوەی هاوسەنگی لەلایەک دەبێتە هۆی لاسەنگیی لایەکی تری زمانەکە. بەم جۆرە کێشەکە بەردەوام دەبێت، زمان و گۆڕان شان بەشانی یەکتر دەڕۆن و بەردەوام دەبن ، تەنها کاتێ زمان لە گۆڕان دەکەوێ کە لە ناو بچێت.

**٣- تیۆریی زمانی دایک:**

بەپێی ئەم بۆچوونە زمان دەگەڕێتەوە بۆ کاری دوو زمان یان زیاتر لەسەر یەکتری، ئەوانەی فێری زمانی بێگانە (دووەم) دەبن، ئاسایی بەر لەوەش زمانی دایکی خۆیان دەزانن، ئینجا یا زمانی دووەم بەتەواوی فێرنابن یان زمانەکەی خۆیان دەگۆڕێتەوە لەهەردوو بارەکەدا زمان گۆڕان دێتە ئاراوە.

**٤- تیۆری ڕووداوی مێژوویی و کۆمەڵایەتی:**

بەشێ لە زمانەوانەکان گۆڕانی زمان دەدەنە پاڵ ڕووداوی مێژوویی و کۆمەڵایەتی وەک شەڕ و جەنگی بەر بڵاو داگیرکردن و برسێتی و نەخۆشی و کۆچ و باری نائاسایی و ئاوەدانکردنەوەی وڵات و ...هتد. ئاشکرایە هەریەکە لەم هۆکارانە دەبنە هۆی زمان گۆڕان، بەڵام دیسانەوە ئەم هۆکارانە هەموو گۆڕانەکان لێکنادەنەوە.

هەریەکە لەم تیۆرانەی سەرەوە لایەنێکی گۆڕانمان بۆ لێکدەدەنەوە و دووپاتی ئەم لایەنە دەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی گۆڕان کارێکی ئاڵۆزە و زیاتر لە هۆیەک دەیهێنێتە دی ، هیچ لەم تیۆرانە بەتەنها دیاردەکە لێکنادەنەوە (فتاح، ٢٠١١، ١٢٩- ١٣١).

**هۆکاری گۆڕان لە زماندا**

**١- هۆکاری کەلتوور و ئاین:**

ئاین هۆکارێکی گرنگە کە گۆڕانێکی گرنگ دەخاتە ناو زمانەوە، واتە گوزارشتی وا دێنێتە ناو زمانەوە، کە دەبێتە هۆی گۆڕان لەو زمانە. لە زمانی کوردیدا ئاین کاریگەرییەکی زۆری هەیە، لەسەر زمان هەر لە نووسین و ئاخاوتنیشدا دیارە. بۆ نموونە ئاین کاریگەرترین هۆکارە بۆ چەسپاندنی ستاندارد بوونی زمانی عەرەبی لە نێوان (٢٢) دەوڵەتدا کە ئەویش عەرەبی فصحەیە و بەهۆی ئاینەوە کۆمەڵێ وشە دێتە ناو زمانەکە. ئەگەر سەیری رۆژنامە و گۆڤارەکان بکەین دەبینین کە پڕە لە وشەی عەرەبی و بیانی کە بە کاریگەری ئاینەکەوە بووە و لەو سەردەمەدا بە هۆی ئاینەکەوە خەڵکی هاندراوە کە فێری زمانی عەرەبی ببن کە زمانی ئاینەکە بووە. ئەمەش کاری کردووەتە سەر نووسین و ئاخاوتنی ڕۆژانەیان و دەبێتە هۆی گۆڕانی زمان.

**٢- هۆکاری ڕامیاری:**

یەکێکی تر لە هۆکارەکان هۆکاری ڕامیارییە کە کاریگەریی زۆری هەیە لەسەر گۆڕانی زمان چ بەنووسین بێت یان ئاخاوتن. بەهۆی دەسەڵاتی ڕامیارییەوە کاتێ کە میرنشینی بادینان لەسەر دەسەڵات بوون، کە بە کرمانجیی ژووروو قسەیان دەکرد شیعر و نووسراوەکانیان بەزۆری بەو زارەیە، یان کاتێ میرنشینی ئەردەڵان لەسەر دەسەڵات بوون و دیالێکتی گۆڕانیان بەکار دەهێنا، زۆر شاعیر کە بەو دیالێکتە نەدەدوان، بەڵام چۆن زمانی دەسەڵات بوو بەرهەمە ئەدەبییەکانیان بەو دیالێکتە دەنووسی و بڵاویان دەکردەوە، یان تورکیا

کاتێ کە کەمال ئەتا تورک هاتە سەر حوکم لە ساڵی (١٩٢٩) بڕیاری دا زمانی نووسین لە ئەلف بێی عەرەبییەوە بکات بە ئەلف بێی لاتینی. ئەمەش بووە هۆی گۆڕان لە زمانەکەدا (فرج، ٢٠٠٥، ٤٠).

**٣- هۆکاری کۆمەڵایەتی:**

زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، هۆیە بۆ لەیەکتر گەیشتن و دەربڕینی هەست و نەست و بیر و باوەڕ، واتە زمان دەبێتە هۆی دروستبوونی پەیوەندی، ئەم پەیوەندییەش لە دەوری خۆیدا کۆمەڵ پێکدێنی، واتە کۆمەڵی مرۆڤایەتی بێ زمان دروست نابێت، زمان بەبێ کۆمەڵیش هیچ دەبێت و لە ئاستێکی ڕاوەستاودا دەبێت. مرۆڤ وزە و توانای بیرکردنەوەی نابێت . (ئەورەحمانی حاجی مارف، ١٩٧٦، ٢٠).

بەپێی تێپەڕبوونی کات و لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی هزری مرۆڤ و تەکنەلۆجیادا، گۆڕان بەسەر کۆمەڵگادا دێت، وە زمانیش بەردەوام لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەدا دەڕوات و شان بەشانی دەگۆڕێت، چونکە زمان بەردەوام وەک هەموو شتێکی تر پێویستی بە نوێبوونەوە و گۆڕان هەیە بۆ بەردەوامی و مانەوەی لەم سەردەمەدا کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و ئامێری تەکنەلۆجیای ئەم سەردەمە هۆکارێکی گرنگن بۆ گۆڕانی زمان و کۆمەڵگەش، چونکە چەندان وشە و دەستەواژە و ڕستە دێنە ناو زمانەکەوە کە هی زمانەکە نین و خوازراون ئەمەش بڵاو دەبێتەوە و دەبێتە بەشێک لە وشەی زمانەکە و گۆڕان دێنێتە ئاراوە.

**٤- هۆکاری ئەدەبی و بزووتنەوە جیاجیاکان :**

کەرەستەی ئەدەب زمانە، زمان و ئەدەب کاریگەرییان لەسەر یەک هەیە. کاریگەریی ئەدەب زۆرترە لەسەر زمان، ئەدەب زمان دەوڵەمەند دەکات بەزۆری لە دەربڕینە نوێیەکاندا ئەویش لە ڕێی خوازە و میتافۆرەکانەوە. زمان بەردەوام دەربڕی نوێ دەخاتە ناوەوە، بەپێی تێڕوانینی کۆمەڵ ئەمەش گۆڕانی بەسەردا دێت، بۆ نموونە قۆناغە ئەدەبییەکان کە یەک بەدوای یەک کۆمەڵ گۆڕانکاری لە زمان دروست

کرد، کەواتە بەپێی کات و گۆڕانی ڕێبازەکان زمانیش گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

**٥-کاریگەریی زمانەکان لەسەر یەکتری:**

بێگومان کاریگەریی زمانەکان لەسەر یەکتری هۆیەکی سەرەکییە بۆ سەر زمان گۆڕین، تەنانەت کەلتووری نەتەوەییش دەشێوێنێت، هۆکاری پەیوەندی و بازرگانی هۆکارێکی سەرەکییە بۆ سەر زمان لە نێوان نەتەوەکاندا. لە کۆندا هاتوچۆو پەیوەندی کەم بووە، بۆیە گۆڕانکارییەکانیش کەم بوون، بەڵام لەم سەردەمانەی دواییدا هۆکاری پەیوەندیکردن و بازرگانیش زۆر بووە، بۆیە دەستەواژە و ڕستەی نوێ هاتووەتە سەر زمان ئەمەش کاری کردووەتە سەر گۆڕانی زمانی پەتی ئەگەر دوو زمان زۆر نزیک بن لەیەکەوە و پەیوەندیی نێوانیان باش بێت گۆڕانەکە زۆرتر بەرچاو دەکەوێت، چونکە کاریگەریی ئەو دوو زمانە لەسەر یەک کاردەکاتە سەر ئاخاوتنەکەیان و لێرەشەوە گۆڕانەکە دروست دەبێت، وەک چۆن ژیان لە گۆڕاندایە و شەوو ڕۆژ شتی نوێ دێتە ژیان جا هەندێ جار گۆڕانەکان خێران و کتوپڕ دەبێت. هەروەها زمانیش لە گۆڕاندایە، بەڵام گۆڕانی زمان هێواش و لەسەرخۆیە بە تایبەتی لە ئاستی ڕێزماندا.

## بەشی دووەم

## گۆڕان لە ئاستەکانی زماندا:

ئاشکرایە گۆڕان لە هەموو ئاستەکانی زماندا ڕوودەدات، لە هەر ئاستێ بەپێی تایبەتمەندیی خۆی گۆڕانەکە روو دەدات.

**١-ئاستی فۆنەتیک و فۆنەلۆجی:**

ئەم ئاستەی زمان زیاتر لە ئاستەکانی تر دەگۆڕێت و زۆرتریش هەستی پێدەکەین. لەم جۆرە گۆڕانە و هەندێ دیاردە لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا بەدی دەکرێت، زمانی کوردیش وەک زۆربەی زمانەکانی تری دونیا جیا نابێتەوە و قابیلی ئەو گۆڕانکارییەیە و

گۆڕانکاری بەسەردا دێت، بەڵام هەر زمانەو بەپێی تایبەتمەندیی زمانەکی و یاسا فۆنەلۆجییەکانی خۆی دەگۆڕێت، ئاستی فۆنەتیک زۆرتر و زووتر گۆڕانی بەسەردا دێت. (فتاح ، ٢٠١١، ١٩).

ئەم گۆڕانە زیاتر کاتێکە، کە دەنگ دەچێتە چوارچێوەی قسەکردنی ڕاستەوخۆوە. لە نووسیندا نووسەر بەپێی کەسایەتیی خۆیی و یاسا ڕێزمانییەکان دەنگەکان دەپارێزێت، واتە لە کاتی نووسیندا دەنگەکان زیاتر پارێزراوترن کەمتر لە گۆڕاندان وەک لە کاتی قسەکردندا. چونکە لەوانەیە زمانی قسەکردن جیاوازتر بێت تا ڕادەیەک لە زمانی نووسین. بۆ نموونە لە زمانی نووسیندا دەڵێین (دەخوێنێت_دەنووسێت....) لە ئاخاوتندا زیاتر دەڵێین (دەخوێنێ-دەنووسێ ...) دەنگی \ت\ دەرنابڕێت. لە ئاخاوتنەکەدا ئەمەش گۆڕانە لە ڕووی فۆرمەوە و واتای نەگۆڕیوە. گۆڕانکاری هەر دەنگێکی فۆنەتیکی تایبەت نییە بە یاسایەکی دیاریکراو بۆ گۆڕینی هەموو دەنگەکانی تر، بەڵکو گۆڕانی هەر دەنگێک دەگەڕێتەوە بۆ تایبەتمەندیی جیاوازی زمانەکە بەپێی قسەکەر (علی، ١٩٨٩، ٤٦).

لە ئاستی فۆنەتیک و فۆنەلۆجیدا هەندێ دیاردەی گۆڕان بەدی دەکرێت لەوانە :

١- توانەوە (لێکچوون یان دەنگ گۆڕکێ):

لێرەدا دەنگێک دەگۆڕێت بۆ دەنگێکی تر لەژێر کاری دەنگەکانی دراوسێیدا، هەندێ جار دەنگی پێشەوە یان دواوە دەگۆڕێت (یان دەتوێتەوە بەتایبەتی لە بزوێنەکان) (دزەیی، ٢٠١٤، ١٢٣-١٢٦)، بۆ نموونە:
دەنگی پێشەوە

پێش+ڕەو ______ پێشڕەو \پێژڕەو \
هەشت +
هەشت+ دە ----- هەشدە \ هەژدە\
پشت+دەر ----- پشدەر \پژدەر\
سەد +پیاو----- سەدپیاو \سەت پیاو\

دەنگی دواوە:

چی + بکەین ----- چی بکەین \چی پکەین\

حەب -------- حەپ

٢- بوونی دەنگی دوو لانە:-

لێرەدا هەندێ جار بزوێنێک دەخلیسکێ و دەبێتە دەنگێکی دوو لانە (دوو پارچە) لە یەک بڕگەدا. بۆ نموونە:-

ماین، مەی، ئاو...

٣- کرتاندن:

لە هەموو زمانێکدا ئارەزووی تێچوونی دەنگ هەیە. بەتایبەتی لە وشەیەک یان دوو وشە پێکەوە بێت دوو دەنگی وێکچووی یەک بەدوای یەکدا، ئەمەش بۆ خۆ دوور خستنەوەیە لە زۆر بەکارهێنانی ئەندامانی ئاخاوتن و ئاسانکاری دەربڕین ، کرتاندن هۆکارێکە بۆ ئاسانکردن هەرچەندە زمان کەرەستەیەک ناکرتێنی (فڕێ نادات ) کە کار بکاتە سەر واتا. بۆ نموونە :

لە + ئەم + بە ------- لەمبەر (ئە)

بڵند + تر -------- بڵنتر (د)

کورت + تر ------ کورتر (ت)

تواندنەوە -------- توانەوە (ند)

دەست ----------- دەس (ت)

٤- دروستبوونی دەنگی نوێ:

هەندێ جار لە ئەنجامی کۆبوونەوەی ڕیشەی وشەیەک و پاشگرێک دەنگێکی نوێ دێتە ئاراوە بۆ جیاکردنەوەی بزوێنەکان

بخۆ + ەوە ----- بخۆ ڕ ەوە (ر)

بردوە + ەوە ---- بردوەتەوە (ت)

بڵێ + ەوە ---- بڵێرەوە (ر)

پادشا + ی + ێک = پادشاییێک.

٥- تەبایی دەنگەکان:-

لێرەدا دوو دەنگ دەچنە سەر یەک بەتایبەتی لە کۆتایی وشەدا و دەنگێکی جیاواز دێنێتە کایەوە، کە ناچێتەوە سەر هیچ کامیان:

قاپی + ەکە------ قاپێکە (ی + ە = ئێ)

جوانوو+ەکە----- جوانۆکە (وو + ە = ۆ)

بەڵام هەندێ جار هەردوو دەنگەکە ڕێک دەکەون و یەکیان دەمێنێتەوە لەبری هەردووکیان. ئەم دیاردەیە لە زمانی کوردیدا زۆر بڵاوە بەتایبەتی کاتێ بزوێنێکی کورت دەکەوێتە تەک بزوێنێکی درێژ، بزوێنە کورتەکە لادەچێت و بزوێنی درێژ دەمێنێتەوە، نموونە:

بەردەکە + ان --- بەردەکان

لەدوێنێ+ەوە ---- لەدوێنێوە

٦- جیابوونەوەی دەنگ:

هەندێ جار دوو دەنگ وەک یەک کە دەچنە سەر یەک، یەکێکیان دەگۆڕێت بۆ دەنگێکی، بۆ ئاسانی دەربڕین. نموونە:-

پاش + شێو ---- پارشێو

پاش + سەنگ --- پارسەنگ

٧- جێگۆڕکێ:

لەم دیاردەیەدا دوو دەنگ یان دوو برگە جێگەکانیان دەگۆڕێتەوە، هەندێ جار وشەکە بە هەردوو شێوەیەکەی لە یەک زاراوەدا دەردەبڕێت، هەندێ جاریش هەر شێوە و لە زارێک دەردەکەوێت و بەکاردێت:

تەرزە (سلێمانی) تەزرە (هەولێری ) (هەمان زار )

خیز (ک. ژووروو) - زیخ (ک. ناوەڕاست)

ڕوانین - نواڕین (هەمان زار )

هەندێ جێگۆڕکێ پەیوەندی بە چینی کۆمەڵایەتی و ئاستی ڕۆشنبیرییەوە هەیە. و شێوەیەکی وشەکە مۆرکی کۆمەڵێکی تایبەتییە بۆ نموونە ئەم دوو شێوەی قسەکردنە:

خوێندەوار – نەخوێندەوار
جومعە – جوعمە
روبع – روعب
لەعلەت – نەعلەت

٨- دەنگ گۆڕکێ:

هەندێ دەنگ دەگۆڕێ بۆ هەندێ دەنگی تر لەکاتی قسەکردندا بێ ئەوەی کار بکاتە سەر واتای وشەکە:

ئەسپ – هەسپ
سوور – سۆر
ئاسمان – عاسمان

بەشێوەیەکی گشتی گۆڕان لە ئاستی فۆنەتیک و فۆنەلۆجیدا گۆڕان ڕوودەدات بێ ئەوەی کار بکاتە سەر واتای وشەکە، ئەم گۆڕانەش بەویستی قسەکەرە، هەندێ جاریش بێ ویستی قسەکەرە و دەنگەکە خۆی ئەوە دەخوازێت.

٢-گۆڕان لە ئاستی ڕێزمان (مۆرفۆلۆجی و سینتاکس):

لە ئاستی مۆرفۆلۆجی بە هەمان شێوە پەیوەندی بە واتاوە هەیە و هەر گۆڕانێ بەسەر مۆرفیمێک بێت دەبێتە گۆڕانی واتای وشەکە (دزەیی، ٢٠١٠، ٢٨-٢٠). ڕێزمانیش هەر وەک ئاستی فۆنەتیک دەگۆڕێت و گۆڕانی بەسەردا دێت، چونکە بەشێکە لە پێکهاتەی زمان، بەڵکو گۆڕان لەم ئاستەدا هێواشترە و کەمتر هەستی پێدەکەین، چونکە کەرەستەی ڕێزمان جێگیرترە و کەمتر خۆی بەدەست گۆڕانەوە دەدات. لە ئاستی مورفۆلۆجیدا گۆڕان زیاتر لە گیرەکەکاندا دەردەکەوێت، بەواتای ئەوە گیرەکەکانی زمان زیاتر لە بناغە و ڕەگ دەگۆڕێن، فەرهەنگی وشەی زمان بەردەوام لە گۆڕاندایە، گۆڕانی فەرهەنگی دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەک:

١- خواستن ، وەک وشەی (ویژدان) لە عەرەبییەوە خواستراوە.

٢- گۆڕانی واتای وەک وشەی (پێ) بەواتای یەکەی پێوانەیی.

٣- گۆڕان لە شێوەی داڕشتنی وشەدا، وەک وشەی ویژدان (وجدان) لە عەرەبییەوە خواستراوە، وشەی (پێ) بە واتای یەکەیەکی پێوانەیی لە ئەنجامی واتاییەوە هاتووە وشەی ئاسایی وشەی نوێ لە زمانی کوردیدا لە یەکێ لەم ڕێگایانەوە دروست دەبێت:

١- لێکدان:- خستنەپاڵ یەکتر وەک (قژزەرد- پەلکەزێڕینە.....)

٢- داڕشتن: - گیرەک - ڕەنگین – ئاسنین – نەرمایی ....

بەڵام لەم ساڵانە ڕێگەی تر پەیدا بوو بۆ داڕشتنی وشەی نوێ.

١- بەهۆی کرتاندن و لێکدانەوە: - لە داتاشینی وشەی (زانکۆ) ئەم دوو کارە ئاشکرایە وشەکە لە (زانین) لەگەڵ (کۆ) لێکدراوەوە.

٢- بەهۆی ئەکرۆنیمەوە، کە بریتییە لە لێکدانی بڕگەی یەکەمی یان دەنگی یەکەمی دوو وشە یان زیاتر، خوێندنەوەیان بەیەکەوە، نموونە وەک (د. خ) درووودی خوای لەسەر بێت) (پ. ز) پێش زاین، لە ئاستی سینتاکسیشدا گۆڕان هەیە، بەڵام بە کەمی ڕوودەدات، وەک لە ئاستەکانی تر، بەڵام لێرەشدا گۆڕان شتێکی ئاساییە، زۆر بەدی دەکرێت، گۆڕان لەم ئاستەدا لە چەند شێوەیەکدا دەبینرێت وەک گۆڕان لە ڕێکەوتنی بکەر و کاردا گۆڕان لە شێوەی ڕیزبوونی کەرەستەکانی ڕستە و لەناوچوون یان پەیدابوونی ئامراز. (فتاح ٢٠١١، ١٢٧- ١٢٩).

ریزبوونی کەرەستەکانی زمانی کوردی:

هەر زمانێک ڕێگایەکی هەیە بۆ ئەوەی پەیوەندیی نێوان وشەکانی نیشان بدات، لە هەندێ زماندا بۆ ئەوەی پەیوەندیی سینتاکسی نیشان بدات پشتی بە وشە و ڕیزبوون بەستووە (دزەیی، ٢٠١٤، ١٩٦).

١-SOV من نامەم نووسی.

٢-SVO من نووسیم نامە(*).

٣-OSV نامە من نووسیم(*).

٤-OVS نامەم نووسی من(*).

٥-VSO نووسیم من نامە(*).

٦ـ VOS نووسیم نامە من (*). (ئەمین ،١٩٨٩، ٧٣). دەتوانین بڵێین تەنها شێوازی یەکەم ڕێزمانییە و پێنج شێوازەکەی تر لە کاتی ئاخاوتنی ڕۆژانە بە کار دێت.

بەپێی بۆچوونی گرینبرگ (Green ber) لە ڕستەی ئاسایی هەموو جیهاندا بکەر هەمیشە بەکاردێت واتە لەم شەش حاڵەتەی سەرەوە تەنها سێی یەکیان ڕاستە، و لە زمانەوانیدا دەردەکەوێت ، بەڵام سیانەکەی تریان لە ژیانی ڕۆژانە و قسەکردندا کەوتووەتە سەر ئاخێوەر کە چۆن بەکاری دەهێنێت، بەڵام هەر زمانەو تایبەتمەندێتی خۆی هەیە، بۆ نموونە زمانی کوردی شێوەی sov بەکار دەهێنێت، ئەمەش ئەوە ناگەیەنی کە شێوەکانی تر پەیڕەو ناکات نا بەپێچەوانەوە بەکاری دەهێنێت، بەڵام لە شێوازی قسەکردنی ڕۆژانەدا و لە نووسین لە زمانی کوردیدا جۆری (sov) بەکاردەهێنرێت.

١-sov منداڵەکە نانەکەی خوارد.

٢-svo منداڵەکە خواردی نانەکە(*).

٣-osv نانەکە منداڵەکە خواردی(*) .

٤-ovs نانەکەی خوارد منداڵەکە(*). (ڕۆژانە ئاخێوەر)

٥-vso خواردی منداڵەکە نانەکە(*). (ڕۆژانە ئاخێوەر).

٦- vos خواردی نانەکە منداڵەکە(*).

هەرچەندە لە کۆندا زیاتر گرنگی بە یەک شێوازی ریزبوون دراوە ، بەڵام لە ئێستادا هەموو ریزبوونەکانی تر بەکار دێت.

جۆرەکانی ریزبوونی کەرەستە لە زمانی کوردیدا:

١- ریزبوونی چەسپاو:

مەبەست لە ریزبوونی چەسپاو ئەوەیە کە هەر گۆڕانێک لە ریزبوونی کەرەسەکان یا گرێیەکدا ڕوودبات دەبێتە هۆی گۆڕانی ئەرکی سینتاکسی ڕستەکە و هەروەها لێکدانەوەی واتایی کەرەسەکانیش دەگۆڕێت (علی، ١٩٩٨، ل١١) لەم جۆرە ریزبوونەدا کەرەسەکان پابەندی ریزبوونەکان دەبن.

منداڵەکە دایکی بینی.
دایکی منداڵەکەی بینی.

لە ڕستەی یەکەمدا (منداڵ) (بکەر)ە و (دایک) (بەرکار)ە ، بەڵام لە دووەمدا (دایک) (بکەر)ە و (منداڵ) (بەرکار)ە و بەگۆڕینی شوێنی کەرەسەکان واتاکەشی گۆڕا، وە بەهۆی ئەرکی وشەکانەوە ڕیزبوونەکە چەسپاو دەبێ و ناتوانین شوێنی وشەکان بگۆڕین، گۆڕانی ئەو وشانە گۆڕانی ئەرک و واتایی دروست دەکات (بەگیخانی، ١٩٩٦، ٥٣)، نموونە: (من ئەوم بینی) بە گۆڕینی شوێنی وشەکان شێوانی واتا یان ئەرکی وشەکان دەگۆڕێت، (ئەو منی بینی) بۆیە بە چەسپاویی وشەکان ئەرکیشیان چەسپاو دەبێت.

٢- ریزبوونی ئازاد:

ئەم ریزبوونە بریتییە لە ڕیزبوونی وشەکان لە ناو ڕستەدا بەشێوەیەکی جیاواز بێ ئەوەی کار لەواتای ڕستەکە بکات، واتە هەرگۆڕانێک (پێش و پاش خستن) لە ڕیزبوونی کەرەسەکاندا ڕوودات نابێتە هۆی گۆڕینی ئەرکی ڕێزمانی و واتایی ڕستەکان (علی. ١٩٩٨. ل١١).

نازدار ئەم قەڵەمەی کڕی.
ئەم قەڵەمە نازدار کڕی.

پاش و پێشخستنی بەرکار (ئەم قەڵەمە) ئەگەڕێتەوە بۆ بایەخدانی قسەکەر بەو بەشە کە مەبەستی کڕینی قەڵەمەکەیە. سەرەڕای جیاوازیی ئەو دوو جۆرە ڕیزبوونە. زۆربەی زمانەکان لە ڕیزبوونی وشەکاندا جیاوازییان هەیە. تێکڕای زمانەوانەکان دان بەوەدا دەنێن زمانێک نییە، ئەم ڕیزبوونە زیاتر پەیوەستە بە کەرەستە ناسەرەکییەکانی ڕستە.

ئازاد نانی خوارد .
ئازاد خواردی نان.
نانی خوارد ئازاد .

ئەمانە هەمان واتایان هەیە و ئەرکی ڕێزمانییان نەگۆڕاوە. بەڵام لە واتادا یەکن.

٣- ئاستی سیمانتیک:

گۆڕانی واتاییش دیسانەوە کارێکی دیاریکراوە لە زۆربەی زمانەکانی جیهاندا دەردەکەوێت. بە واتای ئەوەی گۆڕانی واتایی لە چەند شێوەیەکدا لە زمانە سروشتییەکان دووپات دەبێتەوە. کە گرنگترین گۆڕانەکانیش ئەمانەن:

**أ- واتا تەسکبوونەوە:**

لێرەدا وشەیەک واز لە واتا گشتییەکەی خۆی دێنێت، پسپۆڕی لە واتایەکی تردا پەیدا دەکات لەوانەشە وشەکە هەردوو واتاکەی بپارێزێت. لە هەمان کاتدا بە واتایەکی تر هەندێ جار واتاکەی گشتییە و هەندێ جاریش واتاکەشی تەسک بووەتەوە.

بۆ نموونە:

(نان) لە بنەڕەتدا وەک لە هەندێ فرێزدا هاتووە بە واتایەکی فراوان بەکارهاتووە و هەموو جۆرە خواردنێکی گرتووەتەوە وەک نانی پێ پەیدا ناکرێت، بەدوای نانا ڕادەکات، بەڵام لە ئێستادا واتاکەی تەسک بووەتەوە و بە واتای دیکەی وەک کولێرە دێت (منداڵەکەی نارد نان بکڕی – چوو بۆ نان) (فتاح، ٢٠١١، ل١٢٨)

**ب- واتا فراوانبوون:**

ئەم گۆڕانە پێچەوانەی واتا تەسکبوونەوەیە لێرەشدا وشەکە بە تێپەڕبوونی کات واتایەکی فراوان پەیدا دەکات و دیاردەیەکی گەورەتر دەگرێتەوە. بۆ نموونە:- وشەی (بزوێن) لە بنەڕەتدا بە واتای (لەوەڕگا) هاتووە، ئێستا واتاکەی فراوانتر بووە و هەموو شتێکی پێویست دەگرێتەوە.

**پ - بەرزبوونەوەی واتا:**

لێرەدا وشەیەک لە بنەڕەتدا بارودۆخێکی خراپی گەیاندبێت وازی لەو واتایەی هێناوە و واتایەکی باشتری وەرگرتووە بۆ نموونە وشەی

(شۆخ) کە ئێستا بە واتای جوان دێت لە قۆناغێکی پێشتردا بە واتای بێحەیا بەکارهاتووە.

**ت – نزمبوونەوەی واتا:–**

ئەوەش پێچەوانەی واتا بەرزبوونەوەیە و کاتێ ڕوودەدات کە وشەیەک واز لە واتایەکی باش یان بێ لایەن بن ئەو واتایە وەرگرێت کە سووکی و ڕیسوایی بگەیەنی، بۆ نموونە وشەی بۆر کە لە وشەی (بۆرە سوار) (بۆرە زەلام) دەبینرێ لە بنەڕەتدا لە واتادا بێ لایەن بووە بە واتای ئەوەی نە دۆخێکی خراپ و نە دۆخێکی باشی گەیاندووە لە کوردیی ئەمڕۆدا کە واتای وشەکە بەرەو ریسواییبوون هاتووە، چونکە ئەم وشەیە ئێستە بە واتای مرۆڤێکی لات و بێ پارە و بێ بەها و بێ باوەڕدێت.

**ئەنجامی توێژینەوەکەمان لە چەند خاڵێکدا دەخەینە ڕوو:**

١– هۆکاری گۆڕان لە زماندا بەهۆی باری سیاسی و رامیاری و کاریگەرییەکانی زمانانی دراوسێ لەسەر یەک دەبێت بە هۆی گۆڕان لە زماندا.

٢– زمان سیستەمێکی ئاڵۆزە و هەمیشە لەگۆڕاندایە، لە هەموو ئاستەکاندا، گۆڕانەکان بەپێی شێوەی زمان و بارودۆخی زمانەکە دەبێت لەسەر ئاخێوەرەکانی.

٣– گۆڕان لە هەموو ئاستەکاندا هەیە، بەڵام ئاستی فۆنۆلۆجی خێراترە وەک لە ئاستی ڕێزمان و سیمانتیک.

٤– زمان کەرەستەیەک فرێنادات کە پێویستی پێی بێت و کار بکاتە سەر توانستی قسەکردن و لێک تێگەشتن لە نێوان کۆمەڵدا.

## سەرچاوەکان

١- ئەمین، وریا عومەر. (١٩٨٩) ، بنج و سیما و واتا و یاساکانی گوێزانەوە- گ. رۆشنبیری نوێ –ژ ١٢٧٠
٢- ئەورەحمانی حاجی مارف . (١٩٧٦) ، زمانی کوردی لەبەر ڕۆشنایی فۆنەتیکدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد.
٣- بەگیخانی ، ئاواز حەمە سدیق. (١٩٩٦)، ڕیزبوونی کەرەستە لە زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین.
٤- دزەیی، عەبدولواحید موشیر. (٢٠١٠) ، واتاسازی وشە و ڕستە، چاپی یەکەم.
٥- دزەیی، عەبدولواحید موشیر. (٢٠١٤)، ڕێزمانی کوردی، چاپی یەکەم.
٦- فتاح ، محەمەد مەعروف . (٢٠١١) ، زمانەوانی، هەولێر، چاپی دووەم.
٧- فرج ، هۆگر محموود. (٢٠٠٠) ، پراگماتیک و واتای نیشانەکانی ، نامەی دکتۆرا ، زانکۆی سلێمانی ،
٨- علی، تالب حسێن . (١٩٨٩) ، فۆنەلۆجی کوردی و دیاردەکانی ئاسانبوونی فۆنیمەکان لە زاری سلێمانی دا، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەددین.
٩- علی، تالب حسێن . (١٩٩٨) ، هەندێ لایەن لە پەیوەندی نێوان ڕستە و واتا لە کوردیدا ، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی ئاداب ، زانکۆی سەلاحەددین.
١٠- محەمەد، عبدالله عەزیز. (١٩٩٠) ، گۆڕانی واتای وشە لە زمانی کوردیدا، نامەی ماستەر، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین.

## ملخص البحث

## التغير في اللغة

**سارا حسين خالد**
مديرية تربية اطراف أربيل

**أمير مسطو محمد**
قسم الاثار- الكلية اداب –
جامعة صلاح الدين – اربيل

اللغة كائنٌ حي في نموها وتبدُّل أطوارها، فهي عملية تشمل جميع مناحي الحياة على سبيل الاستغراق، لذا لم تكن بعيدة عن التغيّر والتطور والتجديد، وكان هذا لابدّ منه لتواكب مستجدات الحياة، بُغية بقائها ضمن اللغات الحيّة، وتؤدي وظيفتها الإبلاغية التواصلية التأثيرية بفاعلية.

هذا البحث الموسوم بـ ( التغير في اللغة )، محاولة للوقوف عند هذا النشاط التطوري للغة وذلك في محورين، المحور الأول: يتناول مفهوم التطور اللغوي وأسبابه ونظرياته، واختص المحور الثاني بذكر مظاهر وقوانين التغيّر والتطور اللغوي في المستويات اللغوية (الصوتي الفوناتيكي والفونولوجي، الصرفي، التركيب ، والدلالي).

وفي نهاية البحث تم إدراج أهم ما توصلت إليه الدراسة من النتائج، مع سرد الروافد العلمية التي استقى منها الباحث مادته العلمية.

# Abstract
# Change in language

**Sara husen xalid**
Direction of education a round Erbil

**Amer msto muhammed**
Salahaddin University- Erbil
College of arts
Archeology department

Language is a comprehensive process, it's been always changed and renewed in order to survive in the living languages way. Every time language must be changed and renewed, that's a natural of language. The title of this study (thesis) is "Change in language" which includes two chapters. The first chapter is discussed of change in languages and how those changes happen and also the theories of language and the factors of changes are discussed at the end of this chapter. In the second chapter, the changes in level of languages such as (phonetic and phonology, syntactic and semantic) are explained. At the end of this study the results and references are mentioned .

# شێوازی (مەنەلۆگی خود)، پرس و وەڵام لە شیعری گۆراندا

## توێژینەوەیەکی شێوازگەریی ئاماری و دەروونییە

**پ. ی .د. حەمە نوری عومەر کاکی**
بەشی کوردی / کۆلێجی زمان
زانکۆی سلێمانی

**پێشەکی :**

گومان لەوەدا نییە جۆری خوێندنەوەکان، یەک شێوەی تێڕوانین و دەرهاویشتەی لێناکەوێتەوە، بەکارهێنانی وشەی پرس بەرامبەر بە (سؤال و قضية)ی عەرەبی (کەیس) بەکاردێت ، لەم توێژینەوەیەدا بەهەردوو واتاکە بەپێی ڕستە شیعرییەکان بەکارهاتووە و هۆیەکی سەرەکیش ئەوەیە گۆران وشەی (**پرس**)ی بەزۆری بەکار هێناوە و پرسکردنەکانی گۆران لە ناو دێڕە شیعرەکاندا لەوانەیە بووبن بەجێگای سەرنجی هەندێک لەخوێنەران و ڕەخنەگران، بەڵام ئەم توێژینەوەیە وەک کارێکی ئەکادیمی لە دوو تەوەردا بەگرنگییەوە دەڕوانێتە ئەو پرسە گەورەیە، لەبەشی یەکەمدا، وەک تواناو دەسەڵاتی زمانزانی لای گۆران ئەو کردە ڕێزمانییە دەخاتەڕوو، بۆیە بەمیتۆدی شێوازگەری ئامار ئەرکی گەڵاڵەکردن و کۆکردنەوە و بەئەنجام گەیاندنی ئەو کایەزمانییەی بەژمارە و داتای لەدوو خشتەدا بەرهەم هێناوە، بەشی دووەم بۆ گرێدان و بەستنەوەی ئەو دۆخە ڕێزمانییە، بەمیتۆدی دەروونی شیکاری و لێکدانەوە بۆ هەندێک لەو پارچە شیعرانە کراون کە بەچڕی پرس و وەڵام ، یان (مەنەلۆگی خود)یان تێدا دەبینرێن و هەر بەو ڕێبازو میتۆدە، گرێ و پرسەکۆمەڵایەتی و دەروونییەکانی گۆران شیدەکرێنەوە و فۆکس دەخرێتە سەرلایەنی پرس لە نێو ئەو ڕستە شیعرییانەی زیاتر بەمەبەستی ژانری سۆزداری و خۆشەویستی

و جوانیی سروشت و ئافرەت و مرۆڤ ، کە ئەم بابەتانە لای گۆران بوون بەمۆتیڤێک بۆ دەربڕینی بیروڕا لۆژیکی و فەلسەفییەکانی شاعیر . هەروەها لەم توێژینەوەیەدا باس لەهەندێک لەو پرسانەش کراون ، کە وەڵامەکانیان دەستگیر نەبووە، یان بەسرکراوی ماونەتەوە لەدووتوێی دەقە شیعرییەکانیدا کارای کردوون و لەتەک ئیستاتیکای هونەری شیعری و زمانەوانییەکەیدا ئامێتەی کردوون . لەکۆتاییدا لەچەند خاڵێکدا ئەنجامە گرنگەکان دیاریکراون و ئەو سەرچاوانەی سوودیان لێوەرگیراوە بۆ پاڵپشتی بیروڕاکانی توێژەر وەک ڕێبازی توێژینەوەی زانستی ڕیزکراون .

## بەشی یەکەم :
## ڕێژەی پرس وەک پێکهاتەیەکی زمانی
## لە سەرجەمی شیعرە لیریکییەکانی گۆراندا

یەکێک لەئەرک و گرنگییەکانی شێوازگەریی ئامار کۆکردنەوە و دەرخستنی ڕێژەی بەکارهێنانی هەندێک لە پێکهاتە-کانی زمانە و جۆری ڕستەکان سوودێکی گرنگی دەبێت لە توێژینەوەی تێکستە ئەدەبییەکاندا. لەدوای گەڕان و پشکنینێکی زانستییانە وا بەچاک زانرا، کە ئەنجامە ئامارییەکان لەدوو خشتەدا بخرێنەڕوو، خشتەی یەکەمیان تایبەتە بەژمارە و جۆری وشەی پرس و شوێنیان لەدەقە شیعرییەکاندا و ژمارەی لاپەڕەکانی ئەو دەقە شیعرییانەی لەدیوانی گۆراندا چاپکراون. خشتەی دووەم تایبەتە بەوشەی وەڵام ، یان ئەو ڕستە و دەستەواژەشیعرییانەی، کە هەندێکیان ڕاستەوخۆ و هەندێکیشیان ناڕاستەوخۆ بەشێوازی پراگماتیکی و جۆراو جۆر دەلالەتی وەڵام دەبەخشن، لەگەڵ ژمارەی لاپەڕەی دیوانی گۆران. ئەنجامی ئەم کارە ئامارییە پێوەست دەبێت بە شیکاری و لێکدانەوەی پێویست لەڕووی دەروونییەوە، لە بەشی دووەمی ئەم توێژینەوەیەدا کاری لەسەردەکرێت .

**خشتەی( ١) ئاماری ڕستە پرسییەکان**

| ژ | ناونیشانی شیعر | وشەی پرس | ئەو دێڕە شیعرەی وشەی پرسی تێدایە | ژ. لاپەڕە لە دیوانەکەدا |
|---|---|---|---|---|
| ١ | ئـــــــافرەت و جوانی! | کام (٨ جار) | کام ئەستێرەی گەش، کام گــوڵی کێــوی (تاکۆتــایی کۆپلەکە) | ٩ – ١٠ |
| ٢ | ئاواتی دووری | کوا، (٧ جار)، کوانێ(٥ جار) | کواباڵــەتیــژەکــانی نیگــای حوسنی دلبەرت؟.تا کۆتـایی کۆپلــە شــیعرەکــە، کــوا حوســـنی بـــێ میســـال ؟هــەروەهــا ...کــوا مــاچی لێوی ئاڵ...؟ | ١٣ –١٤ |
| ٣ | گوڵی خوێناوی | هێز...؟ هێز...؟ هێز ....؟ (لەناو زمانەکەدا) | نـازانم ئـەمجـا دێیـت .....؟ ناتـــەوێ ئـــەم زامـــی ســـەرجڵــەم.؟ تفــەنگــی دوشمنیش پێکاتی ؟ | ١٧<br>١٧<br>١٨ |
| ٤ | حوزنی پەچە | چییە(٢ جار) بەچی( ١جار) | چییــە، کــە هــەیکــەلــی مــەڕمــەڕ..؟چییـە تـەفـاوتی بوون و نەبوونی ،..؟بە چی لەزیخی دراوسێ..؟ | ١٩ |
| ٥ | لەدرزی پەچەوە | چی ؟ (١جار) چ ؟ ( ١جار) | چی بنووسم ؟ خوایە.. بێینە..بڵێم چ چاوێک ؟ | ٣٥ |
| ٦ | بۆ خانمێک | چۆن ؟ ١جار | نازانم ئەبێ چۆن...؟ | ٣٦ |
| ٧ | هـــەڵبـــەســـتی ڕەنجاو | کەی؟ ٥ جار چی؟٢ جار چەن؟٢ جار | کەی تۆم دیوە؟ کەی؟ دڵداری چی؟..؟ چەن بێ تاسە، چەن..؟ | ٣٧ |
| ٨ | هـــەڵبـــەســـتی پەشیمان | چۆن...؟ ١ جار | چۆن ئەتوانم ...؟ | ٤٠ |

| ٩ | نیاز ... | ساکەی؟ ١جار | چـــاوەنـــوارپم ســـاکەی گەردوون ؟ | ٤٣ |
|---|---|---|---|---|
| ١٠ | جوانی بێ ناو | ئەزانی.چیم؟ ١جار | ئەزانی شپرزەو.......چیم ؟ | ٤٦ |
| ١١ | بـــۆ کچێکـــی بێگانە | بۆچی ؟١جار چەن ؟ ١جار | (بـۆچی؟) باشـەپێت بڵـێم .. بـەڕواڵـەت چـەن پرشـنگ دا..؟ | ٤٨ |
| ١٢ | ئاهەنگێک لەنـاو ڕان | چۆن......؟ ١جار چەن ..؟ ١ جار | چۆن بەپێی خۆی ...؟ چەن لەدێدا هەبێ....؟ | ٥٠ |
| ١٣ | لەلادێ | ئاخۆ...کێ...؟ ١ | خوایە ئاخۆ گوڵی کێ.....؟ | ٦٠ |
| ١٤ | ئەڕۆی ئۆغر | ناکەی....؟١ ئۆغر ؟ ١٢ | لـەهـەر هـەشـت دێـڕەکـەی غەزەلەکەدا ١٢ جار پرسی تێدایە | ٦٣ |
| ١٥ | هەرچەن ... | کێ .....؟ ١ | کێ لەو حیجازی ...؟ | ٦٤ |
| ١٦ | ئـــەی شـــەوقـی گەلاوێژ ! | چۆن ..... ؟١ | چۆن مەحکەمەیی ....؟ | ٦٥ |
| ١٧ | تاوێ نەگەڕا .. | کوانێ...؟١جار بۆ ..؟١جار | توخوا دڵەکەم کوانێ...؟ بۆ ڕەش بو...؟ | ٦٧ |
| ١٨ | لەبەختی تار .. | هەتا کەی..؟ ٢ جار | هـەتاکـەی ......؟ هـەتـا کـەی ....؟ | ٦٩ |
| ١٩ | ژن | لەکوێ .....؟ ١جار | لەکوێ لەسەتحی زەمینا...؟ | ٧٤ |
| ٢٠ | هـــاوڕێم بـــێ کەس | کام.....؟ ٤ جار چی ..؟١ جار، چەن..؟ ٢ جار | کــام پیــاو مــاقوڵ ...کــام گەورە؟ چـــی بـــەجـــێ مـــا؟ کـــام گیرۆدەی ؟چەن گەش بوو؟ چەن ڕەش بوو؟ | ٨٤-٨٥ ٨٩ ٨٩ |
| ٢١ | لاوانـــــــــەوەی | بۆچ..؟١جار | ئەی برا بۆچ ئەدەن....؟ | ٩٢ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | سەرەرێ | | | |
| ٢٢ | لەسەرەمەرگی هیوادا | بۆ .....؟ ٢ جار | بۆ زەردەخەنەی...؟ بۆ لەژێر...؟ | ٩٤ |
| ٢٢ | شیوەنی گوڵاڵە | چ زوو...؟ ٣ جار ئەی..؟ ٢جار، چ ..؟٢ جار بۆچ..؟١جار. کام ..؟٢ جار. چ..؟ ٢ جار | چ زوو مـــــــردی؟چ زوو کەوتیتە..؟ چ داوێکە..؟ چ ئینسافێکە..؟ منت بۆچ کرد..؟لەسەرتۆ کام یەخە..؟ کام ئەستۆ ..؟ چ کۆچێ بوو.. چ کۆچێ بوو؟! | ٩٧ ٩٨ ٩٩ ٩٩ ٩٩ |
| ٢٣ | بۆ بلبل | ئەی..؟ ٣ جار ،کام.......؟ ١٠جار ، چۆن...؟ ٦ جار ،کوێ..؟ ٣ جار ، بۆچی ..؟ ١ جار ، بۆچ ..؟ ٢ جار ، چی ...؟٣ جار ، کەی ..؟١ جار، هەچ ..؟١ جار ،چلۆن ...؟ ١ جار . هەچ ، کوێ ؟ ١ جار | ئەی باڵداری ئێسک سووک...کام سەرچڵ ...کام ..؟، چۆن دێتەدەر ؟....؟چۆن ئەوەندەبەکۆڵە؟ کام بەستە؟ کام گۆرانی ؟..ئەمیان لەکوێ ، ئەو لەکوێ ؟ کام شاخ ؟ کام ئاسمان ؟ یا کام دەریا ؟ بۆچی ..؟ کەی .. چۆن ..؟ چیمان لێ دێ...؟چی....؟ کام....؟ یان تەنانەت بۆچ ...؟ فرمێسک..بۆچ..؟ هەچ کوێ ئەچین ؟ ئیتر چلۆن بخوێنین ؟ | ١٠٣ ١٠٤ ١٠٥ ١٠٧ ١٠٨ ١٠٩ |
| ٢٤ | بۆ گەورەیەکی شیعر دۆست | کەی...؟ ٣ جار کامە..؟٢ جار | ئەو دڵە، کەی ...؟ گۆشتی بێ گیان..کامە؟ شیعری کامە؟ کەی بۆ مەئمور..؟ کەی چاو....؟ | ١١٥ ١١٦ |
| ٢٥ | دەروێـــــــــش | کام .....؟ | نەکردایە، خواعالم لەکام....؟ | ١٢٠ |

| | عەبدوڵلا | ١جار | | |
|---|---|---|---|---|
| ٢٦ | هەڵبەستی دەروون | بۆچی...؟١ جار | بۆچی وەها دوورن لەیەک ...؟ | ١٢١ |
| ٢٧ | جواب بۆ جەناب | ئاخۆ ...؟١ جار | ئاخۆ چ شاعیرێکی تر شیعرە پیشەی ..؟ | ١٢٢ |
| ٢٨ | گەشت لە قەرەداغ | کێ ......؟٢ جار<br>چیت...؟١ جار<br>ئاخۆ..؟١جار<br>هێز٢ جار<br>کێ..؟ ١جار<br>تاکەی ..؟١جار<br>چ ...؟١جار | کێ مرد...کێ کوژرا ؟<br>چیت کرد باڵدارت لەخۆت خرۆشان؟<br>ئاخۆ ...بۆ ژیان ..یان بۆ ...؟<br>خەوە خەیاڵە...هیی فریشتە؟<br>بەرامبەر بەکێ ؟<br>تاکەی ئاهەنگ و ؟<br>چ وادەی ....سەرە؟ | ١٤٦<br>١٥٠<br>١٥١<br>١٥٢<br>١٥٤<br>١٥٤<br>١٥٤ |
| ٢٩ | سەوزەگیای پایز | چیم...؟ ١جار<br>بۆچ..؟٢ جار | خۆم بەخۆم ئەڵێم .....؟ بۆچ ....؟ بۆچ کردەوەی ئەو نابینێ چاوم ؟ | ١٦٧<br>١٦٨ |
| ٣٠ | بەسەرهاتی ئەستێرەیەک | کام ....؟ ١جار | لەکام ڕۆحا نابزوێنێ سا زویری ؟ | ١٧٥ |
| ٣١ | دار چوالەی پشکووتوو | کێ..؟١ جار | ڕەپ ڕاوەستابوون...بە پشت سەری کێ؟ | ١٧٦ |
| ٣٢ | تازە؟ | هێز، بەئاوازەوە،٥ جار | سەما تازە جیلوەی ستارەی نەزەر ؟ هەموو نوقمی ....ئەم شەوەن ؟ | ١٨٠ |
| ٣٣ | ئاخ ، هەزار ئاخ ... | کوا..؟٣جار، بۆ..؟٩جار، بۆچی؟ ١جار | کوا ؟ مەگەر ئەصڵی نەبوو؟<br>بۆ سەرم نەرمە.... داخەکەم؟<br>بۆ لەنزمی و ....لووطە شاخەکەم ؟ | ١٨٥<br>١٨٦ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | بـۆچی .....بـوو بـەپـەردەی ئارەزوو .....؟ بـۆ زوبـانی ....سـەربـەست بلێم ؟ بۆ نەهاتە...گوفتارا نەقەت؟ بۆ نەبوومە.....ئازانە قەت؟ کـوا نگینـی بـەختـی مـن؟ کوانێ تاج و تەختی من؟ بۆ لـەخـاکی .. غـەدر ئـەکـەی؟. پێم ؟کوا نگین و تەختەکەم ؟بۆ لە...بکات و بێتەخوار ؟ | |
| ٣٤ | ئیلهامی ((هاوار )) | کەی ؟ ٢ جار | کـەی ئـەنـەوێ بـۆ سـندان پەرستی ؟ کـەی قنیـات ئـەکـا بـەبـای ناکامی ؟ | ١٨٧ |
| ٣٥ | جەژنی نەورۆز | چی؟ ١جار | چی خۆشترە لەوەی...گشت ئاسمان بێ؟ | ١٩٤ |
| ٣٦ | ڕۆڵەی بێ دایک | کام ؟ ١ جار | کـام ویجـدان ناداتــە بــەر نووکی نەشتەر ؟ | ١٩٨ |
| ٣٧ | بۆ هیوای کورم | بۆچی؟ ٢ جار | بـۆچی دەرمــانی وەنــەوز ئەبری؟، کورم بۆچی ...؟ | ٢٠١ |
| | | چییە؟٤ جار | چییــە ئــەم گرییــە بــێ غایــــە...؟چییــــە ئــــەم قـەتـرە....؟چییـە فـەرقـت ؟ چییە توخوا | ٢٠١ |
| | | لەبەرچی؟ ٢ | لـەبـەرچـی ئـەو هـەتـاکو..؟ لەبەرچی نەشئەیی...؟ | ٢٠١ |
| | | چ؟١ جار | چ ئێشێکە | ٢٠١ |
| | | بەچی ؟ ٢ جار | بەچی مـەعلووم بـەشـوێنی ...؟ بەچی مـەعلـووم کـەچـی لەوتەختی.؟ | ٢٠٢ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | چی؟١ جار | چی لەوتەختی....؟ | ٢٠٣ |
| ٣٨ | یار | بۆ چی؟ ١جار | بۆچی تو خوا؟ | ٢٠٤ |
| ٣٩ | دوا سەرنج... | بۆ؟ ٢ جار لەبەر چی؟١جار، چی؟١ جار | بۆ كز ڕاوەستاوی...؟ بۆ دەستت ناوەتە...؟ لەبەرچی ئەگرنە...؟ سەرنجت...ڕووی دەمی پرسكردنی ڕوون؟ڕاسپێری چیی پێیە...؟ | ٢٠٦ |
| ٤٠ | قالەمرد | هێز لەسەر وشەی نازانی...؟ ٢ جار | نازانی : قالە مرد لەدوو دێڕدا، لەدێڕی: شاغونچەی خەلقی تافی جوانی ...گەڵا ڕێزا نی؟ | ٢١٢ |
| ٤١ | وەڵامی پرس | بۆچ؟ ٢ جار | ئەیپرسی لێم بۆچ وا ماتی ؟ بۆچ هەمیشە خەمبار دیاری؟ | ٢٢١ |
| ٤٢ | بۆ گوڵی لاولاو | لەبەرچی؟ ١جار چییە؟١جار بۆ چی ؟١جار | لەبەرچی سیس ئەبی وا زوو؟ چییە ئەسبابی ژاكانت؟ هەمووتاوێكە ڕۆژهەڵهاتووە، بۆچی وەها بێ دەنگ ئەژاكێی ؟ | ٢٢٣ |
| ٤٣ | ئەی نەی | چییە؟١جار بۆ چ ؟١جار سترێس٢ جار | ئەی نەی چییە وابەسۆزو سازی؟ بۆچ تۆش وەكو ئێمە عیشق بازی؟ | ٢٢٤ |
| ٤٤ | ئاوێنەی هەستیم | چ..؟ جار٢ | لاكن چ باك؟ڕاستییەكەی: چ دەسەڵات؟ | ٢٢٥ |
| ٤٥ | زەنگی پەستی | چییە؟ ٣ جار هەتا | چییە ئەی ڕۆحی بێ لێوارو... هەتا كەی؟ | ٢٢٧ |

| | | کەی؟١جار | چییـــــــــە ئـــــــــەم دەنگە؟....شوعوورە؟<br>چییـــــــــە ئـــــــــەم زەنگەزەنگەی..وڵاتی؟ | |
|---|---|---|---|---|
| ٤٦ | گیان | چی ؟ ٣جار<br>هێز٥ جار<br>کام ٤ جار<br>چۆن ؟ ١جار<br>کەی ١جار<br>کوا؟ ١جار | نازانم تۆ چیت ئەی گیان؟<br>نازانم تۆ چیت؟ من چیم ؟<br>تۆ من نیت ؟ یا من تۆ نیم ؟<br>تۆ دنیامی ؟یا دنیام :..؟<br>تۆ و ژیان کامتان کامن ؟<br>کامتان نەوتی چرامن ؟<br>یاخود پرشنگ کامتانن ؟<br>یا هەردوو: هەردووکتانن ؟<br>ڕۆژێـــک .. ســـبەی دوو سبەی ؟<br>عایەن نی یەچۆن ، یا کەی،<br>بەڵام ئەئی گیان تۆ کوانێ<br>... قەبرت یا ناونیشانت ؟ | ٢٢٨-٢٢٩ |
| ٤٧ | ((گوڵاڵە برایمە..<br>گری.. گری)) | کێ ؟١جار<br>بۆچی؟١جار<br>...چی ؟١جار<br>کام...؟١جار | لەکێ؟ لەنەتەوەی کۆریا<br>بۆچی؟ چونکە مەردەو وریا !<br>هەرکۆریای چی؟<br>ڕووزەردی شەرم...ئەکەنە کام خاوەن برین ؟! | ٢٤٠<br><br><br>٢٤٤ |
| ٤٨ | شەهید بەیادی شەشی ... | کەی...؟١جار | ئەوانە کەی لە......؟ | ٢٦٥ |
| ٤٩ | لەبنی بیرا | کام ...؟١جار<br>کێ ...؟ ٢ جار | ئەخۆن لەکام کاسەی پرم؟<br>کێ نانی وشک، کێ...کور؟ | ٢٧٣ |
| ٥٠ | بۆ مایکڵ | چی ؟١جار | وڵاتی : دوو... لەسەر چی؟ | ٢٧٦ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٥١ | بانگێک...بۆ پۆڵ ڕۆپسن... | | (جۆلیۆ نەیوت : ڕاستی و گۆرانیی ڕۆپسن،، نەترسن) | ٢٨٧ |
| ٥٢ | لەزیندانا چواردەی تەمووز | چی؟ ١جار | خەو ئەبینم ! جەمهووریی چی ؟ | ٢٨١ |
| ٥٣ | بت – بتەوان | هێز؟ ٩ جار<br><br><br><br><br>چی؟١جار<br>کێ؟٤ جار<br>ئەی + هێز ؟<br>٤ جار<br><br><br>کوا؟ ٣ جار<br>چەن؟ ١جار | نەموت کەڕبە؟<br>نەموت کوێربە؟<br>نەموت عیلمی لاڵی فێر بە؟<br>هەزار دەق خۆت گەوج و کەر کە؟<br>من چیم ؟ من کێم؟<br>ئەی بت ؟ئەی بتەوان ؟<br>شەیتان؟<br>خاوەندانی دەزگاو دووکان؟<br>کوانێ بتم؟<br>کێ کوشتی کێ ؟ بتم<br>کوانێ ؟ من ..کێ نازانێ؟<br>چەن گەوج بووم...؟<br>ئەی بتەوان کوا؟ بتەوان؟ | ٢٨٥<br><br><br><br><br><br>٢٨٨<br><br><br><br><br>٢٨٩<br>٢٩٠ |
| ٥٤ | شۆڕشگێڕ | کێ....؟١جار | وتی ...کێ گەورەی کوشت ؟ | ٢٩٤ |
| ٥٥ | مۆسکۆی جوان | کام...؟١جار | لەکام جوانیت...؟ | ٣٠٤ |
| ٥٦ | بەڕێگادا..بەرەو کۆنفرانس | کام ...؟ ٢ جار | کام شێر؟ کام شێر بەزین دەرچوو؟ | ٣١٣ |
| ٥٧ | نەورۆزی ٦١ | بۆ ..؟١جار | فرمێسک لە چاوت بۆ ئەتکێ؟... | ٣١٧ |
| ٥٨ | ئەرزوحاڵ | هێز لەسەر وشەی (بزانن) ٤ جار | بزانن: من یا ئەو، لەحەق پەرلەمان...؟<br>بزانن من یا ئەو کەڵکی ...؟ | ٣٨٢<br><br>٣٨٣ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| | | | بزانن من یا ئەو...نەء<br>ناڵێین...تا ئەمرین؟<br>بزانن: من یا ئەو بۆ پاکۆی<br>سەری گەل ....؟ | |
| ٥٩ | دەنگی مردوو | چییە؟ ١جار<br>چ ؟ ١جار | دوایی مەبزوون ، بەموو<br>چییە؟<br>ئەوسا وەک زیندوو....چ<br>شوومێک بوو...؟ | ٣٨٥<br>٣٨٧ |
| ٦٠ | جاسووس .. | چۆن ؟١جار<br>چییە؟١جار<br>چی؟٢ جار<br>کام؟ ٢ جار | بەڵام من .. چۆن<br>دەربەستم؟<br>ژان چییە و زیان چی؟<br>بەزەیی و ویجدان چی ؟<br>درەنگ..زوو..ڕۆژێک دێ :<br>کام ئینسان، لەکام جێ؟ | ٣٨٩ |
| ٦١ | چەقەڵ | کام؟١جار،بەڕ<br>استەوخۆو<br>(یان) بۆ سێ<br>ڕستەی دیکە<br>بەناراستەوخۆ | لەکام کەتنا کول ئەکەی<br>بیر؟<br>دانت لە گۆشت مریشک<br>جیرە، یان کەڵەشێر..؟ بۆ<br>کولێنی پڕخێروبێر؟<br>بۆ قۆزتنەوەی کۆتری سپی<br>.؟ | ٣٩٠ |
| ٦٢ | سەگ وەڕ | مۆرفێمی<br>(یان)<br>بەنادیاری : ٢<br>جار ٢ جار | - بتنێمە ژێر: بەگاز،<br>بەقەپ؟<br>- توولەی بن ئاو<br>سەگی خوێری !<br>وات لێ هات لەمن<br>بوەڕی؟<br>- وات لێ هات لەمن<br>بوەڕی؟ | ٣٩٢ |

لە ئەنجامی ئەم خشتە ئامارییەدا ، ئەم داتایانە دەرکەوتوون ، لەکۆی ١٠٠ صەد شیعری ( غەزەل و قەصیدە) دا ، ٦٣ شەست و سێ شیعریان ڕستەی پرسی تێدایەو تەنیا لە٣٧ دانەیاندا بابەتی پرسی تێدا نییە! هەروەها کۆی ڕستە پرسییەکانیش ٢٦٧ ڕستەی شیعریی پرسیین. هەرچی ئەو ئامراز و ئارتیکەڵانەیە، کە لەڕستە پرسییەکاندا بەکارهاتوون ، ئەگەر نەڵێین هەموو ، ئەوا دەتوانین بڵێین زۆربەی هەرەزۆری ئامراز و ئارتیکەڵە پرسییەکانی زمانی کوردی بەکار بردووە، وەک : **ئاخۆ ، ئەی ، بۆ، بۆچی، چ، چی، چییە، لەبەرچی، چەند، چۆن، چلۆن ، کام ، کوا، کەی ، هەتاکەی ، کوێ ، کێ** ، ... لە هەندێک لە دێڕە شیعرەکاندا مۆرفێمی ( یان) ی بۆ ئامرازی پرس بەکارهێناوە ، یان بەڵگەی دەرەکی لەنێو زمانە گشتییەکەوە هێناوەتە ناو زمانی شیعری، یان لە ڕێگای سیستەمی فۆنۆلۆژیی تایبەت بە زمانە گشتییەکەوە، بەهۆی ئاوازی دەنگەوە (سترێس) هێزی خستووەتە سەر کۆتایی وشە و دەستەواژەکان بەمەبەستی دروستکردنی ڕستەی پرسی. بەگشتی ئەم شێوازی پرسە ئەوە دەگەیەنێت، کە خەسڵەتێکی دیکەیە (لەسیما هەرە دیارەکانی شێوازی شیعری گۆران و بەکارهێنانی ئامرازەکانی پرس بەڕێژەی ٣٢١ جار ، ). (پەخشان عەلی ئەحمەد :٢٠٠٩ ، ل ٢٥٣ ) تویژەری ناوبراو لەکتێبەکەیدا بەناوی شێوازی شیعری گۆران، خشتەیەکی ئاماری بۆ هەموو شیعرەکانی گۆران کردووە، هەرچی ئەم توێژینەوەیەی ئێمەیە تەرخان کراوە بۆ تەنیا ١٠٠ هۆنراوە، بەڵام سروود و ئۆپەرێت و شیعرە شانۆییەکان ناگرێتەوە.

خشتەی ٢ ئاماری وەڵام

| ژ | ناونیشانی شیعر | وشەی وەڵام | ئەو دێڕە شیعرەی وشەی وەڵام ، یان واتای وەڵامی تێدایە | ژ.لاپەڕە لە دیوانەکەدا |
|---|---|---|---|---|
| ١ | گوڵی خوێناوی | نایەم ،(٤ ) | نایەم ، گوڵ ماویەتی .... | ١٧ |
| ٢ | حوزنی پەچە | بەڵێ !(١) + هەتاکو | بەڵێ ! هەتاکو جەمالی .. | ٢٠ |
| ٣ | جوانی بێ ناو | لەدوا دێڕدا :هی..١ جار | هی ئەوەی نیگارێک لەیادم کێشراوە...بەڵام ئاخ بێ ناوە! | ٤٦ |
| ٤ | بۆ کچێکی بێگانە | چونکە١جار لەبەرئەوە جار، دێڕی دوای پرسەکەدایەو ٢- لەنیوەدێری دوایدایە | ١-چونکە کاتێ دێتەدی خۆزگەی دڵ، ٢- پێچەوانەی ئەوەدڵی تاریک بوو ؟(نیشانەی پ کە بۆ پێشترە). لەدێری : لەبەرئەوە، ئەی قژ زەردی بێگانە..... هەروەها لە دێری : بەڵام ئەوەی لێی ورووژاندم هەستم ، ئەو کتێبی شیعرەی هاتە دەستم ! | ٤٨ |
| ٥ | تاوێ نەگەڕا .. | وەڵامی : بۆ ڕەش بوو هەموو ئوفقی خەیاڵات و سەرابم ؟ | لەم نیوە دیڕەدایە(زیاتر سەبەبی عەقڵ و شوعوورە خەفەتی من ) | ٦٧ |
| ٦ | لەبەختی تار .. | وەڵامی: ٢ جار هەتا کەی .... | ١بەگۆران ناکرێ قەت تەرکی سەودا، ٢ کلا نابم لەسەر جادەی هیدایەت! | ٦٩ |

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ٧ | هەڵبەستی دەروون | وەڵامی: بۆچی وەها دوورن، لەیەک..؟ | نازانم! | ١٢١ |
| ٨ | جواب بۆ جەناب | لاکین ئاخۆ چ شاعیرێکی تر، | وەڵامەکە هەیەبەڵام دیسان گومانی تێدایەو دیسان پرسێکی دیکەی دروستکردووە! لەو سێ کەسە کامیانن؟ | ١٢٢ |
| ٩ | گەشت لە قەرەداغ | وەڵامی: چیت کرد؟ . | وەڵام دیارنییە بەڵام ناڕاستەو خۆ ئەنجامی کارەکەی( باڵدارت لەخۆت خرۆشان ) ە. | ١٥٠ |
| ١٠ | جەژنی نەورۆز | وەڵامی: کام قەومی کۆن ، کام جەژنی؟ | لەدێڕی ٣ : ئەو نەورۆزەی ...دیارە | ١٩٣ |
| ١١ | وەڵامی پرس | بەڵێ، | بەڵێ دکتۆر ! خوشکان ! ماتم...(تا کۆتایی شیعرەکە) | ٢٢٢ |
| ١٢ | گوڵاڵە برایمە..گری..گری؟ | وەڵامی: لەکێ؟<br>وەڵامی: بۆچی؟<br><br>وەڵامی: هەر کۆریای چی؟ | لە نەتەوەی کۆریا!<br>چونکە مەردە و وریایە!<br>(تاکۆتایی، نەک وەک کوردی نووستوو.)<br>هەر کۆریای چی؟ کۆریا داوە؟. (وەڵامەکە تا کۆتایی مەلی ئاشتی..) | ٢٤٠<br><br>٢٤٠ |

وەک وشە و ئارتیکەڵی وەڵام ئەوەی زۆر ڕوون و ئاشکرابێت لە وشە و ڕستە وەلامییەکاندا، ئەم وشە وەڵامییانە بەکارهێنراون : **بەڵێ ، نا ، نایەم، نازانم، ناکرێ ، چونکە، سەبەبی ، لەبەر ئەوەی ، هی ئەوەی، هەتاکو ،...** جگەلەوانە لەهەندێک لەدێڕە شیعرەکاندا ، بەتایبەت دوای ڕستە شیعرییەپرسییەکان، وشە و رستەی وەڵامی دەبینرێن .

بـەواتایـەکـی دیکـە زانیارییـەکـانی نێـو ئـەم خشـتەیـە ئـەو ڕاسـتییە ڕوونـدەکـەنـەوە، کـە بـەپێـی سروشـت و تایبـەتمـەنـدی و دەسـتور و سـتراکچەری زمـانی کـوردی ، چ لـەڕووی پرسـکردن و چ لـەڕووی وەڵامدانـەوەوە، شـاعیر پێڕەوی یاسـا و ڕێساکانی کردووە ولـەلایـەکی دیکەشـەوە گۆران لـە تـابلۆ شـیعرییەکانیدا خـودی خۆی دواندووە و دەکـەوێتـە دیـالۆگێکی بـەرامبـەرکـێ لـەنێـوان خـودی خـۆی و گـۆرانی شـاعیرەوە. عـەبدوڵا گـۆران دەپرسـێت و گـۆرانێکی دیکـەی لـەناخیـدا وەڵامێک دەداتەوە.

دەبێت ئەو ڕاستییە لەبـەرچاو بگیرێت، کە هـەمـوو پرسـیارێک، چ ڕاستەوخۆ لەژیانی ڕۆژانەدا و لەکەسێک. یان لە کۆمەڵێک بکرێت، مەرج نییـە لـەکـەسـی بـەرامبـەرەوە چـاوەڕوانـی وەڵامدانـەوە بکرێـت! ئـەوە لــەشــیعری شــاعیراندا هــەر تــەواوتــەواو ڕاســتە و لــەپرۆســەی کۆمۆنیکــەیشــنی ژیــانی ئاســایی دەچێتــەدەرەوە، شــاعیر لــەڕســتە شیعرییەکانیدا گەلێک پرس و پرسیار دەکات و لەئەنجامی بیرکردنەوەی خۆیـەوە کۆمـەڵێک بابـەت لـەڕێگای پرسـەکانییەوە دەورووژێنـێ، کـە هـەنـدێکیان خـودی شـاعیر خـۆی وەڵامـی دەداتـەوە و زۆریشـیان لای شاعیر بێ وەڵام دەبن و بەکراوەیی جێی دەهێڵێ بۆ خوێنـەر، هـەندێک پرسیشیان تێدایە چ لەلای شـاعیر و چ لـەلای خوێنـەر بـێ وەڵامـن . ئـەم جـۆرەیـان ئـەو پـرس و بابـەتانـەن ، کـە دەکـەونـە چوارچێوەی کایـە فەلسەفی و مـەعریفی و هزرییـەکانـەوە و زۆربـەیـان دەکـەونـە بـەر دوو ئەگەری ناڕوون و بێ ئەنجامەوە، وەک ئەو پرسانەی سەبارەت بەبوون و گـەردوون و ژیـان و مـردن و کۆتـایی دونیـا و ، ئـەو پرسـەی مـرۆڤ لەمناڵییەوە بەبیریدا دێت و تـامردن لای زۆرکـەس بـێ وەڵام دەمێنـنـەوە، وەک : ئایا لە گەردووندا کام شت سەرەتایە؟ و کامیان سەرچاوەیـە؟ و کامیان لەکامیانەوە پەیدا بووە؟ لە بەشی دووەمدا لەسەر ئەم بابەتانە توێژینەوە و ڕوونکردنەوەی زیاتریان لەسەر دەکرێت .

**بەشی دووهەم:**

**شێوازگەریی ئامار و شیکاریی دەروونی**

وەک لەبەشی یەکەمی ئەم توێژینەوەیەدا دەرکەوت ، پرسکردن و گەڕان بەدوای وەڵامی ڕستە پرسییەکانی گۆران لەنێو شیعرەکانیدا، ڕێژەیەکی زۆر و پانتاییەکی بەرفراوانیان داگیرکردووە، کەدەکرێت ئەم دیاردەیە، وەک تایبەتمەندی و خەسڵەتێکی شێوازی شیعرەکانی گۆران لەبەر چاو بگیرێت ، هەروەها لەسەر ئەو بنەما زانستییەی، کە شێوازگەری ئامار بەتەنیا، کەڵک وسوودێکی ئەوتۆی نابێت، ئەگەر هاوکات ڕێباز و میتۆدێکی دیکەی شێوازگەری، یان هەر میتۆد و ڕێبازێکی دیکەی ڕەخنەیی، لەشیکردنەوەی تێکستە ئەدەبییەکاندا، هاوکار و هەماهەنگی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە ئامارییەکە نەبێت. هەرلەبەر ئەو ڕێژە زۆرەیە ناکرێت لێرەدا یەک بەیەکی ئەو پرس و ڕستە پرسییانەتاوتوێ بکرێن و توێژینەوەی فراوان بۆ هەر یەکەیان تەرخان بکرێت، بۆیە بەوەرگرتنی چەند نموونەیەک مەبەستی توێژینەوەکە بەئامانج دەگەیەنین .

لەم بەشەدا توێژینەوە لەسەر چەند نموونەیەکی شیعریی گۆران دەکرێت، کەجێگای سەرنجن و زۆر لەبارن بۆ توێژینەوەی ئاماری و دەروونیش، کە ئامانجی سەرەکی توێژینەوەکەیە و گۆران بە چڕی ئەم دیاردەیەی وەک تایبەتمەندی و خەسڵەتێکی شێوازی کەسی خۆی و شیعرەکانی بەکارهێناوە.

لە دیوانەکەیدا شیعری (ئاواتی دووری ) یەکەم شیعرە کە ڕستەی شیعریی پرس و وەڵامی بەزۆری تێدابێت ، وەک لەخشتە ئامارییەکەدا دەرکەوت، ١٤چواردە ڕستەی پرسیی تێدایە، کە٧ حەوت جار ئامرازی پرسی (کوا) و ٥ پێنج جار (کوانێ )ی تێدا بەکار هاتووە و ٢ دوو جاریش دووپاتکردنەوە بۆ جەختکردن لە پرسەکە، بەتایبەتی لەبڕگەی یەکەم و سەرەتای شیعرەکەدا. هەڵبژاردنی ئەم شێوازە، پێوەندی بەباری دەروونی و ئەنجامی هەڵوێستەو هەڵچوونی گۆرانەوە هەیە،

بەرامبەر بەرووداوێک، کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەر ئاوات و خولیای پەنگخواردوو چەپێنراوی، چونکە لەشێوە و شێوازی-دەربڕینێکی کوتوپڕییەوە سەری هەڵنەداوە! بەڵکو پێش وەخت خۆی بۆ سازو ئامادە کردووە تاوەکو لە پڕۆسێسێکی نوێ و کاریگەردا (بۆچوونی خۆی لەسەر هەڵچوونەکە دەخاتەڕوو . ئەمەش هەندێک جار لەڕێگەی پرسیارە سەرسوڕهێنەکانەوە ئەنجام دەدرێت ، هەندێک جاریش لەڕێگەی دەربڕینە سۆزدارییەکانەوە. لەهەردوو حاڵەتەکەشدا پێدەنێتە قۆناغی خولقاندنی گوتاری دە ق و خاوەنەکەی) (زاهر لەتیف / نیان نەوشیروان ،٢٠١٨: ١٦ )، بەشێوەیەکی ڕوونتر دەتوانرێت بوترێت گۆران لەڕێگای دەربڕینی هەست و سۆزە خۆشەویستی و ئیرۆتیکیەکەیەوە، بەهۆی پرسە ناوازە و سەرسوڕهێنەرەکانییەوە تێکستێکی شیعری بەرزو ئەدەبێکی باڵای داهێناوە. هەربۆیە ئەوکارە گەورە و داهێنانەی بە تێکەڵکردنی چەند ڕێباز و شێوازێکی جیا جیای دەستووری شیعردانان بەئەنجام گەیاندووە و بەپێویستی زانیوە ڕەنگاڵەیەک لە بەکارهێنانی چەند کێشێکی شیعری جیاواز و کۆکردنەوەی چەند ڕیتم و ئاوازێکی جیاجیا لەشێواز و فۆرمێکی نوێدا بێنێتەکایەوە. بەم کارەشی بووەتە سەردەستەو داهێنەری شێوازێکی نوێی شیعری کوردی، کە خۆی واتە گۆران دامەزرێنەری ڕێچکە شیعرییە نوێکەی ئەدەبی کوردیی بووە (دلشاد عەلی ، ٢٠٠٧: ٤٧ )، کە مەبەست لەو ڕێچکەیەیە، کە گۆران لە ساڵانی ١٩٣٢ بەدواوە گرتییە بەر بۆ شێوازی شیعرەکانی.

**ئەی چاو! چەشنی بازی قەفەس هەڵوەریێ پەڕت،**
**کوا باڵە تیژەکانی نیگای حوسنی دلبەرت !**
**کوانێ دوو چاوی مەست ؟ کوانێ ؟**
**کوانێ برۆی پەیوەست؟ کوانێ ؟**
**کوانێ زوڵفی ڕەش ؟**
**کوڵمی ئاڵ و گەش ؟**

**کوا هەیکەلی جەمال ؟**

**کوا حوسنی بێ میسال ؟** (دیوانی گۆران :١٣ )

لە (هەڵبەستی دەروون) دا، کە بە **هەرچەند ئەکەم، ئەوخەیاڵەی پێی مەستم،** دەستپێدەکات ، گۆران دەکەوێتە نێوان گومان و تێرامانێک لەسەرمایە زمانییەکانی و لەپانتایی و فراوانی خەیاڵەکەی، کە پێی مەستە، دوولایەنییەکە لەنێوان بیر و زماندایە، بەواتایەکی دیکە بیر وەک خەیاڵ و ئەندێشە و زمانیش وەک توانای قسەکردن و دەربڕین کە مەبەستی شیعرە. شاعیر ڕاستگۆیانە هەست بەو جیاوازییە دەکات، بۆیە دەبێتە پرسێکی گرنگ و ئاڵۆز، چ وەک بابەت و کەیسێکی دەروونی خۆی و چ وەک دەستەوسانی و بێ دەستەڵاتییەکی زمان لەئاستی گەورەیی ئەو خەیاڵەی کە لەناخی دەروونیدایە، چونکە دەرهاویشتەدەروونییەکان سەرچاوەی ئامارە پرسییەکانن ! لە نیوە دێڕی دووەمی دێڕی دووەمدا، مەنەلۆگەکە لەگەڵ خودی خۆی دەکات و دەپرسێت، دواتر دەمودەست وەڵامێکی سەرسوڕهێنەر و کتوپڕی خۆی دەداتەوە و دەڵێ : **بۆچی وەها دوورن لەیەک ؟ نازانم !** بەڕوونی شێوەی دارشتنی ڕستە شیعرییە پرسییەکە دیارە و نیشانەی خاڵبەندی پرسی ؟ داناوە و لەکۆتاییشدا وەڵامی بەوشەیەکی سەرسوڕمان داوەتەوە، کە وشەی (نازانم ) ە .((لەم خستنەتەک یەکەدا ئاڵۆزییەکان کەمێ دەرەوێنەوە. شاعیر لەدێڕی یەکەمدا سوود لەنیشانەی (!) دەبینێ و دواتر پرسیار دەکات و لە بێ وەڵامیدا دیسانەوە سوود لە(! )وەردەگرێتەوە. ئەم نیشانانە لە پێکهاتنی جیهانە شیعرییەکەدا بەشدارن . بۆیە وشەکانی ئەم دوو دێڕە بەپێی ئەو سیستێمە بەمۆدێلکراوەی شیعرەکە بۆ دووانەی (ناوەوە)و (دەرەوە) دابەش دەبن :

ناوەوە: خەیاڵ + لێکدانەوەی دەروون.

دەرەوە: چوارچێوەی هەڵبەست+ قسەی زمان

لەنێو ئەم دووانەشدا مەست دەکەوێتە هەردوو دنیاکەوە و ڕۆڵی نێوەندگیری هەیە. ))(هەرێم عوسمان :٢٠١٨، ٢٦٥ – ٢٦٦ .). هەر وەک پێشتر

لـە ڕوانگـەی تایبـەتمـەندی و خـەسـڵەتێکـی شـیعری شـاعیرە لیریـک و میتافیزیک و ڕۆمانسیزمەکانەوە، بۆچوونەکەمان ڕوون کردەوە، بەوەی کە، گۆران زۆر بەقوڵی ((گومان و دوودڵی بەرانبەر بەزمان و دنیای دەرەوە نیشاندەدات، بەڵام دڵنیایە لەدنیایی ناوەوە، (بۆچی ) پرسینە لەناتوانایی خۆی و وزەی کەم بڕشتی کەرەسەکانی، واتە شاعیر پرس و گومانی لەزمان و شیعر هەیە، چونکە کەرەستەی تێگەیشتن و بەرجەستەکردنی دنیای ناوەوەن)) (سەرچاوەی پێشوو، هەر ئەو لاپەڕەیە) یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیکی گومان و پرسکردنە " هەر بەوشێوەیە، لەناونیشانی هۆنراوەکەوە **هەڵبەستی دەروون** ، تا دوا دێڕی کە بە:

**لە ناوەوە ئەجریوێنن، ئەخوێنن**

**هەرگیز قەڵەم بەکاغەزدا ناهێنن** (دیوانی گۆران: ١٢١ )

کۆتایی دێت . گۆران لەو لیریکەدا مەنەلۆگێکی خودی پێکهێناوە و گومانەکەی ڕوون دەکاتەوە بەپرسێک و وەڵامی پرسەکەشی بەنادیاری لەڕێگەی وشەی (نازانم) ەوە دەردەبڕێت و لەکۆتاییشدا دونیاکەی ناوەوەی بەوێنەی شیعری و چواندنی بیرەکانی بەباڵندەیەک بەڵام بێ پەڕو باڵ ، لەناو هێلانەی هزر و مێشکیدا دەخوێنن و دەجریوێنن و ڕۆمانسییانە هەواڵی ئەوەشمان پێدەدات ، کە ئەو شیعرە جوانانەی وەک ئەو باڵدارانە وان هەرگیز نابن بەشیعر و لەسەر کاغەز نانووسرێن .

تێکستی ( وەڵامی پرس ) ئەو پارچە شیعرەی گۆرانە، کە بەتەواوی ئەگەر نەوترێت هەموو، ئەوا زۆربەی زۆری لایەن و مەبەستەکانی ئەم توێژینەوەیەی تیادا بەدی دەکرێت ، گۆران ئەو پارچە شیعرەی وەک خۆی مێژووی ٢٥ /٥ / ١٩٦٢ ی بۆداناوە (چەند مانگێک لەپێش مردنیدا نووسیویەتی و دەربڕینێکی ڕاستگۆیانەی باری دەروونیی گۆرانە لە کاتێکدا، کە هەست دەکات نەخۆشی شێرپەنجە هەڕەشە لە ژیانی دەکات، گۆران حاڵەتی نەخۆشییەکەی خۆی و باری

دواکەوتوویی و ژێردەستەیی میللەت پێکەوە دەبەستێ و هاوشێوەییەک لەنێوان خۆی و گەلەکەیدا پێکدەهێنێت و هۆی ماتی و خەمبارییەکەشی دەگێڕێتەوە بۆ هۆکارە گشتییەکە، واتە بارى نالەبارى ژيانى کۆمەڵگەکەی و نا ئاسوودەیی کۆمەڵایەتی)( عەتا قەرەداخی ١٩٩٩ :٧٦ ).
پێکهاتەی تێکستەکە لەسەر بنەمای پرس و وەڵام چنراوە، هەرچەندە ئەشێت شاعیر بۆ بەهێزکردن و پێزی شیعرییەت، ناونیشانەکەی بە (وەڵامی پرس ) نووسیبێت و وشەی **وەڵامی** بەئەنقەست پێش وشەی پرس خستبێت ، لەلایەکی دیکەشەوە لەلای گۆران، وەڵامی پرسەکە ئامانج و مەبەستی و سەرکەوتنی شیعرەکە بووە و گرنگی و سەنگ و بایەخی گەیاندنی پەیامە شیعرییەکەی لە ڕستە وەڵامییەکانیدا تۆمارکردووە. ئەگینا وەک بابەتێکی زمانی و لە بواری مەنەلۆگدا و لەبەر ئەو هۆکارانەی پێشتر نەبوایە کە باسمان کرد، دەبوو پرس و وەڵامی بنووسیبا .

لەڕووی دەروونییەوە لە شیعری ( ئاخ هەزار ئاخ)دا ، ڕەشبینی گۆران دەردەکەوێت و((هۆکاری بەرزکردنەوەی ئەو جۆرە پرسیارانە (کوا نگین و بەختی من؟) (کوانێ تاج وتەختی من ؟) بۆخۆیان ئاماژەن بۆ دەرخستنی باری دەروونی شاعیر ، کە لەم ڕووەوە ڕەشبینە، چونکە بە هۆی بێبەشبوونی کورد لەتاج و دەسەڵات و سەربەستی و نادیاری ئایندەی و زەوتکردنی مافەکانی، تێڕوانینێکی وەهای لا دروست دەبێت، کە بێ ئومێد بێ و ڕەشبینانە لە کوردبوونی خۆی بڕوانێ.))(سامان عیزەدین سەعدون:٣٤١ ). ئەم دیاردەیە لە ڕستە پرسیارییەکانی ئەو تێکستەدا دەبینرێن.

**وەڵامی پرس**
**بەچاوی پڕ لەهەستی جوان**
**ئەیکرد تەماشای سروشتم ،**
**ئەیپرسی لێم : بۆچ وا ماتی ؟**
**بۆچ هەمیشەخەمبار دیاری ؟** (دیوانی گۆران : ٢٢١ )

١- لەم تێکستە شیعرییەدا، کەسی سێیەم دێتە ناوەوە، کە ئەویش دکتۆرە، ئی. ئی . ڤاسیلییێڤا ، یەکێک بووە لە پزیشکەکانی نەخۆشخانەی کرملین ، لە مۆسکۆ ، (دیوانی گۆران ل٢٢١ )، لەدوای چەند دێڕێکی لێوانلێو لە هەست و سۆزی ڕۆمانسی کەسێک، کە وەک کەسی پلە یەک و نزیک لەسۆز و بەزەیی و دڵنەرمی و میهرەبانیدا، وەک دایکی خۆی فرمێسکی بۆ گۆران دەڕشت و بەتەواوی وەک کچی خۆی دەستی ئەخستە ناو مشتی، ئەوەی لەو شیعرە لیریکییەدا دەردەکەوێت ، وێنەیەکی فۆتۆگرافیانەی دیاردە کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی و فکرییەکان و دابونەریتەکانی ناو کۆمەڵە گەورەکەی مرۆڤایەتییە و لەهەر شوێن و جێگەیەک بێت، ئەم بابەت و دیاردانە، بەتەنیا لەنێو کۆمەڵی کوردەواریدا ڕەنگی نەداوەتەوە، بەڵکو مەسەلەیەکی سەرتاسەری و دۆخێکی گشتگیریی جیهانییە کۆمەڵ و خێزانەکانی نێو کۆمەڵە پێشکەوتووەکانی ئەوروپاشی لەگەڵدابێت . هەربۆیە گۆران لەپرسەکانی دکتۆرەکەی زۆر بەچاکی تێدەگات ، کە لەگەڵ بەزەیی و میهرەبانییەکەیدا لایەنێکی دیکە هەیە، گۆران وەڵامی ئەو پرسە سەرەکییەش دەداتەوە، کە پەیوەستە بە کێشە و ئاریشەیەکی گەورەترەوە، لەدێڕەکانی دوایدا هۆکار و فاکتەری ماتییەکەی بۆ دکتۆر و هاوکارەکانیش ڕووندەکاتەوە، چونکە گۆران درکی بەفراوانیی واتای پرسکردنەکەی دکتۆر و دووسێ کچە هاوکارەکەی دکتۆریش کردووە. سەرنجێکی وردی داڕشتنی ڕستە پرسییەکەی گۆران بدەین ئەوە دەردەخات ، کە شاعیر شێوازی دووبارەکردنەوەی پرسەکەی لەیەک دێر شیعردا بەدوو دەربڕین و فۆرمی جیاواز داڕشتووە، ئەویش بۆ جەختکردنەوەی هۆکاری نەخۆشییە جەستەیی و بایۆلۆژییەکەیە و لەلایەکی دیکەشەوە، بۆ گرێدانی هۆکاری نەخۆشییەکەی بەلایەنی دەروونی و بارو دۆخی کۆمەڵ و نەتەوەکەیەوە، چونکە دەستەواژەی (بۆچ وا ماتی) شێوازێکی زمانی شیعرییە و پێوەندی بەباری دەروونی و بایۆلۆجی جەستەیشەوە هەیە و لەڕووی زمانەوە کورتکردنەوەی (بۆچی) ، لەگەڵ وشەی مات

بوون واتای لەسەرخۆو جۆرە ئارامییەکی ناسروشتی دەگەیەنێت ، کە لەزمانەوانیدا پێی دەوترێت (گریمانەی پێشینەی دەروونی ) (ئاڤێستا ٢٠٠٩ :١٠٢) ئاماژەیەکیشە بۆ ڕوودانی شتێکی خراپ. ((گریمانەی پێشینەی سایکۆلۆژی کردەیەکە بۆ بەکارهێنانی ڕستە، بەمەبەستی قسە لەسەر کردنی هەندێک زانیاری و کە گومانیان لێدەکرێت بەشکراوبن لەنێوان قسەکەر وگوێگردا)).(سەرچاوەی پێشوو: هەر ئەو لاپەڕەیە). لەو مەنەلۆگ و پرس و وەڵامەدا، جۆری کردە قسەییەکان وەک سیستەمی زمانی کوردی کردەی پرسە و لە بنیادی ڕستە شیعرییەکەدا دەبینرێت، بەڵام لەڕووی واتای پراگماتیکییەوە تەنیا مەبەست لەماتییە بایۆلۆجییەکەی ڕەنگ و ڕوخساری گۆران نییە! هەروەها ئەو ڕواڵەتە خەمبارییەی، کە پرسیارکەرەکە دەیبینێ و هەستی پێدەکات ، هۆکاری نەخۆشییەکە نییە! بەڵکو لە وەڵامی پرسەکەدا ئەوە دەردەکەوێت هۆکاری ماتی وخەمبارییەکە بەند و گرێدراوە بە ڕووداوەکانی پێش نەخۆشییەکەوە و تەنانەت لەدەروونی گۆراندا خەمی ئایندەی خۆی و کۆمەڵێ ڕووداوی دیکەش هەیە، کە لەدواییدا ڕوودەدەن !، جگە لەوەش ماتییەکەی شاعیر بەتەنیا خوێندنەوە و بەراورد و هەڵسەنگاندنی نێوان دووکەسی ئامادە: پرسکەر و وەڵامدەرەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بەچەند کەسێکی دیکەشەوە هەیە، کە هاوکاری دوکتۆرەکەن و ئەوانیش وەک دکتۆر خەمخۆر و دڵسۆزن بەرامبەر بە گۆرانی نەخۆشی بەردەستیان. خەمە گەورەکەی گۆران ئەو بەراوردەیە لەنێوان ئەو هەڵسوکەوت و دڵسۆزی و ئەرکە پزیشکی و مرۆڤ دۆستانەیەی ئەواندا ، وەک کەس و وەک نەتەوەش ، کە دکتۆر و هاوکارانی سەر بەگەل و نەتەوەیەکی خاوەن مێژوویی شارستانی و دەسەڵاتدارن، لەگەڵ ئەوەشدا بەسۆز و بەخشندە و میهرەبانن ، بەرامبەر گۆرانی سەر بەگەل و نەتەوەیەکی دواکەوتووی بێ قەوارە و دەسەڵات . هەر بۆیە لەزانستی زماندا و لە بواری سینتاکسدا بەتەنیا پشت بەفۆرمی دروستەی ڕستە نابەسترێت، (کەواتە بۆ جیاکردنەوەی جۆرەکانی ڕستە ناتوانین پشت بەڕوخساری

ڕستە ببەستین ، بەڵکو دەبێ بارودۆخی قسەکەر و گوێگر لێک بدرێتەوە، بەواتایەکی تر دەبێ کەڵک لەهۆ پراگماتیکییەکان وەربگرین بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی جۆرەکانی ڕستە)( ابوبکر عومەر قادر ١٩٩٣: ١٣) ئەوە بارودۆخە دەروونییەکەی گۆرانە لەوەڵامەکەیدا هەلومەرجێک دەرەخسێنێت ، کە وەڵامەکەی بەجۆرێک بێت، پرسکەر ، واتە دکتۆر دڵگران و بێزار نەبێت ، بەڵکو گوێ بۆ وەڵامی پرسەکەی دەگرێت و کۆمەڵێک زانیاریی لەبارەی کۆمەڵایەتی و مێژوو و سیاسەت و ....هتد لە وەڵامەکەی گۆراندا دەست دەکەوێت . لەلایەکی دیکەشەوە لەپرسەکەی دکتۆردا ،( جۆرێک لە بەخشکەیی دەربڕین یان پرسی پەنامەکی تێدا دەبینرێت) ( د. ئاڤێستا ،٢٠٠٩: ٦٩ -٧٠) ، کە پزیشکەکە دەپرسێت ، بۆچ وا ماتی ؟ کورتترین دەربڕینی بەکەمترین وشە بەکارهێناوە، ئەم شێوازە پێوەست بووە بە لایەنی دەروونییەوە، دکتۆرەکە لەدەربڕینی پرسەکەی لایداوە، چونکە پرسیارەکە پێوەست نەبووە بەلایەنی بایۆلۆجی و نەخۆشییەکەوە، بۆیە وەڵامەکەی گۆرانیش پێویستی بەلێدوان و ڕوونکردنەوەو زانیاری بەخشینی زیاتر هەیە، بۆیە لەکۆتایی شیعرەکەیدا بە کۆپلەیەکی شەش دێڕی وەڵامی هەموو پرسەکانی دکتۆر لە زارو زمانی خۆیەوە دەداتەوە و باسی ماتیی گشت نەتەوەکەی دەکات و ئەو هەواڵەش ڕادەگەیەنێت ، کە لای ئێمەی نەتەوەی گۆران، وا تازە خەڵکەکەی بۆ خۆشی و شادی هەنگاو دەنێن .

گۆران لە شیعری بۆ گوڵی لاولاو دا ، کە وەک لە پەراوێزی ئەو شیعرەدا ، لە دیوانەکەیدا نووسراوە: (بنەڕەتی بیری ئەم هەڵبەستە لە شیعری ئینگلیزی وەرگیراوە) (دیوانی گۆران ، ل٢٢٣ .) من گومانم لەڕاستیی ئەم زانیارییە هەیە! چونکە دەستخەتێکی تەواوی شاعیرمان لەبەردەستدا نییە! ئەگەر ئەو تەنیا ڕستەیە لە نووسینی خودی گۆران خۆی بێت ، دەبێت بپرسین ئایا بۆ ناوی شاعیرەکەی نەنووسیوە؟، یان ئاخۆ بەدەسخەتی شاعیر خۆی ئەو ڕستە کورت و کەم زانیارییە نووسراوە؟ و گەلێک پرسی دیکە دێنە ئاراوە .

گۆران بەکوڵ بۆ تەمەنی کورتی گوڵە لاولاو و بۆخۆیشی دەگری و هۆکاری گریانەکەی تەنیا سۆز و هەستێکی ڕۆمانسی نییە! بەڵکو لەئەنجامی بیرکردنەوە و نەزانینی وەڵامی سێ پرسی لۆژیکییەوەبووە کە لە دەروونیدا پەنگی خواردۆتەوە، یەکەم : لەبەر چی وا زوو سیس دەبیت ؟ دووەم هۆکاری سیس بوون و ژاکانەکەت چییە؟ سێهەم بۆچی وا بەبێ دەنگی و بەپەلە سیس دەبیت و دەژاکێیت ؟ لەگەڵ پرسیاری سێهەمدا دەستەودامانی گوڵی لاولاو دەبێت و تکای لێدەکات بەسەبرو لەسەرخۆبێت . گۆران لەو سات و کاتەی ئەو شیعرەی تێدا وتووە لەباروودۆخێکی تەندروستی و دەروونی ناخۆشی وەک چلەی زستاندا بووە (لەدۆخێکی سایکۆلۆژی قورس وخراپدا گوزەر دەکات . بیرکردنەوەکانی بەرامبەر بەژیان بەگشتی و کورتی ژیان بەتایبەتی ، زۆر بەقووڵی و تیژی دامەزراون . لێرەدا زەمەنی ژیانی مرۆڤ و خۆی بەراورد دەکات لەگەڵ کورتی ژیان و زەمەنی **نێرگزەکان** کە بەجوانی لە دایک دەبن، بەڵام هەر زوو جوانییەکان دەژاکێن دواتر لەچاو ون دەبن ) ( زاهر لەتیف / نیان نەوشیروان ،٢٠١٨: ٧٢.)، لەم دەقەدا دەبوو بەڕێزان نووسەرانی ئەم سەرچاوەیە، گوڵی لاولاویان بنووسیبا، لەبرێتی گوڵی نێرگز ، چونکە لە شیعرەکەی گۆراندا ناونیشان و باسەکەش باسی گوڵی لاولاوە، نەک **گوڵە نێرگزەکان**، وەک لە شیعرەکەی ڕۆبرت هیریک ( ١٥٩١_ ١٦٧٤) و لەو سەرچاوەیەدا هاتووە. گۆران لەگەڵ دواپرسیدا ، تکا لە تەمەنی کۆتایی ژیانی خۆی دەکات کە کەمێک مۆڵەتی بدات و خۆڕاگربێت تا زستانی بیماری و سەختی ژیانی بەسەردەچێت و بەهاری بۆ دێتەوە. هەرچەندە لەپرس و وەڵامە خودییەکانی گۆران لەم شیعرە هونەرییە بەرزەدا ، بەڕوونی و ڕاستەوخۆ وەڵامی ئەو سێ پرسیارەی نەداوەتەوە، بەڵام بە دەربڕینێکی هونەری چڕو ڕاڤەکردنێکی خودی گۆرانی مرۆڤ و هاوتاکردن و هاوڕێیەتی لەسەفەری سیس بوون و لەناووچوندا لەگەڵ گوڵە لاولاو لەلایەک و هەموو پرۆسەی ژیان بەسروشتیشەوە گرێدەدات و خۆی

قایل دەکات و ڕازییە بە مردن و لەڕێگای چواندنێکی ڕەوانبێژیی هونەرییەوە لە بەشی کۆتایی شیعرەکەدا دەڵێت منیش وەک تۆ و وەک هەموو بوون و دیاردەکانی سروشت و هەموو دونیا دەبێت، مردن و نەمان لەناو چوون کۆتاییمان بێت.

**منیش، وەک تۆ، بەقام کورتە و بەهارم تیژ و کەم فرصەت ،**

**گەشەم مەیلەو زەوالە چەشنی تۆ ، چەشنی هەموو دنیا ،**

**وەکو بارانی هاوین زوو – فەنایە عومری بێ مروەت ؛**

**تەبەخخور مایەیە، هەیهات ، بەچەشنی شەونمی سەر گیا !...**

**(دیوانی گۆران،١٩٨٠ :٢٢٣ )**

لە شیعری گیان دا ١٣ سیازدە ڕستەی پرسی تێدایە و وەڵامی هەموویان بەنادیاری و نەزانراوی بەجێ دەهێڵێت، کە بەم دێڕە دەست پێدەکات:

**نازانم تۆ چیت ئەی گیان ؟**

**یاری نازداری ژیان ،**

یەکەم ڕستە شیعری بە پرسێکی نادیار دەست پیدەکات ، ئەویش سەبارەت بە(گیان)ە ڕۆح ، کەلای گۆران بەتەواوی و ڕوونی وەڵامی نییە و خۆی یەکلایی نەکردووەتەوە. ئەم دەقە بەو هەموو پرسکردنەوە لە گیان، نیشانەی گومان و ناجێگیری باری دەروونی و بیروباوەڕی شاعیرە بەرامبە ر بە مەسەلەی ڕۆح ، کە بەلای ئایدیۆلۆژیست و فەیلەسوف و شاعیرانەوە و تەنانەت لە کتێبە پیرۆزە ئاینییەکانیشدا باسی لێوەکراوە. هەر بۆیە گۆران لەم دەقەدا لە ڕۆحی خۆی دەپرسێت و دەڵێت من نازانم تۆ چیت؟ بەڵام بە ناراستەوخۆ و بێ بوونی بەڵگەیەک، وەک پەسنکردن و وەسفێکی ڕۆمانسیی گیان ، دەزانێت گیان یار و خۆشەویستێکی نازداری ژیانە و دواتر زیاتر بە گیاندا هەڵدەدا و دەڵێت: تۆ ئەی گیان هێزی لەش جووڵاندنی منی و هۆی گەرم و سارد چەشتنی منی، تینی دڵ و بزوێنی بیرو هۆشمی، لەکاتی بوونمەوە تامردن هاوڕێی هەمیشەییمیت ، دیسان زیاتر جەخت لە کەمی و

ناتەواوی زانیارییەکانی دەکاتەوە و لای ڕوون نەبووەتەوە، کە ئایا ڕۆح چییە؟ و خودی گۆران چییە؟ هەروەها پرس لەگیان دەکات ئایا (ئەو) هەموو کەسێتی و جەستەی گۆرانە، یان گۆران و جەستەشی بریتییە لە ڕۆح؟ پرسەکانی گۆران هەروەک ( هەموو پرسەکانی کۆنی مرۆڤایەتی و سەردەمەکانی کۆنن ، هەندێ جار لەشێوەی جێناوی (من) و (تۆ)دا و، هەندێ جاریش بەشێوازی دووالیزمی جەستە و ڕۆح، ژیان و مردن، بوون نەبوون (الوجود والعدم). لەدێڕی شەشەمدا گۆران بەشێوەیەکی هونەرییانە و شاعیرانە بەناڕاستەوخۆ هەر ئەو پرسیارە دەورووژێنێت ، کە لەکۆنەوە هەردوو فەلسەفەی مەتریالیزم و ئایدیالیزم و ورووژاندوویانە، کە ئەویش ئەوەیە، ئایا زەوی یەکەمە؟ یاخود ئاسمان؟ واتە مادە پێش ڕۆحە، یاخود ڕۆح پێش مادەیە.) (على طاهر حسين ،٢٠١٨: ل ٣٦ .)، لەلایەکی دیکەشەوە کەسی سێیەم دێنێتە ناوەوە، کە ئەویش (ژیانە) و نازانێت ڕۆح یەکسانە بەژیان، یان ژیان یەکسانە بەڕۆح؟ و کامیان داینەمۆو بزوێنەری کامیانن، یان هەردووکیان یەک شتن، دیسان سەربارى نەزانینەکەی سەرسامی و ڕامانی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بەگیان و ئەمجارە بە (تەلیسمی ژیان ) وەسفی دەکات ، بەڵام گومانی لەوە نییە و لای ڕوونە، کە لەکۆتاییدا ڕۆح و جەستەی لێکدادەبڕێن و سەرئەنجامیان جودا بوونەوەیە، بەڵام لە سات و کاتی ئەو دابڕانەش بێخەبەرە و نازانێت تا کەی ژیان لە تەکیدا دەبێت و بە چ شێوەیەک و چۆن ئەو جودابییە دروست دەبێت . بۆیە جەخت لەوە دەکات کە ڕۆح بەرزەفڕ و ون دەبێت و لەشیش دەمرێت و لەژیان دەکەوێت .

سەرئەنجامی ئەو دابڕانەش: یەکەم لەداهاتووی لەش و جەستەی خۆی زانیاری و بۆچوونێکی یەقینی هەیە، کە مردنە و تا ماوەیەک لە گۆڕدا وەک سیمبۆل و یادگارێک جەستە دەمێنێتەوە، بەڵام دووەم هیچ زانیارییەکی لەبارەی ڕۆحەوە نییە، کە لەدوای دەرچوون و جودا بوونەوەی لە جەستە، چی بەسەردێت و بۆکوێ دەچێت ؟ هیچ بەڵگە و ناونیشانێکی لە بوون و نەبوونی ڕۆح لەدوای مردن، لەلای دیار نییە!.

**ئەنجام :**

لە توێژینەوەکەدا، چەند ئەنجامێک بەدیهاتوون، گرنگەکانیان لەم خاڵانەدا کورتکراونەتەوە :

١- بەپێی ئەو خشتە ئامارییەی لە توێژینەوەکەدا ئامادەکراوە، لە کۆی ١٠٠ شیعری ( غەزەل و قەصیدە) دا ، ٦٣ شیعریان ڕستەی پرسی تێدایە و تەنیا لە ٣٧ دانەیاندا پرسی تێدا نییە! و کۆی ڕستە پرسییەکانیش ٢٦٧ ڕستەی شیعرین.

٢- بەکارهێنانی ئامرازەکانی پرسە بەڕێژەی ٣٢١ جار بەکارهاتووە، زۆربەی زۆری ئامرازەکانی بەکارهێناوە، وەک **ئاخۆ ، ئەی ، بۆ، بۆچی ، چ ، چی ، چییە، لەبەرچی ، چەند ، چۆن ، چلۆن ، کام ، کوا، کەی ، هەتاکەی ، کوێ ، کێ** ، ... ئەمە ئەوە دەگەیەنێت ، ئەم خەسڵەتەیەکێکی دیکەیە لە سیما هەرە دیارەکانی شێوازی شیعری گۆران.

٣- هەندێک وەڵام لە شیعرەکاندا بەدی دەکرێن و ئەم وشە وەڵامییانە بەکارهێنراون : **بەڵێ ، نا ، نایەم، نازانم، ناکرێ ، چونکە، سەبەبی ، لەبەر ئەوەی ، هی ئەوەی، هەتاکو.** زۆربەیان گرێدراو و پێوەست بوون بە باری دەروونی شاعیرەوە.

٤- گۆران زۆر لەپرسەکانی بەبێ وەڵام هێشتووەتەوە و هەندێکیشی لەبارێکی دەروونی نا جێگیر و گوماندا، یان بە نازانم ، یان بە هەڵواسراوی وازلێهێناوە.

٥- سروشت و ژیان و مردن و هۆکارەکانی ( بوون و نەمان) و مردنی وەک پرسێکی فکری و مەعریفی تاوتوێ کردووە و بۆ هەندێکیان وەڵامی دروست و بۆ مردن و دوای مردنش لەگوماندا بووە و لەسەر مەسەلەی گیان و ڕۆح و پێوەندی بەژیانەوە بەتەواوی بێ ئاگایی خۆی دەربڕیوە.

٦- گۆران لەڕێگای شێوازی پرس و وەڵامەوە بەقووڵی چووەتە ناو بابەتە فەلسەفییەکانەوە و تێڕامانە جیهانبینییەکانی، و بەرهەمی باکگراوندی ڕۆشنبیری و ئاستی بیرکردنەوەی بووە.

**سەرچاوەکان:**

١- ئاڤێستا کەمال مەحمود (د) پراگماتیکی ڕستەی پرسیار و فەرمان لە زمانی کوردیدا ، مەڵبەندی کوردۆلۆجی ، چاپخانەی ڕەنج ، سلێمانی، ٢٠٠٩ .
٢- ئەبو بکر عمر قادر ، پرسیار لە زمانی کوردیدا ، نامەی ماستەر بڵاونەکراوە، زانکۆی سەلاحەدین ، ١٩٩٣ .
٣- پەخشان عەلی ئەحمەد ، شێوازی شیعری گۆران ، مەڵبەندی کوردۆلۆجی ، چاپخانەی رەنج ، سلێمانی ، ٢٠٠٩ .
٤ زاهر لەتیف کەریم (پ. د. )/ نیان نەوشیروان فؤاد مەستی،( پ. د.) دیدە بونیاد گەراییەکان-گۆران بەنموونە چاپخانەی کارۆ، سلێمانی ،٢٠١٨ .
٥ سامان عیزەدین سەعدون، دەقە شیعرییەکانی گۆران لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە، ناوەندی غەزەلنووس، سلێمانی ، چاپخانەی تاران ، ٢٠١٥
٦ عەتا قەرەداخی ، گۆران و گەڕان بەدوای یەقیندا ، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ، چاپخانەی بابان، سلێمانی ١٩٩٩ .
٧ محەمەدی مەلا کەریم ، دیوانی گۆران ،سەرجەمی بەرهەمی گۆران ، بەرگی یەکەم ،١٩٨٠ چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق ، بەغدا.
٨ هەرێم عوسمان ، لیریکی گۆران لە ڕوانگەی بونیادگەریی کراوە و تەواوکارانەوە، چاپخانەی حەمدی ،سلێمانی ، ٢٠١٨ .

**گۆڤار:**

٩ دڵشاد عەلی ،(پ.ی.د.) گۆران و داهێنان ، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی ، بەشی(B زانستە مرۆڤایەتییەکان ) ژمارە ٢٠ حوزەیرانی٢٠٠٧ .
١٠ علی طاهر حسین، (پ.ی.د.) پرسیاری ڕۆح لە شیعری نوێی کوردیدا، بەنموونەی (گۆران، عەباس سالح) گۆڤاری زانکۆی سلێمانی ، بەشی (B زانستە مرۆڤایەتییەکان ) ژمارە ٥٨ تشرینی یەکەمی ٢٠١٨ .

**ملخص البحث**

**حوار الذات، اسئلة واجوبة في شعر (گۆران)**

اسلوب المنلوج الذاتي، السؤال والجواب في شعر گوران دراسة أسلوبية احصائية للاشعار الغنائية للشاعر عبدالله گوران. يتكون البحث من فصلين، في الفصل الاول قام الباحث بتنظيم جدول احصائي للجمل الشعرية الاستفهامية والجوابية لمعظم الاشعار الغنائية للشاعر، حيث تبين أن ٦٣ نصا من المجموع الكلي ل(١٠٠) نص شعري هو من النوع الذي نسميه بالحوار النفسي أو الذاتي. أما في الفصل الثاني فقد استخدم الباحث منهج التحليل النفسي لبعض النصوص الشعرية للشاعر ، ومن خلال التحليل لبعض من ألابيات تطرق الباحث الى الجوانب النفسية التى أدت الى توجه الشاعر الى استخدام الاسلوب الحواري في نظم اشعاره. ثم اوجزنا النتائج في عدة نقاط وقد أختتم البحث بترجمة ملخص البحث تضمن البحث باللغتين العربية و الانكليزية.

## Research Summary
### Self-Argument: Interragations and anderse in Goran's Poetry

This research is characterized by (monologue, the question and answers in the poetry of Goran). It is a methodological study of the lyrical message of the poet Abdullah Goran. The research consists of two chapters. In the first chapter, the researcher organizes a statistical table for the poetry and question and the answer in most of the poems. It shows that 63 texts of the total number of 100 poetry texts are of the kind that we call monologue. In the second chapter, the researcher uses the method of psychological analysis of some poems. The researcher touches on the psychological aspects that led to the poet's tendency to use the monologue method in his poems. Then the researcher summarized the results in several points and concluded the research by translating the summary of the research, which included the search in Arabic and English.

# سیماکانی دەربڕینگەرایی
# لە شیعری سەباح ڕەنجدەردا

م.ی.ئاری عوسمان ڕۆستەم
بەشی زمانی کوردی
کۆلێجی پەروەردەی بنەڕەت/ زانکۆی گەرمیان

**پێشەکی**

**ناونیشـانی توێژینەوەکـە:** ناونیشـانی ئـەم توێژینەوەیـە بریتییـە لـە (سـیماکانی دەربڕینگـەرایی لـە شـیعری سـەباح ڕەنجـدەردا) تێیـدا هەوڵـدراوە بەشـێوەی تیـۆریکی و پراکتیکـی شـوێنپێکانی ڕێبـازی دەربڕینگەرایی (Expressionism) لە ئەزموونی شیعری شاعیری ناوبراودا هەڵبگیردرێت.

**هـۆی هـەڵبژاردنی ناونیشـانەکە:** هـۆی سـەرەکیی هـەڵبژاردنی ئـەم ناونیشـانە، دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی تـا ئێسـتا لـە لێکۆڵینـەوەی ڕەخنـەی ئەدەبی کوردیدا وەک پێویست لا نەکراوەتەوە لە (دەربڕینگەرایی) وەک یەکێک لـە ڕێبـازە ئـەدەبی و هونەرییـەکان و هاوکـات شـیعری شـاعیری نـاوبراویش کێڵگەیـەکی بـە پیتـە سـەبارەت بـە پراکتیـزەی سـیما و بنەماکانی دەربڕینگەرایی.

**گرنگـی و ئامـانجی ناونیشـانەکە:** گرنگیی توێژینەوەکە خۆی لەو ئامانجەدا دەبینێتەوە، کە لەپێناویدا دەستی دراوەتێ، ئەویش بریتییە لە دەستنیشانی ئەو سیما و ڕەهەندانەی دەربڕینگەرایی کە لە ئەزموونی شیعریی سـەباح ڕەنجدەردا بەرکەڵک خراون، ئەمـەش دەبێتـە یەکەمین هەوڵی زانستییانەی لەم شێوەی خۆی، کە لەبارەی ڕێبازەکە و شیعری شاعیری ناوبراو بە ئەنجام گەیەندرابێت.

**سنووری توێژینەوەکە:** لەپێناو دەستەبەری چوارچێوەیەکی زانستییانە بۆ توێژینەوەکە، ئەوا سنووری کاری ناونیشانەکە پێکهاتووە لە پراکتیزەی دەربڕینگەرایی وەک ڕێبازێکی ئەدەبی لەمیانی کۆبەرهەمی شاعیر (سەباح ڕەنجدەر)دا.

**کێشەی توێژینەوەکە:** کێشەی ئەم توێژینەوەیە خۆی دەبینێتەوە لە خستنەڕووی پرسیارێکی جەوهەریدا، ئەویش: تا چ ڕادەیەک سیما و ڕەهەندە شیعرییەکانی دەربڕینگەرایی لە ئەزموونی شیعریی سەباح ڕەنجدەردا ڕەنگیان داوەتەوە؟ هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەش بۆخۆی دەبێت بە ئامانجی سەرەکیی توێژینەوەکە و هاوکات چارەسەری کێشەی توێژینەوەکەش لەخۆدەگرێت.

**ڕێبازی توێژینەوەکە:** لەپێناو ئەوەی بە شێوەیەکی سیستماتیک توێژینەوەکە بگەیەنین بە ئەنجامی خۆی، پێڕەویمان لە ڕێبازی (ڕەخنەیی شیکاری) و وەرگرتنی نموونەی دەق کردووە.

**پێکهاتەی توێژینەوەکە:** بەشێوەیەکی گشتی توێژینەوەکە پێکهاتووە لە پێشەکی و دوو بەشی سەرەکی، کە هەر بەشێک لە چەند تەوەر و لاتەوەرێک پێکهاتووە، ئەویش بەم شێوەی لای خوارەوە:

بەشی یەکەم تایبەتە بە لایەنی تیۆریکیی توێژینەوەکە، کە دوو تەوەر لەخۆدەگرێت. لە تەوەری یەکەمدا کورتەیەک لە مێژووی ڕێبازی دەربڕینگەرایی خراوەتەڕوو و لە تەوەری دووەمیشدا باس لە چەمک و پێناسەی ڕێبازەکە کراوە. بەشی دووەم تایبەتە بە لایەنی پراکتیکیی توێژینەوەکە و تێیدا لەڕێگەی دوو تەوەرەوە گرنگترین بنەماکانی دەربڕینگەراییمان لە چوارچێوەی شیعرییەتی دەقدا لە نموونەی شیعرەکانی سەباح ڕەنجدەردا بەرجەستە کردووە. لە کۆتایی توێژینەوەکەیشدا وێڕای خستنەڕووی گرنگترین ئەنجامەکان، هاوکات لیستی سەرچاوە بەکارهاتووەکان لەگەڵ پوختەی توێژینەوەکە بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خراونەتەڕوو.

## بەشی یەکەم
## تیۆریزەی چەمکەکانی باسەکە

**تەوەری یەکەم/ کورتەی مێژووی دەربڕینگەرایی:**

کاتێک لە بەرانبەر وشەیەکی وەک دەربڕینگەرایی (Expressionism) ڕادەمێنین، یەکسەر بیرمان بە لای وشەگەلی وەک (دەربڕین) و (گوزارشت) و هاوشێوەکانیدا دەچێت، بەم پێیەش بێت سەرەتای سەرهەڵدانی دەربڕینگەرایی بۆ مێژوویەکی زۆر دوور دەگەڕێتەوە، چونکە لەوەتەی مرۆڤ خۆی ناسیوە، لە هەوڵی ئەوەدا بووە هەستەکانی خۆی دەرببڕێت و گوزارشت لە بارودۆخ و دەوروبەری خۆی بکات، بەم جۆرە تێڕوانینە دەربڕینگەرایی وەک ((بزاوتێکی هونەری ڕەگی لەنێو قووڵایی مێژوودایە، هەر لە وێنەی سەر دیواری ئەشکەوتەکانی چاخی بەردینەوە بگرە تا بە فۆرمە جیاوازەکانی دەربڕینی هاوچەرخ دەگات.))**(بیزیو، ٢٠١٠، لینک)** لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت بزانین، ((جیاوازیی سەرەکی لەنێوان دەربڕین لە ژیانی ڕۆژانە و دەربڕینێکی هونەری لەوەدایە، کە لە یەکەمیاندا دەربڕین، ئەرک و پرۆسەیەکی کاتیی جێبەجێ دەکات، بەڵام لە حاڵەتی دووەمدا پشت بە ئەزموونێکی هونەری و ئیستاتیکیی بەردەوام دەبەستێت.)) **(راغب، ١٩٧٧، ١٣٧)**

لێرەوە وشەکە (ئێکسپریسۆنیزم - دەربڕینگەرایی) وەک زاراوەیەکی ئەدەبی و هونەری ((لەگەڵ مێژووی سەرهەڵدانی ڕێبازەکە وەک پێویست و بەو چەشنەی ئێمە لەم ڕۆژگارەدا دەمانەوێت، یەک ناگرێتەوە.)) **(ویلیک، ١٩٨٧، ٢١٨)** بۆیە پەیدابوون و سەرهەڵدانی دەربڕینگەرایی وەکو ڕێبازێکی ئەدەبیی دانپێدانراو، بۆ سەردەمێکی نزیکتر دەگەڕێتەوە، لەوەی کە باسی لێدەکرێت، ئەمەش بەوپێیەی پەیدابوون و سەرهەڵدانی هەر ڕێبازێکی ئەدەبی لە پەیوەندیدایە بە ڕێبازەکانی پێش خۆی و پاش خۆی، ئەم پەیوەندییەش لەنێوان ((ڕێبازەکانی پێشین و پاشین یەکجار ورد و زانستییە و بە شێوەی کار

و كاردانەوە یان زێدەڕۆیی و یەكسانی كار لە یەكتر دەكەن.))(**شمیسا، ٢٠١٨، ٢٩**)

كەواتە دەربڕینگەرایی وەک هەر ڕێبازێكی تری ئەدەبی، لەپڕ و لەناكاو دانەهاتووە و یەكسەر ڕێبازەكەی پێش خۆی نەسڕیوەتەوە، بەڵكو پێبەپێ پێكهاتووە و خۆی لەگەڵ شوێنپێی ڕێبازەكانی پێشیندا گونجاندووە تا ئەوەی بە یەكجاری خەملێوە و بوونی خۆی سەلماندووە، دواجاریش بەتەواوەتی جێی گرتووە.(**الاصفر، ١٩٩٩، ٧**) لەم ڕوانگەوە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاكانی مێژووی سەرهەڵدانی دەربڕینگەرایی، دەبینین دابڕاو نییە لەو دۆخە كۆمەڵایەتییەی ((سەرەتاكانی سەدەی بیستەم و بەتایبەتیش سالانی بیست تا پەنجاكانی ئەو سەدەیە لە ئەوروپا بەشێوەیەكی گشتی...))(**عابدین، ٢٠١٩، لینک**) كە ئەم ڕێبازە تێیدا چەكەرەی كردووە، ئەمەش پەیوەستە بەوەی یەكێک لە تایبەتمەندییەكانی مێژووی هەر ڕێبازێكی ئەدەبی و هونەری بریتییە لەوەی ((بەشێكی گرنگی ئەو گۆڕانكارییانەن، كە دەبنە دەربڕی ئیستاتیكای ئەو واقیعە، قسەكردنە لەسەر هەموو داهێنانێكی هونەری و ئەدەبی، یان هەموو تەرزێكی كەلتووری و شارستانییەتی میللەت، پرەنسیپێكی گشتیی گەشەسەندنی جۆرەكانی ئەدەبە لە ڕووی مێژوو و گۆڕین و دروستبوونەوە، هەموو قۆناغێكی كۆمەڵیش بەرجەستەی دنیای جۆرەكانی ئەدەب دەكات.))(**حەمەئەمین، ٢٠١١، ٥**) بەومانایەی دەربڕینگەرایی لەڕووی حەقیقەتی مێژووییەوە لەدایكبووی كۆمەڵێک حاڵەتی دەروونیی گشتییە و ڕووداوەكانی ناو مێژوویان لە پشتەوە پەنهانە، كە لە دواتردا بنەما و یاساگەلی تایبەتییان بۆ دارێژراوە و وەک چوارچێوەی گشتی بۆ ڕێبازەكە دەستنیشان كراوە. (**عیاد، ١٩٩٣، ١٣٥**)

لە زۆربەی سەرچاوەكاندا سەرهەڵدانی دەربڕینگەرایی دەگەڕێننەوە بۆ كۆتاییەكانی سەدەی نۆزدە و سەرەتاكانی سەدەی بیستەم و بەتایبەتیتریش بۆ سالانی نێوان (١٩١٠- ١٩٢٥) (راغب، ١٩٧٧،

١٢٨- ١٣٨. **هـەروەها: أحمـد، ٢٠١٣، لینـک**)، بـەڵام سـەبارەت بـە شـوێنی سەرهەڵدانی ئەم ڕێبازە بۆچوونی جیاواز لە ئارادایە، بەوەی هەندێک لە تـوێژەران دەیگەڕێننـەوە بـۆ وڵاتـی سـوید و لـەژێر کاریگـەریی شانۆنامەنووسـی سـویدی ئۆگەسـت سـتریندبێرگ (١٨٤٩- ١٩١٢) لـە چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەم و لە ماوەی ساڵانی (١٩١٥- ١٩٢٥)، ئەمـەش بەشـێوەیەکی گشـتی بـە شـێوازی بـاوی سـەردەمی جـەنگی جیهانیی یەکەم دادەنرێت.(**شمیسا، ٢٠١٩، ٢٢٩**) هەندێکی تریش دەیبەنەوە بۆ ئەڵمانیا وەک بزووتنەوەیەک ((لەنێوان ساڵەکانی ١٩١٠ و ١٩٢٥، کە لە ئەدەب و پتر هونەرەکان و بەتایبەت لە هونەرە دیدارییەکاندا سەری هەڵـداوە.))(**سـەجادی و مـەحمودی، ٢٠٠٤، ٣١**) دیسـانەوە هەنـدێکی تـر لـە سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن، کە فەرەنسا لانکەی لەدایکبوونی ئەم ڕێبازەیـە و ئەمـەش دەدەنـە پـاڵ فۆتۆگرافـەری فەرەنسـی (هـارڤی) لـە ساڵی ١٩١٠.(**رشدي، ٢٠٠٠، ١٤٠**)

جیاوازیی شوێنی سەرهەڵدانی دەربڕینگەرایی پەیوەندی بەو بوارە ئەدەبی یان هونەرییەوە هەیە، کە هونەرمەندان و ئەدیبان بۆ یەکەم جار لـە بەرهەمـەکانی خۆیاندا دەسـتیان داوەتێ، واتـە دەربڕینگـەرایی ((لـە فەرەنسا لە هونەری شێوەکاریدا دەرکەوت، دواتر کە هاتە نێو دنیای ئەدەبیاتـەوە، لـە هونـەری شانۆنامەنووسـیی ئەڵمانیـدا دەرکـەوتووە.)) (**رزایي، ٢٠١٩، لینک**) و بۆ بوارە هونەری و ئەدەبییەکانی تریش بەهـەمان شێوە بووە. ئەم دۆخە دەمانگەیەنێت بەوەی بڵێین دەربڕینگەرایی وەک ڕێبازێکی ناسراو، ((لەنێو کەلتوور و عـەقڵی کۆن و نوێبـاوی ئەورووپیدا ڕەگی داکوتاوە.)) (**مکاوي، ١٩٧١، ٩**) بـەم شـێوەیەیش ئەوە دەردەکەوێت، کـە ڕێبازەکـە لـە یـەک شـوێن و لـە یـەک بـواری دیـاریکراودا سـەری هەڵنەداوە، بەڵکو بە شێوەی جیاجیا و لە شوێنی جیاجیادا دەرکەوتووە و شـوێنکەوتووانی پێڕەوییـان لـە بنـەماکانی کـردووە. ئەمـەش نابێتـە گرفتێکی ئەوەندە گەورە لەبەردەم جیاوک و تایبەتمەندییەکانیدا، چونکە دواجار ئەمیش وەک هەر ڕێبـازێکی تری ئەدەبی و هونـەری هاوشـانی

حاڵەتــە دەروونــی و فیکرییــەکانی میللــەتانی ئــەوروپی بەرەوپێشــەوە چــووە. (**دەڕوانرێتــە: حوســێن، ٢٠١٤، ٢**). هــەر لــەم ڕوانگــەوە هەنــدێک لــە تــوێژەران پێیانوایــە ((دەربڕینگــەرایی زیــاتر لــە فــۆرمی ڕەوت یــان ئاراستەیەکی ئەدەبیدا خۆی دەناسێنێت تا ئەوەی وەک قوتابخانەیەکی ئەدەبیی خاوەن خەسڵەت و سیمای دەستنیشانکراو دەربکەوێت، واتە لەم ڕووەوە ناتوانین بەراوردی بکەین بە قوتابخانەیەکی ئەدەبیی وەک سروشتگەرایی یان نیشانەگەرایی.))(**مكاوي، ١٩٧١، ٦**) بەڵام پێدەچێت ئەم بۆچوونە لە گەیشتن بە ئامانج زۆر وردنەبێت، بەوپێیەی لە مێژووی ئەم ڕێبازەدا چەند ڕەوت و ئاراستەیەکی لێ پەیدابووە، کە سەرجەمیان وا دەکـەن لـەوەی بۆچوونەکـەی سـەرەوە ڕەت بکرێتـەوە.(**راغب، ١٩٧٧، ١٢٨- ١٣٨**) لێرەوە لە درێژەی مێژووی سەرهەڵدانیدا، دەربڕینگەرایی ناو یان زاراوەیەکە تەنها لە بەستێنی ئەدەبدا بەکارناهێندرێت، بەڵکو شێوە بەکارهێنانێکی بەرینتری هەیە و مەبەست لێی بزووتنەوەیەکی هونەریی فراوانتـرە، کـە هەریـەک لـە مۆسـیقا، وێنەکێشـان، سـەما و شـانۆیش لـەخۆدەگرێت، بـە واتـای ئـەوەی بنـەماکانی بەسـەر کۆمەڵـە ئاراسـتە و ڕەوتێکـی جۆراوجـۆری ئـەدەبی و هونەریـدا دەچەسـپێت، کـە خـاوەنی سنوورێکی دیاری نەکراوە. (**مكاوى، ١٩٧١، ١٢**).

لایــەنگرە ســەرەکییەکانی ئــەم ڕێبــازە لــە کۆمــەڵێک نووســەر و هونەرمەندی ناودار و ناسراو پێکهاتووە، کە بە شێوەگەلی جیاجیا لە وێناکردنی ڕیالیستیکیی جیهان و ژیان، خۆیان دوورخستووەتەوە و لە ئەدەب و هونەرەکەیاندا هەوڵیانداوە هەلومەرجی هەستیارانەی بەهێز و دیتەنی مێشک و زەینی خۆیان دەرببڕن.(**سەجادی و مەحمودی، ٢٠٠٤، ٣١**) هەروەک ئەوەی لە هونەری نیگارکێشاندا ناوی (ئێدوارد مونش، ڤان کوخ، پۆل گۆگن و ئۆسکار کۆکۆسکا و...هتد)(Gombrich, 1995, 563- 568) و لە بواری شانۆنامەنووسیشدا هەریەک لە (ساموئێل بێکت، بێرترۆڵد برێخـت، ئـارتۆر میللـەر، جـۆرج کاسـێرەر و ئێرنسـت تۆیلـەر و...هتد)(Oppenheimer, 2000, 74) ناوبانگییان هەیە، هەرچی لە بەستێنی

شیعریشدایە ناوە درەوشاوەکانی دەربڕینگەرایی بریتین لە: (ڕێنیێ ماریا ڕێلکە، ئێرنست ستادلەر، یاکۆب ڤان هۆدیس، جۆرج تراکڵ و گۆتفرێد بێن و...هتد.)(**Furness, 1973, 81** ، **هەروەها:** Styan, 1983, 4-10).

هەریەک لەم شاعیرانەیش بە جۆرێک لە جۆرەکان کاریگەر بوونە بە شیعرەکانی (ڕامبۆ) و (بۆدلێر) بەوپێیەی سیماکانی دەربڕینگەرایی لای هەریەک لەو دوو شاعیرە، بەشێوەیەکی بەرچاو سەرنج دەدرێن.(**أحمد، ٢٠١٣، لینک**) ئەمە بەدەر لەوەی دەربڕینگەرایی پەیوەندییەکی بەتینی لەگەڵ فیکری فەلسەفیدا هەیە، بەتایبەت لەگەڵ تێڕوانینە فەلسەفییەکانی (نیچە)(**مکاوی، ١٩٧١، ٢٢**) و هەروەها دیدی فەلسەفی (کانت) و (هیگڵ)یش، کە ئەم دووانەی دواییان پێشتر کارگەرییان لەسەر پەیدابوونی (تیۆری گوزارشتکردن) لەبواری تیۆری ئەدەبدا هەبووە.(**الماضي، ٢٠١٠، ٥٠**) دەمێنێتەوە بڵێین: بە خوێندنەوەی ژیاننامەی شاعیران و نووسەران و هونەرمەندانی دەربڕینگەرا، بۆمان دەردەکەوێت، کە زۆربەیان لە زیندانەکانی هیتلەر و ستالیندا گیانیان لەدەست داوە، یان لەڕێگەی خۆکوژییەوە دواییان بە ژیانی خۆیان هێناوە یانیش لە ڕووداوی جۆراوجۆری تردا گیانیان سپاردووە، ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەو جۆرە لە نهیلیزمی فیکری و فەلسەفی، کە ئەم ناودارانە بە جۆرێک لە جۆرەکان لە ژیانیاندا باوەڕیان پێی هەبووە و پێی کاریگەر بوون.(**سید حسینی، ١٣٩٤، ٧٠٩**)

**تەوەری دووەم/ ماهییەتی دەربڕینگەرایی:**

**یەکەم/ زاراوەی دەربڕینگەرایی (Expressionism):**

پێش ئەوەی لەبارەی چەمک و چییەتی دەربڕینگەراییەوە بدوێین، پێویستە ئەوە ڕوون بکەینەوە، کە زاراوەی (دەربڕینگەرایی) لە زمانی کوردیدا بەرانبەر بە زاراوەکانی (Expressionism)ی ئینگلیزی و (التعبيرية)ی عەرەبی و هەریەک لە (اکسپرسیونیسم) و (تعبیرگرائی) فارسی بەکاردەهێندرێت.(**علوش، ١٩٨٥، ٤٠٢. انوشه، ١٣٧٤، ١٢٤٥.** E.Krispyn,

32 ,1964) ئەگەرچی ئەم زاراوەیە لە ساڵی (١٨٥٠)وە بە واتای نوێی خۆی بەکارهێندراوە، کەچی دانانی وەک ناوی ڕێبازێکی ئەدەبی و هونەری دواکەوت تا ساڵی (١٩١٠)، کاتێک ژمارەیەک تابلۆی شێوەکاری لەژێر ناوی (ئێکسپریسۆنیزم) و لەلایەن هونەرمەندی فەرەنسی (جولیان ئۆگەست) لە پاریس نمایش کران. ( ,Gordon, 1987 175) هەروەها بەکارهێنانی ئەم وشەیە لە ئەڵمانیا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩١١) کاتێک بۆ یەکەم جار لەلایەن (هێرڤارد ڤالدن)ەوە لە گۆڤاری (گەردەلوول)دا وەک ئاماژەیەک بۆ ڕێبازە نوێیەکە بەکاریهێناوە.**(مکاوی، ١٩٧١، ٢١)**

سەبارەت بە بنەچەی زاراوەی ئێکسپریسیۆنیزم (Expressionism)یش، کە بەگشتی لە زمانە ئەوروپییەکاندا بەکاردێت، ئەوا لە سێ بەشی سەرەکی پێکهاتووە: بەشی یەکەم (ex) پێشگرێکە ئاماژە بۆ (دەرەوە) دەگەیەنێت و بەشی دووەمیش (Pression) بە واتای (گوشار و پەستان) دێت، ئەمەش دۆخێکە تێیدا شتێک لە ناوەوە بۆ دەرەوە پاڵ دەنرێت و بە سەختی دێتە دەرەوە، وەک ئەوەی لە ئەنجامی گوشینی ترێ، ئاوەکەی دەگیرێتەوە. **(سید حسینی، ١٣٩٤، ٧٠٦ . هەروەها: شمیسا، ٢٠١٩، ٢٢٩)** هەرچی پاشگری (ism)یشە دیارە کە ئاماژە بۆ (ڕێباز) و (ڕەوت)ێک دەکات.

بەم شێوەیە ئەگەر بمانەوێت زاراوەی (ئێکسپریسۆنیزم) بگۆڕینە سەر زمانی کوردی، ئەوا دەتوانین (دەربڕینگەرایی) بۆ بەکاربهێنین، یان وەک هەندێک کە (دەربڕینخوازی)یان بۆ داناوە، بەڵام ئێمە لێرەدا زاراوەی یەکەمیان پەسەند دەکەین، بەوپێیەی پاشگری (خوازی)، کە ڕەگی لە چاوگی (خواستن)ەوە وەرگیراوە، ئاماژە بە (خۆزیاخواستن) دەکات، وەک چۆن دەگوترێت (ئازادیخواز)، کە بۆ کەسێکە هەوڵدەدای ئازادییە و دەخوازێت ئازاد بێت و لەو پێناوەدا خەبات دەکات، لەکاتێکدا (ئێکسپریسیۆنیزم) زاراوەیەک نییە ئاماژەی بە خۆزیاخواستن تێدا بێت، واتە دۆخێک نییە بخوازرێت، بەڵکو دۆخێکە لە بوونی کەسی

ئـــەدیب و هونەرمەنـــدەوە دەردەچێـــت و خـــۆی بـــەیان دەکـــات. **(بەدەستکارییەوە، لە: ماکواری، ٢٠٠٢، ١٢)**

**دووەم/ چەمک و پێناسەی دەربڕینگەرایی:**

لـــە ڕوانگـــەی ناســـینی زاراوەی دەربڕینگەراییـــەوە، دەتـــوانین دەروازەی ناسـین بەسـەر ماهییـەت و خـودی چەمکەکەیـدا والا بکـەین، بـەڵام پێش ئـەوە پێویسـتە ئامـاژە بـەوە بدەین، کە لەوەتـەی ئـەدەب و ((هونەر پەیدا بووە دوو جووڵانەوەی هونەری پەیدا بووە، جووڵانەوەی یەکـــەم دیمـــەنی دەرەوەی مـــرۆڤ و سروشـــتی تۆمـــار کـــردووە، بەپێچەوانەشـــەوە جووڵانـەوەی دووەم لـە نـاخی دەروونـی ئـەدیب و هونەرمەندەوە سـەرچاوەی گرتـووە.))**(سـەڕاج، ٢٠٠٨، ٧٩)** دەربڕینگـەرایی وەک ڕێبـازێکی ئـەدەبی و هونـەری نوێنەرایـەتیی جووڵانـەوەی دووەم دەکات لە دەربڕیندا، هاوکات لە شێوە گشتییەکەیشیدا ((گوزارشتکردنە لـە وێنەیـەکی تایبـەتیی جیهـان، ئـەوەش ئـەو وێنەیـە، کـە خـود خـەڵقی کردووە بە پشتبەستن بـە شـعور و بـە ئاگایی و سۆز.))**(الماضـي، ٢٠١٠، ٥٠)**

لەلایـەکی تریشـەوە هـەر ئـەم تێڕوانینەیـە وای کردووە، سـەرباری ئەوەی ڕێبازەکە ((لە بنەڕەتدا بەستراوەتەوە بە شانۆنامەنووسـی، بـەڵام لە مۆسیقا و نیگارکێشی و ئەدەبیشدا خراوەتەڕوو.))**(شمیسا، ٢٠١٩، ٢٢٩)** دیسـانەوە هـەر ئـەم خەسـڵەتەیش لـە ڕوانگـەی چـەمکی دیالێکتیکـەوە ڕێبازەکەی گەیانـدووە بـەوەی کـە ((هـیچ کـات ڕواڵـەتی بزووتنەوەیـەکی یـەکگرتوو و یەکدەسـتی نـەبێت، بـەڵام دەکـرێ بگـوترێ تایبەتمەنـدی ناوەنـدیی ئـەم قوتابخانەیـە سەرکێشـییە لـە دەسـت نـەریتی ئـەدەبی و هونـەریی ڕیـالیزم. هـەم لـە بابـەت و هـەم لـە شـێوازدا.))**(سـەجادی و مـــەحمودی، ٢٠٠٤، ٣١)** بـــەم چەشـــنە دەربڕینگـــەرایی خـــۆی لەخۆیـــدا ((یاخیبوونێکە بەرانبـەر ڕیـالیزم، نووسـەر لـەجیاتی نیشـاندانی جیهـانی ڕووکـەش و حەقیقـەتی هەسـتپێکراو، ئـەزموونی ناخـەکیی خـۆی لـە جیهاندا بە شێوەیەک، کە لە زەینی ئەودایە ئاشکرا دەکات و دەیهێنێتە

دەرەوە، هەڵبەتە ئەم کارە هاوتایە لەگەڵ ڕەنج و فشارێکی زۆر، لەڕاستیدا هونەرمەند دەیەوێت ڕۆحی خۆی وێنە بکێشێت و زەینییەتی خۆی بخاتەڕوو، ئەمەش کارێکی ئاسان و سادە نییە.))**(شمیسا، ٢٠١٩، ٢٢٩-٢٣٠)** بەومانایەی لە ئێکسپریسیۆنیزمدا ئەدیب و هونەرمەند ((هێمایەک لە واقعییەت نیشان دەدات، کە هیچ وێکچوونێکی بە ڕواڵەتی ڕاستییەکەوە نییە، بەڵام ئەگەر هەر ئەو هێمایە درێژەی پێبدرێت، بە ڕاستەقینە و واقعییەت دەگات.))**(حاجی زادە، ٢٠١٨، ٥٤)** کەواتە هونەرمەندی دەربڕینگەرا (ئێکسپیرسیۆنیست) بە شێوەیەک لە شێوەکان ((ڕوانینی تاکەکەسییانەی خۆی دەربارەی ژیانی مرۆیی و کۆمەڵگای مرۆیی دەردەبڕێت، کە ئەم ڕوانینە زۆربەی کات کاردانەوەیەکی هەستیارانە یان پڕ گیروگرفتی هونەرمەندەکەیە و وەها دەربڕینێک لەڕێگەی گەورەکردنەوە یان گۆڕینی شێوەی ئەو فۆرمانەی ڕیالیزمی هونەرییەوە سەردەگرێ، کە بانگەشە بۆ بابەتیبوونی جیهانی دەرەوە دەکات.)) **(سەجادی و مەحمودی، ٢٠٠٤، ٣١ )**

لێرەدا گەڕانەوە بۆ ناوەوەی مرۆڤ و تەنها حەقیقەتێک، کە بوونێکی فیعلی و خاوەن کاریگەری بێت، حەقیقەتی ناوەکیی عەقڵ و ئەندێشە و هەستەکانە، کە حەقیقەتە پەی پێبراوەکان تێدەپەڕێنێت و لە کردارێکی ڕۆحییانەی سەربەخۆ و حەقیقەتێکی خودییەوە هەڵدەقوڵێت. **(ڕەسووڵ، ٢٠١٣، ٢٦٩)** هەربۆیە ئەو بارودۆخەی زەین و دەربڕینی ناخ لەلایەن ئەدیبەوە ((هەست و هەڵچوون و گرفتەکان بە شێوەیەکی گشتی نەناسراو و ناباون، بانگەشەی تیۆری دەربڕینگەرایی ئەمەیە، کە هونەر لە خودی خۆیدا پەیوەندیی بە دەرخستنی هەستەکانی ناخ، یان هەڵڕشتنی ناخەوە هەیە.)) **(شمیسا، ٢٠١٩، ٢٢٩- ٢٣٠)** کەواتە دەربڕینگەرایی لە ئەدەبدا هەروەک دەربڕینگەرایی لە هونەردا بریتییە لە ((گوزارشت لەبارەی هەستە ناوەکییەکانی مرۆڤەوە، بەشێوەیەک ئەو هەستگەلە پێکهێنەری ئەو جیهانەیە، کە مرۆڤەکەی تێدا دەژی.)) **(الحکیم، ٢٠١٣، لینک)**

بەم شێوەیە دەربڕینگەرایی –لە پێناسە گشتییەکەیدا- بریتی دەبێت لـە خودگـەرایی تـا ئەوپـەڕی توانـا و ڕەتدانـەوەی جیهـانی واقیعـی، لێرەشـەوە شـاعیری دەربڕینگـەرا لـە هـەوڵی ئـەوەدا دەبێـت، فیگـۆرە جیاوازەکـان بەشـێوەیەکی ئـەوتۆ وێنـا بکـات، کـە لـە حەقیقـەتی خۆیانـدا دەربکەونـەوە، بـەبێ ئـەوەی بـاڵ بـۆ سـەر لایـەنی خـەیاڵی ڕۆمانسـیزم بکێشێت. بەم پێودانگەیش دەگەینە ئەو شوێنەی کە تێیدا بتوانین بڵێین: ((دەربڕینگەرایی ڕێبازێکی ئـەدەبی و فەلسـەفییە، گرنگیـی بـە ئـەزموونی مرۆیی دەدات و ڕەهەندێکی خودی و دەروونی پێدەدات، مەبەست تێیدا گەوهەری شتەکانە نەک ڕووکاری دەرەوەیان.)) **(بیرقدار، ٢٠١١، لینک)**

**سێیەم/ ئاراستە و سیماکانی دەربڕینگەرایی:**

دەربڕینگەرایی چەندین ڕەوت و ئاراستەی جیاجیای لێ بووەتەوە، بـەڵام بەگشـتی هـەموو ئـەو ڕەوت و ئاراسـتانە لـە چوارچێـوەی دوو ئاراستەی گشتگیردا کۆدەبنەوە، ئەوانیش بریتین لە:

١.دەربڕینگەرایی عەقڵانی.

٢.دەربڕینگەرایی ناعەقڵانی.

لایـەنگرانی ئاراسـتەی یەکـەم پێیانوایـە، ئـەرکی ئـەدەب بریتییـە لـە چالاککردنی عەقڵ و دنـەدانی ویژدانـی مـرۆڤ بـە چەشـنێکی ئـەوتۆ، کـە ئەدەب ڕێگری لـە عـەقڵ و ویـژدان بکـات لـەوەی دووچـاری بێمانـایی و چەقبەسـتوویی ببنـەوە. نـاودارترینی دەربڕینگـەراکانی ئـەم ئاراسـتەیە بریتین لە: تۆلەر، هاسین کلیفەر، پیتشەر، کاپەر و... هتد. **(بیرقدار، ٢٠١١، لینـک)** هـــەرچی ئاراســـتەی دووەمـــە (دەربڕینگـــەرایی ناعـــەقڵانی)، لایەنگرەکانی پێیانوایە عەقڵانییـەت بریتییـە لـەوەی کـە خـەڵک لەسـەری ڕێـک کـەوتوون، بـەم هۆیـەش ئـەم ئاراسـتەیە بـە کـوڕی شـەرعیی سوریالیزم لە قەڵەم دەدرێت، هەربۆیـە بـە شۆڕشـێک دادەنرێت بەسـەر لۆژیکی ژیان و خودی عەقڵیشدا، بەمەش مل کـەچ ناکـەن بـۆ یاسـاکانی هونەر و ئـەدەب و بڕوایـان بەوەیـە، کـە ژیـان لـە جەوهـەر و حەقیقـەتی ڕووتی خۆیدا، شتێکی نامەعقووڵ و تێنەگەیشتراوە، واتـە بـوون و ژیـان

ئەگـەری تێگەیشـتن و لێکدانـەوەیان نییـە. **(عویـد، ٢٠١٨، لینـک. هـەروەها: بیرقـدار، ٢٠١١، لینـک)** پێویسـتە ئامـاژە بـەوەش بـدەین، کـە ئاراسـتەی ناعەقڵانی بە (سۆفیزمی ئاڵۆز)یش ناودەبرێت.**(راغب، ١٩٧٧، ١٣١)**

لێرەوە هەندێک لە گرنگترین سیما و بنەما ئەدەبی و هونەرییەکانی دەربڕینگـەرایی دەخەینـەڕوو، کـە پێکـڕا وێنەیـەکی گشـتیی ڕێبازەکـە دەنەخشـێنن، بــە ڕەچــاوکردنی ئــەوەی کــە ئــەم خاڵانــەی لێــرەدا دەخرێنـەڕوو زیـاتر تایبـەتن بـە بـواری شـیعری دەربڕینگـەرایی، بۆیـە بـەپێی گـۆڕانی بەسـتێنە ئـەدەبی و هونەرییـەکان و بـەپێی مەبەسـت و ئامراز و شێوازی دەربڕینەکە، گۆڕان بەسەر ئەم سیما و بنەمایانەشدا دێت، هەڵبـەت بـە لەبـەرچاوگرتنی ئـەو خاڵانـەی کـە زیـاتر شەنگسـتین (Principals) وەک لەوەی پەیوەست بن بـە ڕووکەشـی دیاردەکانـەوە، کـە گوزارشتیان لێ دەکرێت.

١.دەربڕینگەرایی ئەزموونی دەروونیی ڕووتی شـاعیر بەرجەسـتە دەکات، ئەمەش بە ڕێگەی فراوانکردنی ڕەهەندەکانی ئەو ئەزموونـە و تیشکی نوێ خستنەسەریان، بۆئەوەی ئەو شتانە بدۆزێتەوە، کە مرۆڤ پــەنهانی کــردوون یــان بــە هــۆی کورتبینییــەوە نایــانبینن، هــەروەها گەوهەری دیاردەکان بەرجەستە دەکات، بۆیـە دان بـە لێکچوونی نێوان دیـوی دەرەوە و نـاوەوەدا نانێـت. **(بیرقـدار، ٢٠١١، لینـک)** واتــە جــەخت دەکاتـەوە لەسـەر خودگـەرایی پتـر لـە بابەتگەرایی، بـەوەی کـە ئەمـەی دواییيان تەنێ وەک مەبەستێک لێی دەڕوانێت نەک زیاتر.

٢. شیعر لە ڕوانگەی دیاردەگەراییيەوە ڕزگارکـەری ڕۆحـی مرۆڤـە لە دەست ئـەو هەژموونـە باڵادەسـتەی داکـەوتی تەقلیدی بەسـەر کیـانی ســـەربەخۆی مرۆڤـــەوە، داکـــەوتێکی ئـــەوتۆ کـــە -وەک دەگـــوترێ- سنووردارکراوە تا ئاستی دەبەنگی! **(راغب، ١٩٧٧، ١٣٢)**

٣. دەربڕینگـەرایی پرۆسـەیەکی ناوەکییـە بـەرەو دەرەوە، ئەمـەش پێچەوانـەی بۆچوونگـەرایی (الانطباعیـة- Impressionism )ـە، بـەوەی دەربڕینگـەرایی گرنگـی دەدات بـەو هەسـتە ورووژاوانـەی لـە نـاخی

دەروونەوە سەرچاوە دەگرن، بەڵام بۆچوونگەرایی گرنگی دەدات بەو هەستە وورووژاوانەی کە لە دەرەوە کاریگەری دەخەنە سەر مرۆڤی شاعیر و دواتریش ئەو کاریگەرییە لە بەرهەمەکەیدا ڕەنگدانەوەی دەبێت. **(طارق، ؟، ٣٣- ٣٦)** کەواتە ئەگەر دەربڕینگەرایی خودیی بێت، هەڵبەتە بۆچوونگەرایی بابەتییە. **(بیزیو، ٢٠١٠، لینک)**

٤.وێناکردنی ژیان نەک وەک ئەوەی خۆی دەردەخات، بەڵکو بەپێی ئەو تێگەیشتنەی کە شاعیر لەو خۆدەرخستنەی ژیاندا بەرهەمی هێناوە، واتە بینینی تایبەتیی شاعیری هونەرمەند زاڵ دەبێت بەسەر داکەوت (واقیع)ی تایبەتیدا، ئەمەش پێچەوانەی تێگەیشتنی بۆچوونگەراییە، کە پێیوایە ڕوانگەی هونەرمەند پەیوەستە بە هەستی بینینەوە. **(ترحینی، دون، ٧٦)** دەبێ ئەوەش ڕوون بکەینەوە: جیاوازیی دەربڕینگەرایی لەگەڵ هەریەک لە (بۆچوونگەرایی و سروشتگەرایی)دا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە هەر لە بنەماوە دەربڕینگەرایی وەک پەرچەکردارێک بەرانبەر هەریەک لەو دوو ڕێبازەی دیکە سەری هەڵداوە. **(راغب، ١٩٧٧، ١٣٠)**

٥.شاعیری دەربڕینگەرا باوەڕی وایە، شیعر دەکەوێتە پانتایی نێوان سووسە و دەربڕین (الحدس و التعبیر)ەوە، لەم ڕێگەیەشەوە گوزارشت لە هەست و سۆزێکی دیاریکراو دەکات و دەیەوێت هاواری مرۆڤ لەنێو ژینگەکەی خۆیدا بگەیەنێتە ئەوانیتر.**(کحیل، ٢٠١٧، لینک)** بۆیە دەربڕینگەرایی دەبێت بەو ڕێبازەی کە لە کرۆکدا هاوشانە لەگەڵ بەرەوپێشچوونی بوون و گۆڕانە هەنووکەییەکانی ژیان.

٦. بەلای دەربڕینگەراکانەوە ئەدەب و هونەر تەنها بریتی نین لە گوزارشت لە بیرۆکەیەکی دیاریکراو، بەڵکو پێش هەر شتێک، ئەدەب و هونەر بەرجەستەکردنی بیرۆکەیەکە لەبارەی دیاردەیەکەوە، کە دەوری مرۆڤی سەردەمی داوە یان دیاردەیەک، کە مرۆڤ تێیدا دەژی. **(راغب، ١٩٧٧، ١٣٧)** لەم ڕوانگەوە شاعیری دەربڕینگەرا لە هەوڵی ئەوەدایە،

جیهانێکی تر دابهێنێت بەدەر بێت لەو مەرگەساتانەی پێشتر مرۆڤایەتی بەدەستییەوە نالاندوویەتی. **(مکاوي، ١٩٧١، ١٦)**

٧. دەربڕینگەرایی و شیعری دەربڕینگەرا دژ بە هەموو جۆرە چەوساندنەوەیەک دەوەستێتەوە، کە مرۆڤی مۆدێرن بە هۆی داکەوتی داسەپاوی شارستانییەتەوە دەیچێژێت. لێرەشەوە ئەدەب و هونەری دەربڕینگەرایی دەچێتە چوارچێوەیەکی ئیستاتیکیی بالاترەوە، کە تێیدا گوزارشت لە هەموو ئەو ئازار و مەینەتییانەی مرۆڤی سەردەم دەکرێت و بەدوای چارەنووسێکی باشتر لەوەی هەیە کۆشش دەکات. **(سيد حسيني، ١٣٩٤، ٧٠٤)**

٨. دەربڕینگەرایی سوودی تەواوی لە دۆزینەوە گەورەکەی فرۆید لە بواری دەروونناسیدا وەرگرتووە، بەوەی کە مرۆڤ بوونەوەرێکی دینامیکییە و لە پەیوەستیدایە لەگەڵ خودی خۆی و ئەو داکەوتەی تێیدا دەژی. **(راغب، ١٩١١، ل١٣٢)** لەم ڕوانگەوە جیاوازیی دەربڕینگەرایی لەگەڵ سوریالیزم لەمەدایە، کە دەربڕینگەراکان کاریان بەسەر خەونە ڕاستەقینە و واقعییەکانەوە نییە، بەڵکو بابەتی ئەوان کابووس و خەونە ناباوەکانە، لەبەر ئەم هۆیەش ئەم بەرهەمانە بوونەتە مایەی چاوتێبڕینی دەروونناسەکان. **(شميسا، ٢٠١٩، ٢٣٢)**

## بەشی دووەم
## بەرجەستەبوونی سیماکانی دەربڕینگەرایی لە نموونەی شیعرەکاندا

**تەوەری یەکەم/ شیعرییەتی دەربڕینگەرایی لە نموونەی شیعرەکاندا**

چەمکی شیعرییەت لێرەدا لەسەر ئاستی مەبەست و ناوەڕۆکی شیعری بەرکەڵک خراوە، بە واتای ئەوەی لە ڕوانگەی دنیابینیی دەربڕینگەراییەوە لەم چەمکە ورد دەبینەوە، نەک لە ئاستی ڕوخسار و زمانی شیعری و وەک بەشێک لە کەرەستە تەقلیدییەکانی شێوازگەری، هەربۆیە لێرەدا سەرلەنوێ سیما دەربڕینگەراییەکان دادەڕێژینەوە و بەپێی ڕوانگەی تایبەتی شاعیر و لەڕێگەی نموونەی شیعرەکانییەوە خوێندنەوەیان بۆ دەکەین، ئەمەش لە چەند سیما و دەرکەوتەیەکدا گەڵاڵە دەکەین، بەم شێوەی لای خوارەوە:

**یەکەم/ خستنەڕووی داکەوت (واقیع)ی زەینی:** مەبەست لەمەش ئەوەیە، کە شاعیری دەربڕینگەرا زیاتر لە واقیعییەت گرینگی بە دەرخستنی هەڵچوونەکان دەدات، لە ئەنجامدا لە دەقەکانیدا کۆمەڵێک دیاردەی وەک: ترس، توورەیی، سەرگەردانی، تاڵی و هاوتای ئەو جۆرە مەسەلانە دەخاتەڕوو، هەندێک جاریش بارودۆخی دژواری مرۆڤ لە کۆمەڵگایەکی پیشەسازی دەخوێنینەوە. **(شمیسا، ٢٠١٩، ل٢٣٠)** کەواتە شاعیر لەپێناو بەدەستەوەدانی مەبەست و پێکهێنانی شیعرییەتدا، واقیعییەتێکی نوێ دروست دەکات، کە لەڕێگەی زەینی خۆیەوە وێنای دەکات، هەروەک لەم بارەیەوە خودی (سەباح ڕەنجدەر) خۆی، لە مانیفێستێکی شیعریدا دەڵێت: ((لە شیعردا خۆم دەکەم بە واقیع و سەرلەنوێ پێکی دەهێنمەوە، واتە واقیعی ناو نووسین، یان ئەو واقیعەی نووسین پێشنیازی دەکات، پەیڕەوەکردنی چۆنێتی واقیع لەم بارەدا دەناسرێت، یان پێناسە دەکرێت بۆ ناسین.)) **(ڕەنجدەر، ٢٠١٤، ٤٠)** لێرەشەوە شاعیر ئەم دنیابینییە دەگۆڕێتە سەر شیعرییەتێکی دەربڕینگەرایی و لە دەقی (زێوان)دا بەم شێوەیە تەوزیفی دەکات:

**سروشت هەموو شتێکت ترساندوومی**
**لرفەی ئاگرت**
**بڵندایی چیات**
**گەفی ڕووبارت**
**دەشتایی ڕووتت**
**پەنجەم لە چاوەڕوانییەکی دوانەهاتوو یان گیان پێنەماو**
**بەناو یەکدا دەشکێنمەوە**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ٥-٦)**

شاعیر توانیویەتی گوزارشت لەو ترسە سەرەتاییەی خۆی بکات -وەک مرۆڤێک- کە لەهەمبەر سروشت و دیاردەکانی هەیەتی، هەڵبەتە ئەمەش دەربڕینە لەوپەڕی ئاستی مرۆبوونی خۆیدا، هەروەک بەدیوێکی تردا لەپێناو وێناکردنی ئەو واقیعییەتە نوێیە، پەنا دەباتە بەر کۆمەڵێک میکانیزمی شیعری، کە دیارترینیان میکانیزمی خەونییە، ((ئەوەی لەنێوان من و شیعردا درێژ دەبێتەوە، خەونە نەک واقیع، لە کردەوە و کردەی نووسیندا خەون دەکەم بە واقیعی نووسین.)) (ڕەنجدەر، ٢٠١٣، ٨٦) ئەم واقیعییەتە زەینییە بەلای شاعیرەوە هەروا بەئاسانی دەستەبەر نایەت، بەڵکو ئەو ((وەک ئەکرۆپاتێک گەمە بە وشەکانی دەکات، لەپێناو سڕینەوەی ئەو ناوەندە، شاعیر گەمەیان پێدەکات، کە واقیع لە زمان جودا دەکەنەوە.)) (مەلا، ٢٠١٩، ١٣٨) ئەوەتا لە دەقی (دوا شوێن)دا دەڵێت:

**هەمووومان بە ڕێگاکاندا دەڕۆین**
**بگەین یان نەگەین چ ڕوودەدات و شیر لەسەر چ جامێک دەڕژێت**
**جامی پڕ هەر ئەوەیە کە هەیە**
**حەوت پەردە لە چاوی پیس دەیپارێزن**
**شاعیرە نامرادەکە بە دیار گەرمایی دڵی دەمێنێتەوە**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٤٦٩)**

(نامرادبوونی شاعیر) لێرەدا بەرانبەر بە (ڕژانی شیر لە جام)ەوە، دەربڕینێکە لە ئاستێکی زمانیدا تا لەڕێگایەوە گوزارشت لەو سەرگەردانی و تووڕەییەی خۆی بکات، لە کۆی پێدراوەکانی ژیان و

بـوون هەیـەتی، بەوپێیـەی (بگـەین یـان نەگـەین) دواجـار مـرۆڤ و پێشـمەرجەکانی بـوونی مـرۆڤ (هـەر ئەوەیـە، کـە هەیـە)، لێـرەدا ئـەو ڕێگەیەی شاعیر لە زەینی خۆیدا وێنای کردووە ((هەنگاوەکانی شاعیرە، کە هێواش هێواش لە ماڵی ناو شیعر نزیک دەبێتەوە، ئەمەش ئەزموونـە واقیعییـەکان یارمـەتی دەدەن، کـە ئـەوەی لـە شـیعردا پێـی دەگـات، حەقیقەتە یان وای زانیوە کە هەقە.)) **(عەبدوڵڵا، ٢٠١٤، ١١٠)** دیسانەوە هەر لە (زێوان)دا هاتووە:

**منداڵیم لەناو پیریمدا گۆشەگیرە**
**گەنجییەتییەکی باوان دوور و خۆڵەمێشیش**
**ئاگادارم باران دەتکێتە ناو گۆڕان**
**کفنی مردووان تەڕ دەکات**
**تۆڕی دڕاو لە ئاوی بلەرێتەوە**
**ماسی غارغارانێی گیانبازی بەسەردا دەکەن**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ٥٤)**

ئـەم دۆخـە تاڵـەی لێـرەدا گوزارشـتی لـێ کـراوە، دەربـڕی کـۆی ڕەوشـی پـڕ لـە ئاریشـەی شـاعیرە، بـەڵام ئـەو توانیویـەتی لەڕێگـەی شیعرییەتی دەربڕینگەراییەوە، وێنای واقیعیەتێکی زەینی ئەوتۆمان بۆ بکـات، کـە تێیـدا داڵـە زمانەوانییـەکان دەبـن بـە نمایندەی کۆمـەڵێک مـەدلوولی جیـاواز، لێرەشـەوە ئـەو مەدلوولانـە لـە سـیاقی گشـتیدا بیرۆکەیەکی تر پێشکەش دەکەن، کە هەڵگری مەغزای شیعرەکەیە، واتـە هەر ئەم ((پەسندانە زەینییە وا لە شـاعیر دەکات، تـەواوی هێز و وزەی شـیعریی بارگـەکراوی خـۆی بخاتەگـەڕ...)) **(الفـواز، ٢٠١٠، ١٢٣)** ئەمـەش لەپێناو بەرهەمهێنانی شیعرییەتێکی ئاست بەرزی دەربڕینگەرادا.

**دووەم/ گرنگیدان بە دیوی پەنهانی مرۆڤ:** واتە جەمسەری هەرە گەرمی دەربڕینگەرایی بریتییە لە ناخگەرایی، بەمـەش خـەون دەگۆڕێت بۆ شیعر و ئەدەبیات، هەڵبەتە ئـەم خـەونانـە هەندێ جاریش کابووسن. **(شمیسا، ٢٠١٩، ٢٣٠- ٢٣١)** بەومانایەی لە بەرهەمی دەربڕینگەراییدا زیاتر

((جەخت دەکرێتە سەر دەربڕینی ئەزموونی دەروونیی مرۆیی، هاوکات یاخیبوونێک دژ بەو ڕەوتە مادییەی کۆمەڵگە سەرنج دەدرێت.)) **(الحكيم، ٢٠١٣، لینک)** کە هەمووانی گیرۆدەی خۆی کردووە، ئەمەش دەبێت بە سەرچاوەیەک بۆئەوەی لەڕێگەیەوە شاعیر هەستەکانی خۆی لە چوارچێوەی دەقێکدا تۆمار بکات، هەروەک شاعیر لە (سزای هەمیشەیی)دا دەڵێت:

**چاوەڕوانی گردێکە لە خۆڵ**
**کانی خۆڵی لێ دەخوات**
**لە بەربوونەوەی بارانی خەوسووک و بای خەوگران**
**ماڵەکانی ناو دۆڵ ئاگریان کوژایەوە**
**بالووکەی خاک باڵندە بانگ ناکات**
**حەوا نەیتوانی سنووری جێ پێیانی ببەزێنێت**
**شوێن پێی ئاوێنەیە دوژمن دەباتەوە سەر ماڵ و دەرگای**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ٧٩)**

بە وردبوونەوە لەم کۆپلە شیعرە، دەردەکەوێت کە شاعیر لەبارەی کرۆک و ناوەڕۆکی مرۆڤەوە دەنووسێت، نەک ئەوەی بیەوێت گوزارشت لە دیوی دەرەوەی بکات، واتە ((شاعیری ئەزموندار کار لەناو مانای ئامادەکراو ناکات، ئاماژەکان دەجووڵێنێت تا ئاستی پەرجوو دروستکردنیش سادە دەبێتەوە، لە سادەبوونەوەیدا دەگات بە خۆدەربڕین و چێژی بوون.)) **(ڕەنجدەر، ٢٠١٣، ٣٨)** ئەمەش ئەو ساتە شیعرییەیە، کە تێیدا شاعیر لەژێر کاریگەریی زمان و هاتنەگۆی بوونی خۆیدا دەبێت، هەروەک لە دەقی (جەنگی پرسیار)دا ئەم دۆخە زیاتر زەق دەبێتەوە بەوەی کاتێک دەڵێت:

**ماسی بەدبەختترین گیاندارە**
**چێژ لە ئاو وەرناگرێت**
**منیش نەگبەتترین ئادەمیزادم**
**چێژم لە منداڵیی خۆم وەرنەگرت**
**وا بەرزاییەک لە منداڵییم دەکوژێنمەوە**

**ڕەنگە سبەی ببێتە وڵاتم**
**وڵاتی منداڵێتییم نیشان دە**
**ڕووناکی ونبوو بەرزاییەک دادەگیرسێنێت**
**هەنگاوێک دەتگەیەنێتەوە منداڵیی**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ١٠٦)**

ئەم گەڕانەوەیە بەرەو سەردەمی منداڵیی، دۆخێکی نۆستالجی ڕووت نییە، ئەوەندەی دەربڕینگەراییەکی شیعرییە و لەڕێگەیەوە شاعیر دەیەوێت ئەوەمان پێ ڕابگەیەنێت، کە ((ئەگەر شیعر لە قۆناغی یەکەمدا ئەفراندنی وێنەی نوێ و بەخشینی وەزیفەی نوێ بێت بە بەکاربراوەکان، ئەوا بوونی زمانێکی تۆکمەش بۆ دەربڕین خاڵێکی گرنگە، وەک ڕەنجدەر ناوی بردووە بە "نووسینەوەی نۆتەی زمان")) (سدیق، ٢٠١٠، ٥٢) لەم ڕوانگەوە لە دەقی (خەونی سروشت)دا شاعیر دەڵێت:

**گیان لەناو قەفەس**
**بە هەموو شێوەیەک ستایشی مانەوە دەکات**
**ستایش لەناو قەفەس چی دەگەیەنێ**
**ئەگەر مانایەکی نەگەیاند**
**زەمینییەکان گیانیان بچووک دەبێتەوە**
**لە بچووکبوونەوەیاندا تووشی هیچ گرفتێک دەبن**
**ئەی ئەگەر گەیاندی**
**پڵینگەکان دارستان بۆ خێزانە کەمئەندامەکان جێدەهێڵن**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ٢٠٣)**

شاعیر لەڕێگەی تەقاندنەوەی وزە ناوەکییەکانی زمانەوە، گیان وەک بەرجەستەبوویەکی نێو ژیان و بوون دەخاتەڕوو، ئەمەش کاتێک لەنێو (قەفەس)دا نیشانی ئێمەی دەدات و هەر خۆیشی لەبارەی مانادار و بێمانایی (گیان لەناو قەفەس) پرسیارمان لێدەکات و ئەم پرسیارکردنەیشی بۆ ئەوەیە تا پەیامی دەربڕینگەرایانەی خۆی بە

خوێنــەر بگەیــەنێت، لــەوەی ((ســاتی دەرچــوون لــە کــات و شــوێن، گەڕانەوەیە بۆ ساتی نووسینی شیعر لە دەرەوەی پێناسە زەمەنی و کاتییـەکان.)) (**ئەحمـەد، ٢٠١٠، ١٣**) هاوکـات خسـتنەڕووی ئـەو پەنهانییـە ناوەکییـەی بـوونی مرۆییـە، کـە هەمیشـە لـە دۆخـی خۆحەشـاردانا دەمێنێتــەوە، مەگــەر ئــەو کاتانــە نــەبێت، کــە دەخرێتــە چوارچێـوەی دەربڕینێکی شیعرییەوە، وەک ئەوەی لێرەدا شاعیر توانیویەتی مامەڵەی لەگەڵـدا بکـات، ((ئەمـەش مەلەوانیکردنـە لـەناو ئارکیۆلۆژییـەتی بیـری بـەڕۆحبوونی شـتەکان، واتـە یـەک بـە یـەکی پـەردەکانی لێکدانـەوە هەڵدەداتەوە.)) (**پاڵەوان، ٢٠١٠، ١١٨**)

**ســێیەم/ خــەون و بیرۆکــەی زەینــی:** شــاعیر و نووســەری دەربڕینگەرا خەونە وڕێنەییە کۆنەکانی ڕۆمانسیزم بەشێوەیەکی تازە نیشان دەدات، واتە لە دەربڕینگەراییدا ((خەونە ڕۆژانەییەکان جێگەی شتە لاساییکەرەوەکانیان گرتۆتەوە و واتا و ڕوخساری بەرهەمەکە ڕوونکەرەوە و ئاشکراکەری پەشێوی و پەرێشانییەکانە، ئەم خەون و گرفتارییە زەینییانە، ئەم بیرۆکە ئەبستراکتییانە و ئەم شوێنە ترسناکە زەینی و ڕۆحییانە بە هۆی چەند ئامرازێکی خستنەڕوو و جوانکاری وەک ڕەمز و خواستن بەرجەستە دەکرێن.)) (**شمیسا، ٢٠١٩، ل٢٣١ و ٢٣٢**)

لەم بارەیەوە ڕەنجدەر خۆی دەڵێت: ((جیهانی خەونیش بەلای منەوە سەرنجڕاکێشترین جیهانی شیعرییە... خەونی نایاب دەبێتە زمان و شێواز و بابەتی نایاب، دەقەکانم دەقی خەونین، خەونیش وەک گیان و هانـدەر، هەمیشـە تێکـەڵ بـە شـیعرییەتی دەقـم دەبێـت و هەسـتی شکۆمەندی لە مندا ڕسکاندووە و دەڕسکێنێت.))(**ڕەنجدەر، ٢٠١٤، ١٨-١٩**) شاعیر توانیویەتی ئەم تێگەیشتنەی خۆی لەمەڕ دەربڕینگەرایی خەون لە بۆتەی شیعردا پێشکەش بکات، هەروەک لە دەقی (ئاوێنەی دووەمی سرووش)دا دەڵێت:

**کتێبی چی ئێمەی هێنا**

**خەونم لە تۆدا کەسە دوورەکانی بینی**

**قسەم لە تۆدا بووە گۆرانی**

**هەنگاوم لە تۆدا جۆگەلەی دەرەوەی پەرژینی هێنا ناو ڕەز**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ٢٤٦)**

لێرەدا خەون وەک میکانیزمێک بەگەڕخراوە، بۆئەوەی لەڕێگەیەوە شیعرییەتی دەربڕینگەرایی بگات بە ترۆپکی خۆی، ئەمەش لەو ڕوانگەوە ((کە دەربڕین وەک گوتنەکانی زمان کۆکردنەوەی کۆمەڵێک گوزارەیە، پێکەوە دەقێکی گەورەتر دەسازێنن.)) **(خۆشناو، ٢٠٠٩، ٢٠٤)** بەڵام کاتێک خەون دەبێت بە میکانیزمی ئەو دەربڕینە، ئەوکات بیرە زەینییەکانی شاعیر دەردەکەون و بەمەش گوزارەکان بە واتای ((کۆد و هێما و سیمبولی خەون، چونکە ئەوان واتایان لێ باردەکرێت و دەلالەتی خەونەکە و واتای خەونەکە دەدەن و ڕۆڵی وشە وەدەست دێنن و جێگەی وشەیش دەگرنەوە.)) **(موسا، ٢٠١٩، ٢٤١)** ئەم بە ترۆپک گەیشتنەی دەربڕین و بە میکانیزمبوونەی خەون لەم کۆپلەیەدا تەواوتر خۆی بەیان دەکات، کاتێک شاعیر دەڵێت:

**خەونبینین هاوتای جانتای گەشت و خۆشبەختییە**

**خەون ئەی کراسی بۆنخۆشی**

**یەکەمین ڕۆژی چوونە قوتابخانە**

**بە دەنگێکی خودایی شتێک بدرکێنە**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ٥٣)**

لێرەدا وێڕای ئەوەی شاعیر خەونی وەک سەفەر بینیوە، هاوکات دەیەوێت بڵێت خەون و سەفەر بەبێ یەکتر هەڵناکەن و هەمیشە پێکەوە دێن و دەلالەت و کۆدەکانی خەون دروست دەکەن. **(موسا، ٢٠١٩، ٢٤٣)**، هەروەها ئەوەیش ڕادەگەیەنێت، کە ((ژیانمان خەونئاسایە، یان جەوهەرێکی خەونئاسای تێدایە، بەم دەربڕینە تاڕادەیەک گشتگیرە ئێمە ئەو شتە بێماناییانەین کە خەونیان لێ دروست بووە.)) (بۆرخێس، ٢٠١٦، ٤٣) ئەگەرچی ئاماژەیەک بە ڕابردوو کراوە، بەڵام لەڕاستیدا شاعیر دەیەوێت لەڕێگەی (سەفەری خەون-ئاسا) و

(خەونی سەفەر-ئاسا)ی خۆیەوە، بەرەو ئایندە هەنگاو بنێت، چونکە لەڕاستیدا خەون لەگەڵ هاوتاکەی خۆیدا، کە ئەویش بیرۆکەی زەینییە، دەبن بەو هەلومەرجەی تێیدا مەبەست و گوزارشتە شیعرییەکان زیاتر خۆیان دەربخەن و شیعرییەت بەرهەم بهێنن، هەروەک شاعیر لە دەقێکدا بەناونیشانی (جەنگی پرسیار) دەڵێت:

**کۆچ بەرەو خەون**
**گەڕانەوە ڕووەو خەون**
**نیشتەجێبوون لەماڵی خەون**
**خەون شادمانی سەر زەمین**
**سەر زەمین گێژەنی ژیان**
**ژیان خەونێکە لە شەوێک کۆناکرێتەوە**
**مردن دەتگەیەنێتە خەون**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ١٠٦)**

بەم شێوەیە شاعیر لەڕێگەی خەون و بیرۆکەی زەینییەوە دەستبەرداری پێکهێنانی ئاساییانەی وێنەی شیعریی بووە، لەبری ئەوە گێڕانەوەبەندییەکی خەونیی بەرهەم هێناوە، کە ئەمەش زمانی خستووەتە ((باری دەربڕین لە کرۆکی جوانی و وێنەی بێگەرد...)) **(ڕەنجدەر، ٢٠١٣، ٢٢)** لەڕێگەی خەونەوە. دەبێت ئەوەش بزانین لەپاڵ هەموو ئەوانەدا ((نەست سەرچاوەی خەونە لای ڕەنجدەر، بەوەی کە واقیعی دەروونی و ڕاستەقینەیە و ناوچەی هەرە فراوانی ئاوەز و پێکهاتەکانییەتی، بە ئەزموونەکانی منداڵی و دەرهاویشتە دەروونییەکانیشیەوە.)) **(محەمەد، ٢٠١٠، ٦٢)**

**چوارەم/ گرفتاری و خرۆشانی ڕۆحی:** شاعیری دەربڕینگەرا لەو ڕوانگەوەی کە دەیەوێت پەشێوی ڕۆحیی خۆی وێنە بکێشێت، هەم خۆی گرفتاری خرۆشانێکی توندی ڕۆحییە و هەمیش خوێنەر دەخاتە پەرێشانییەوە، ئەو یاساکانی نووسین ڕەچاو ناکات و ئەوەندە بە دوای شتە عەقڵانییەکانەوە نییە. هەڵبەت ئەم گرفتاری و خرۆشانە ڕۆحییەی

شاعیر و نووسەری دەربڕینگەرا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ((كاردانەوە قووڵە هەستی، وێنایی، مەعنەوی و ڕەوشتییەی كە لە ناوەوە سەرچاوە دەگرێت بەرەو دەرەوە، هەر ئەوەش لە كاتی خوێندنەوەدا كار دەكاتە سەر وەرگر.)) (أحمد، ٢٠١٥، لينك) لەم ڕوانگەوە شاعیر لە شیعری (ع-داوا)دا دەڵێت:

**باران بە ئارەزوویەكی بەتینەوە دەبارێت**

**زەوییش داوای هیچی نەكردووە**

**ئەم چاكە لە خۆڕاییە چییە**

**گۆرانیم بۆ لیمۆی بە لكەوە شووراو تەرخانە**

**بیریش لە پێش كەوتنەخوارەوەی دەكەمەوە**

**زەوی دڵخۆشە بەسەریدا تێبپەڕی**

**بەروبوومی خۆڕسكی خۆیت بەتاسەوە پێشكێش كات**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ٣٤٢)**

بەم پێودانگە شاعیر سەرچاوەكانی شیعرییەت لە دەروونی خۆیەوە دەدۆزێتەوە و ڕاستییەكانی دەرەوەش ئاوێتەی ئەو خەون و خەیاڵانە دەكات، كە لەپێناویاندا دەنووسێت، هەرئەوەش دووچاری جۆرێک لە نامۆیی دەكاتەوە، كە هەر لەڕاستیشدا وەک خۆی دەڵێت: ((بۆئەوەی شاعیر بە شیعرییەت بگات، پێویستە بە نامۆییدا گوزەر بكات، یان لە نامۆییدا بژێت، چونكە بەشێک لە بوونی شیعر لە جەستەی نامۆییدا دەمێنێتەوە و دەبێتە ئەفسوون و ڕاز.)) (ڕەنجدەر، ٢٠١٣، ١٤٧) بەم شێوەیە لە ڕوانگەی چەمكەكانی ڕەخنەی دەربڕینگەراییەوە، خوێندنەوەی دەق لە جەوهەری خۆیدا ئاوێتەبوون و ژیانە لەنێو دەقدا، ئەگەر دەق پەسەندكراو نەبوو، ئەوا ئەم ئامانجە بەدی نایەت.)) **(موسوي، ٢٠١٥، لينک)** هەروەک لە دەقی (م-بەردەوامی)دا هاتووە:

**سیزیف لە خۆشبەختی لەدایک بوو**

**بنار بە نرخترین شوێنی پێشكێش بە بەردە دڵخۆشەكەی كرد**

**قۆرتایی چاو**
**چاوەڕوانی پەیمانی چاخی دڵنیایی تاقی كردەوە**
**سەركەوت**
**لووتكە قوربانییە**
**لاولاو تێی دەئاڵێ...**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ٣٥١)**

ئەم خرۆشان و پەشێوییە ڕۆحییەی شاعیر لەڕێگەی شیعرەوەماڵێكی بۆ چێ دەكات و بەمەش شیعر دەبێتە ئەو جێگەیەی كە ڕۆحی ماندووی خۆی تێدا مانیفێست دەكات. هەڵبەتە ئەم دۆخەی شاعیری دەربڕینگەرا لە ئەنجامی نەخۆشییەوە نییە، ((شیعر لای شاعیر لەسەر لۆژیک بەند نییە، بەڵكو دژەلۆژیكیش ئیش دەكات، لێرەوە وڕێنەكردن پانتاییەكی مەزن لە دەقی ئەم شاعیرە داگیر دەكات. وڕێنەی نەخۆشێک نا، بەڵكو چەماندنەوەی زمان بۆ ئاستێكی دی.)) (مەلا، ٢٠١٩، ١٣٩) ئەمەش دەچێتەوە سەر ئاستی دەربڕینگەرایی ناعەقڵانی، كە زیاتر لەو وێنە شیعرییانەدا چڕدەبێتەوە، كە شاعیر بەبێ ئەوەی هیچ هەستێكیشی بەرانبەر جووڵە و بزاوتەكانی خۆی هەبێت، كەچی دەخوازێت بیانكات بە ڕووداو و ئەزموونیان بكات لە دەرەوەی بوونی خۆی، واتە بیانگۆڕێت بە كۆمەڵێک ئەكت و بە شێوە ڕووداوكردنێک كە لەڕێگەی گوزارشتی شیعری و هێزی دەربڕینەوە بەرهەم هاتبێت، وەک لە دەقی (عەسر/ تێبینی)دا دەڵێت:

**هیچ هەستێكم لە مێشكدا كۆ نەكردبووەوە**
**ئارەزووم بۆ پیاسەی دوای عەسرانی**
**شەقامی شەستی و گەڕەكە كۆنەكانی هەولێر جووڵا**
**دەستم خستە دەستی وچانی هەست**
**دەسكی دەرگای حەوشەم بادا...**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ٤١٩)**

ئەم دەربڕینەی کە لەمیانییەوە شیعرییەت لە ئاستی ناعەقڵانییەتی ناوەڕۆک و دیوی دەرەوەی دەقدا بەرهەم هاتووە، دەمانباتە بەردەم ئەو گریمانەی کە شاعیر ((هەرچەندە بەرەو ڕۆح بڕوات دەروونی لێی نابێتەوە بە ئازارەکانی خۆی ژوانی شاعیر ئاڵۆز دەکات و جارێکی دیکە بە واقیعەوە دەیبەستێت، کە ئەم حاڵەتەش هەبوو مرۆڤ زۆر بەکەمی وەچنگ دەکەوێت لە پێبڕینەکانی ڕۆح، چونکە ئاگایی بە تەواوەتی بەئاگا نییە.)) (**عەبدوڵڵا، ٢٠١٤، ١١١**) هەر ئەمەش وا دەکات شاعیر وەک کەسێکی پەژموردە و ڕۆح خرۆشاو بێتە بەرچاو.

**تەوەری دووەم/ شێوازی دەربڕینگەرایی لە نموونەی دەقەکاندا:**

لە ڕوانگەی ڕەخنەی دەربڕینگەرایییەوە شێواز مامەڵەیەکی دینامیکی نییە لەگەڵ زماندا، بەڵکو پتر وەک ((تاقیکردنەوەی نووسەرە لە چۆنێتیی هەڵبژاردنی زمانەکەیدا، واتە هەموو ڕواڵەتەکانی دەربڕینی زمانەکەی و چۆنێتی بەگەڕخستن و بەکارهێنانیانە.))(**هالبێرگ و دانەرانی تر، ٢٠١٨، ١٦٩**) هەڵبەتە ئەم شێوازەیەش دابڕاو نییە لە ئەزموونی خودی شاعیری ئێکسپریسۆنیست، بەوپێیەی کە لە هەموو کات و شوێنێکدا ئەزموون لە پەیوەندیدایە بە شێوازی ئەدەبییەوە، واتە ((شێواز بریتییە لە دەربڕینی شاعیر و نووسەر لەبارەی خودی خۆیەوە.)) (**مولینیة، ١٩٩٩، ٥٤**) ئێمەش لێرە بەدوا ئەم مامەڵەیە لە ڕوانگەی سێ لە سیماکانی شێوازی دەربڕینگەرایییەوە لە شیعری سەباح ڕەنجدەردا پراکتیزە دەکەین. هەڵبەت ئەم پراکتیزەکردنەیش لە هەردوو ئاستەکەی دەربڕینگەراییدا (عەقڵانی و ناعەقڵانی) لە دەقە شیعرییەکاندا لەلایەن شاعیرەوە ئەزموون کراوە.

**یەکەم/ زمانی تەلەگرافییانە:** زمان بەلای شاعیری دەربڕینگەراوە، زمانێکی تایبەتە، کە زۆرجار خوێنەر دەترسێنێت و ئارامیی خوێنەر تێکدەدات، بەشێوەیەک هەندێک جار ڕستەکان لە وشەیەک یان دوو وشە زیاتر نین، دەق پڕە لە نیشانەی سەرسوڕمان و هەرچۆنێک بێت

خاڵبەندیی ڕوونکەرەوە و دەرخەری پەشێویی نووسەر و شێواویی دەقە. (**شمیسا، ٢٠١٩، ٢٣٢. هەروەها: راغب، ١٩٧٧، ١٣٥**) خودی شاعیر لە مانیفێستێکدا، کە لەگەڵ دیوانی (خەون وا خۆی گێڕایەوە) لە ساڵی (٢٠٠٤) بڵاوی کردووتەوە، ئاماژەی بەم جۆرە لە شێوازی بەکارهێنانی زمان کردووە، بەڵام لەوێدا بە (ڕەگەزی کتوپڕی) ناوزەدی کردووە، ئەمەش بۆخۆی جۆرێک پەرتی و بایەخنەدانە بە یەکێتیی بابەت. (**مەنتک، ٢٠٠٩، ١١٦- ١٢١**) ئەم شێوازە لە بەکارهێنانی زمان لە ئەزموونی شیعریی شاعیردا هەر لە سەرەتاوە ڕەنگی داوەتەوە، وەک لە بەشی هەشتەمی دەقی (زێوان)دا بەرچاو دەکەوێت، کاتێک بە تەنها دێڕێک گوزارشتی لە بابەتێکی گەورەی وەک پرسی (جەللادبوون) کردووە و دەڵێت:

**گیانلەبەری دڕندە و جەللاد ئاوی تۆفانیان خواردووەتەوە**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب١، ٦٩)**

شاعیر لەڕێگەی فەنتازیای زمانەوە، توانیویەتی خەیاڵێکی فرەڕەهەند لە بۆتەی یەک دێڕە شیعردا کۆبکاتەوە، ئەمە بەدەر لەوەی دێڕە شیعرییەکانی تریش لە تەواوی پێکهاتەی دەقە درێژەکانی شاعیردا هەڵگری هەمان خەسڵەتی زمانی تەلەگرافیین، بۆیە ئەم جۆرە لە بەرکەڵکخستنی زمان لە چوارچێوەی تەکنیک و شێوازی شیعریدا و ((بەرجەستەکردنی ئەو جیهانە بەبێ خاڵ، بەبێ وێرگوڵ، بەبێ مەسافەی نێوان وێنەکان، بەبێ سپێتی، بەبێ پەنجەرە و دەرگا، جیهانێکی سیخناخە بە خودی خۆی.)) (**مەلا، ٢٠١٩، ١٣٦**) واتە بە خودی شاعیر خۆی، هەروەک لە (ساڵی سفر)دا بەر زۆرێک لەم شێوازە دەکەوین:

**لە هەموو شوێنێک کوشتن و خۆکوشتن و هەناو سووتاندن هەیە**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٢٠٦)**

هەڵبەتە شێوازە دەربڕینگەراییەکەی ئەم دێڕە شیعرە، جگە لەوەی لە ئاستی زماندا دەردەکەوێت، هاوکات دەستبەرداری ئەو کەشە

شـیعرییە ڕاسـتەوخۆیەش نـەبووە، کـە دەیـەوێت ئـەوە بـە خوێنـەر بگەیـەنێت، ئـەم سـەرزەمینەی بووەتـە لانکـەی مـرۆڤ، هـەموو شـوێن و کـونجێکی هاوشـێوەی یەکـە و هـەمان دۆخـی (کوشـتن، خۆکوشـتن و هەناوسووتاندن)ی تێدایە، سەرجەم ئەمانەش ئاماژەن بۆ ئەو نیگەرانی و پووچێتییەی لە ژیاندا مرۆڤ ئێخەگیری بووە.

**حەوت جۆگەلە لەیەکتر نزیک بوونەوە بۆ مەلەوانیی بێچووە مراوی**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٢٠٦)**

ئەمـــە دەرخـــەری ئـــەو ڕاســـتییەیە، کـــە زمـــان لەڕوانگـــەی دەربڕینگەرایییـەوە ئامرازێکـە بـۆ گوزارشـت لـەو پەسـتان و گوشـارە ناوەکییـەی کـە هـوروژمی بـۆ سـەر دەروونـی شـاعیر هێنـاوە، هێـزی ئەمەش لەو ڕوانگەوە هەڵدەهینجێنن، کـە ((مـرۆڤ یەکـەم جـار بـەهرەی دەربڕینـی تێدا ئاشکرا بـوو، لـە خانـەی شیعردا جێی کردووەتـەوە، بـۆ مانەوەشـی لـەم خانـە پیرۆزکراوەیـدا هەمیشـە قوربـانی لـە ئـەژمار نـــەهاتووی داوە و هێڵـــە ئەفســـوونییەکان و چـــالاکیی درێـــژ کردووەتەوە.))(ڕەنجدەر، ٢٠١٣، ٧٧) ئەوەتا شاعیر دەڵێت:

**بەهەشت دڵبەرێکە جوانییەکی سادە و گەرم و پڕ جووڵەی ڕژاندووە**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٤٠٨)**

ئـەو تەلەگرافیبوونـەی زمـانی شـیعریی بـەلای ڕەنجـدەرەوە، لـەو ڕوانگەوە سەرچاوەی گرتووە، کە پێیوایە ((شـیعر لـە منداڵدانی زماندا گیـانی دێتەبــەر و هێـزی ڕاسـتەقینەی شــاعیر لــەو زمانەدایــە، کــە شیعرییەتی تێدا ئاشکرا دەکات، نەک لەو زمانەی ژیانی ڕۆژانەی پێ بــەڕێوە دەبــات.)) (سـدیق، ٢٠١٧، ١٣٦) دیســانەوە شــاعیر لــەم دەلاقــەوە بەشـێوەیەکی هەمیشـەیی لـە خـەمی ئەوەدایـە زمـان بباتـە ئاسـتێکی ئەوتۆوە، کە تێیدا شێوازی ئەزموونکراوی خۆی بـەیان بکات، ئەمـەش چونکـە ((زمـان ڕۆڵێکـی کاریگـەری لەسـەر بونیـادی عـەقڵی و فیکـری بەجێـدەهێڵێت، لــەناو خــودی زمانــدا خــەیاڵ و تــەکنیک و ئیســتاتیکا بەردەوام ئامادەگی هەیە.)) (عەسکەر، ٢٠١٧، ١٩٤)

**دووەم/ ڕاشـــكاوی لـــە مەبەســـت و ئـــازادی لـــە دەربڕینـــدا:**
دەربڕینگـەراكان بـەدوای وشـەگەلی جـوان و دەگمەنـەوە نـین، بـەڵكو هەوڵدەدەن ڕاستەوخۆ لە دڵی حەقیقەت بدەن و قسە لـەبارەی پەشێوی و كارەسـاتەكان بكـەن. **(شمیسـا، ٢٠١٩، ل٢٣٢)** لێـرەوە لـە ئـەزموونی ڕەنجـدەری شـاعیردا لەگـەڵ چەنـدین دەق و كۆپلـە و دێـڕە شـیعردا بـەرخورد دەكـەین، كـە لـە دەربڕینـدا ڕاشـكاوییان وەک تایبەتمەنـدی هەڵگرتووە، هەڵبەت كە دەڵێین (ڕاشكاوی) مەبەست ئەوە نییە، كە ئیدی زمـانی شـیعری هاتبێتـە ئاسـتێكی ئاسـاییەوە، بـەڵكو مەبەسـت ئەوەیـە شاعیر ڕاشكاوانە كار لەسەر بنەما ئیستاتیكییەكان دەكات، بە مانایـەكی تر شیعر دەبێت بە ((ئاشكراكەری سیحر و نهێنییەكانی فیكری ئینسان)) **(عەســكەر، ٢٠١٧، ١٩٥)** پێــوە دیــارە، هــەروەک لــە دەقــی (حیكمــەتی ڕۆشنایی)دا دەڵێت:

**سەرەتا كە هاتە لام**

**من بە نیازی خەونبینین چووبوومە سەر تـەختی نوسـتن و گڵـۆپی خـەوم داگیرساندبوو**

**هەوا بە جۆرێک خۆش ببوو سەرپۆشی نەدەویست**

**بۆن و بەرامەی كەشی ژوورەكەی گۆڕی**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٤١٣)**

بـەم شـێوەیە ڕەنگدانـەوەی ئـەم بنەمایـە نـەک هـەر لـە شـیعری شـاعیردا، بـەڵكو لـە گوزارشـتیش لـە شـێوازی بەرهـەمهێنانی شـیعر بەلایەوە بەڕوونی هەستی پێدەكرێت، هەروەک خودی شاعیر خۆی لـەم بارەیەوە دەڵێت: ((من باوەڕم بە ئازادی و ئازادیی وشـە هەیـە. ئەمـەش هەڵبژاردەی منە بۆ ژیان و ناسـینی مرۆڤ و ئـەو بوونەوەرانـەی لـەناو شـیعرەكانمدا زینـدوون. شـیعر لـەبارەی هـەموو شـتێكەوە دەپرسـێت و كات و شوێنیشی بۆ نییە.)) **(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ٣)** پرسیاری شیعر لـەبارەی هـەموو شـتێكەوە و بـەبێ بـوونی هـیچ كـات و شـوێنێكیش، واتـای ئـەوە دەگەیـەنێت، كـە دەربڕینـی ڕاسـتەوخۆ و ڕاشـكاو بـەلای شـاعیرەوە

پێگەیەکی تایبەتی دراوەتێ، بەومانایەی ئەوەی دەبێت بە جێی مەبەستی شاعیر و ئەوەی شیعر کاری لەسەر دەکات بریتییە لە ((گەڕان بەدوای دونیا نەبینراوەکان و شتگەلە نەبینراوەکان، ئەو دێت کار لەسەر نهێنییە زیهنییەکان دەکات، نەک ئەوەی ڕۆژانە مومارەسەی بکەیت و دواجار بینووسیتەوە.)) **(عەسکەر، ٢٠١٧، ١٩٤)** ئەوەتا لە شیعری (باوک و دایکم)دا هاتووە:

**١٩٦٣/٦/١٣ حەرەس قەومی**
**قۆنداغەی تفەنگیان**
**لە سینگی سابیر حەسەن سلێمان شکاند**
**خوێن لە فاتەڕەشەی بەربوو**
**تلایەوە و بەسەر سەردا گینگڵی دا**
**تەمەن و ژیانی بووە پرتەقاڵێکی خۆرکەلێدراو**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٤١٥)**

ئەوەی کە بەم زمانە ڕاشکاوە لەبارەی ڕووداوێکی مێژووی ژیانی باوکی خۆیەوە دەدوێت، دەرکردنە دەرەوەی شیعرە لە شوێن و کات، کە دەیبەستنەوە بۆئەوەی نەتوانێت لەبارەی هیچ شتێکەوە بپرسێت، ((واتە کات و شوێن نابنە دەربڕینێکی ماناخوڵقێنی زانراو لە یادەوەریماندا، بەڵکو کات و شوێن تەنها دەبنە حاڵەتی ساتی نووسین.)) **(ئەحمەد، ٢٠١٠، ١٢)** ئەم ئازادییە لە هەڵبژاردنی وشە و بەکارهێنانی لە بۆتەی شیعردا بەو شێوە ڕاشکاوە، دەمانگەیەنێت بەو بڕوایەی کە ئەوە زمان و مەعریفەی ئێمەیە دەتوانێت ئەو سیحرە لە سادەبوونەوەی زماندا بدۆزێتەوە، چونکە هەموو قسەکردنێک شیعرییەتی تێدایە، بەڵام ئەوە شاعیری بەتوانایە، دەتوانێت ئەو قسەیە بکات بە شیعر، هەروەک ڕەنجدەر ئەم تایبەتمەندییەی لە شیعری خۆیدا ڕسکاندووە، ئەوەتا لە دەقی (دوا شوێن)دا دەڵێت:

**بە درێژایی ژیانم ئاوی بن کووپەیەکم خواردەوە**
**مەیلی زۆرم دایە ڕوونیی ئاوەکە**

**بەرگەم نەگرت و هەردوو چاوم لە دەست دا**

**ڕووناكی داوای لێبووردنی نەكرد**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٤٦٨)**

ئەم سادەییە لە دەربڕیندا هاوكاتە بە قووڵی لە ڕسكانی واتا، بۆیە زەین و بیری شاعیر ڕووبەڕووی لەدەستدانی هۆگربوون بە شوێن دەبێتەوە، هەرئەمەش وا دەكات لەوەی تێكستەكە ئازاد بێت لە هەموو كۆتێكی نارەوا، كە ڕێگە لە دەربڕینی ڕاستەوخۆیی و ڕاشكاوێتیی شاعیر بگرێت، كەواتە وردبوونەوەی زیاتر لەو كۆپلەیەی سەرەوە، ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت، كە ((ئەمانە كۆمەڵێك ڕستەن هەوڵدەدەن شتێك لە شیعرمان بۆ شی بكەنەوە، واتە بمانخەنە بەردەم ئەو گریمانەیەی كە شیعر شتێكە ناتوانین بیپێوین، ئێمە بەدوای مۆتیڤێكدا دەگەڕێین، كە هێڵەكانی لەناو ئەندێشەدا چووبێتە خوارێ.)) **(محەمەد، ٢٠١١، ٨٣)** ئەو ئەندێشەیە هیی ئێمەی خوێنەرە و مۆتیڤەكەش هەمان ئەوەیە، كە شاعیر بەرهەمی هێناوە و لە چێوەی زماندا گیانی وەبەرخستووە.

**سێیەم/ ئەزموونی مرۆڤی تاك و تەنیا:** بەوپێیەی یەكێك لە ڕایەڵەكانی هەر شێوازێكی ئەدەبی و شیعری پەیوەستە بە ئەزموونی خودی شاعیر و نووسەر خۆیەوە، بۆیە لێرەدا (ئەزموونی مرۆڤی تاك و تەنیا) وەك بەشێك لە شێوازی دەربڕینگەرایی لای سەباح ڕەنجدەر ئاماژە پێدەدەین. بەگشتی شیعری دەربڕینگەرایی بەشێوەیەك بابەتەكان دەنوێنێتەوە، كە ئەزموونی (مرۆڤێكی تاك) یان (تاكێكی تەنیا)ی پێوە دیارە، كە لە كۆمەڵگەی شارستانی و تەكنەلۆژیك و پیشەسازانەی هاوچەرخدا بەتەواوەتی تەنیایە و تووشی مەترسی هاتووە. لە ڕوانگەی ئەم نووسەر و هونەرمەندانەوە ئەم كۆمەڵگایە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پتر لە ئاژاوە و پشێوی نزیك دەبێتەوە. **(سەجادی و مەحمودی، ٢٠٠٤، ل٣١)** بەم شێوەیە بوون بەگشتی لە دەربڕینگەراییدا دەبێتە درێژكراوەی گیان و

دەروونی هونەرمەند و هەر خۆیشی دەبێت بە سەنتەری گەردوون. **(بیزیو، ٢٠١٠، لینک)** هەر بەم پێودانگە شاعیر لە تێکستی (بێپەروایی گوڵەستێرە)دا دەڵێت:

**بێپەروا بۆنی ئەو ڕووناكییە هەڵدەمژین كە بەخشندەیە**
**بەخشندە پەروایی دەبەخشێت و بێپەروا دەچینە ناو ڕێگا**
**دەنگی باڵندەی تاك و جووت**
**بە شێوەی مۆسیقایەكی ئاسمانی بەسەر ژاوەژاودا زاڵ دەبێ**
**بە هێمنی دێتە ژوورەوە**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٣٤٣)**

لێرەدا سەرنجی ئەوە دەدەین، تەنیایی و تاكایەتی نەك هەر لە شیعردا، بەڵكو لە تەواوی ئەزموونی ژیانی سەباح ڕەنجدەردا ڕەنگی داوەتەوە، هەروەك خۆیشی لەم بارەیەوە دەڵێت: ((من بە سروشتی ژیانی خۆم حەزم لە تەنیایی و كەمدوویی و كەمێك دووركەوتنەوەیە لە خەڵك، بەڵام لە چۆڵایی بەرزەین و هەستەكانم پڕ كردووە لە خەڵك و ئاژەڵ و گیاندار و پەلەوەر... تاد.)) (ڕەنجدەر، ٢٠١٣، ٢٢) هەڵبەت شاعیر ئەم هەڵوێستەیشی لە ژیاندا لەخۆڕاو بێ ئامانج نییە، ئەو بەوریاییەوە هەنگاوەكانی خۆی دیاری دەكات، بۆیە دەزانێت ((لە تاكیدا نووسەر لە هەقیقەتی ژیان دەپرسێت و سەربەخۆیە، سەربەستیی تەواوی لە جۆری بیركردنەوە و خۆدەربڕیندا دەست كەوتووە، ویژدانی لە بڕیاری گوتن و هێزی شێوازدا ئاسوودەیە، سەرچاوەكانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ئازادی و ئازادییەی خۆی بە خۆی داوە.)) **(ڕەنجدەر، ٢٠١٤، ٢٨)** ئەوەتا لە دەقێكدا بە ناونیشانی (بەرزبوونەوەی گەسكێك تا ئەوپەڕی مان) شاعیر دەڵێت:

**بە ئەسپایی دەژیم و گوێ لە دەنگی ژیانگرتن**
**لەنێوان ڕەگی نادیاری ڕووەك كە گرێی هەزار و یەك لك دەكاتەوە**
**مەستبوون لە گۆزە ڕۆیشتن نییە گەڕانەوەیە**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٤٥١)**

هـەڵبژاردنی تـەنیایی بـەلای شـاعیرەوە تـا ئـەو ڕادەیـە دەبێـت بـە پرۆژە لـە بەرهـەمهێنانی شـیعردا، کـە تەنانـەت ئـەوەش ڕەت دەکاتـەوە، خۆی بداتـە پـاڵ هـیچ دەسـتە و گـرووپ و تاقمێک و دەڵـێت: ((نـابم بـە دامـاوی هـیچ شـێواز و گرووپێـک، سـەردەمی گـرووپ و قوتابخانـە شـیعرییەکانیش بەسـەرچوون، ئێسـتا سـەردەمی شـاعیری تاکـە.)) (ڕەنجدەر، ٢٠١٣، ٣٨) ئەم تێڕوانینە لەو ڕوانگەوە سەرچاوە دەگرێت، کە پێی وایە شیعر لەنێو هەناوی بوونەوە دێتە دەرەوە و دەبێتە ساباتێک و چالاکییـە خودییـەکانی تێـدا یاداشـت دەکرێـت. (سـدیق، ٢٠١٧، ١٣٨) هەروەک لە شیعری (بەرزبوونەوەی باج)دا دەڵێت:

**منی نەرگسی بە دوای خۆمدا غارم دا و دوورکەوتەوە**

**نزیکە دەبێتە خاڵێک و لە ئاسۆ پشتەوشکێن دەبێت**

**خاڵی ڕوومەتی سێو ڕەنگ لە ئاوێنەی ڕوونی بەرهەتاودا بەرپا دەکات**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٣٥٧)**

لەم دەرکەوتنە شیعرییەدا، شاعیر تەنیایی خۆی دەکات بە کانییەک بۆ لێوەهەڵقوڵینی جوانییەکان، واتە خۆی ڕادەستی واقیعەکە ناکات و دەیەوێت لەڕێگەی ئەزموونی ناوەکیی خۆیەوە بگات بەو حەقیقەتەی کە بەدوایدا دەگەڕێت، ئەویش حەقیقەتی نەسرەوتنە لەسەر یەک وەڵامی کۆتایی، چونکە لەڕاستیدا ((شاعیران نازانن کۆتایی چییە، لەناو هەر کۆتاییەکدا سەرەتایەک دەدۆزنەوە، لەناو هەر دابڕانێکدا سۆسەی پێکگەیشتن دەکەن.)) (عەبدوڵلا، ٢٠١٤، ١١٤) هەربۆیە کاتێک ئەم کۆپلەیە لە دەقی (دووبارەکردنەوەی ویست) دەخوێنینەوە:

**ژیان لەگەڵ مردن دوژمن نییە**

**یاقووتی ئەنگوستیلەی**

**پەیام لەسەر نووسراوم لە ژیان دۆزییەوە**

**پاشان لە مردنیش دۆزیمەوە**

**زانیم چیم کرد و سووری دۆزینەوە**

**شکۆ دەنەخشێنێ و دەبەخشێ**

**(ڕەنجدەر، ٢٠١٨، ب٢، ٤٧)**

ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە شاعیر ژیان و مردن بە دوژمنی یەکتر دانانێت، بەڵکو ئەو وەکو (سووڕی دۆزینەوە) لێیان دەڕوانێت، بەڵام دیارە ئەم سووڕەی نێوان ژیان و مردن پێویستی بە مرۆڤی تاک و تاکی تەنیا هەیە، بۆئەوەی بتوانێت لەو نێوەندەوە بگات بە مانای تەلیسماویی شیعر، چونکە ((ئەوکاتە مانا دەتوانێ ببێتە شیعر ئەگەر مانایەکی سیحرئامێز بێت.)) (**پاڵەوان،٢٠١٠، ٨١**) لەپاڵ هەموو ئەمانەشدا ئێمە وەکو وەرگر/ خوێنەری دەق ((پێویستمان بەو کەرەستانە هەیە، کە دەمانەوێت گوزارشتی لێوەبکەین، کە زمان دەتوانێت ئەو نێوەندەی تێرامانە بێت، بۆئەوەی بتوانین ئەندێشە کامڵ بکەین، پێویستمان بە خەسڵەتەکانی ژیانە.)) (**محەمەد، ٢٠١١، ٨٣**)

**ئـەنجـام**

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا ئەم چەند خاڵەی لای خوارەوە، وەک گرنگترین ئەنجامەکانی توێژینەوەکە گەڵاڵە دەکەین، کە بریتین لە:

١. لـە سـەرەتاکانی سـەرهەڵدانیدا، دەربڕینگـەرایی لـە ئـەورووپا و دواتـر لـە تـەواوی جیهانیشـدا، بەشـێوەیەکی بـەرفراوان پێشـوازی لێکرا، دواتـر بـەرەو کـزی و لاوازی چـوو، لەگـەڵ ئەوەشـدا هێشـتا لەڕێگـەی توێژینەوەی زانستییەوە دەتوانین شوێنپێی ئەم ڕێبازە لـەنێو زۆر دەقی ئـەدەبی جیهـانی و ئـەدەبی کوردی بدۆزینـەوە، چونکە یـەکێک لـە بنـەما سـەرەکییەکانی دەربڕینگـەرایی، بریتییـە لـە کاریگـەریی ئـەو هێـز و وزە شاراوانەی کە لە ناوەوە گوشار دەخەنە سەر هەست و سـۆزی شـاعیر و بەرەو دەرەوەی خۆی مانیفێستیان دەکات، ئەمەش بنەمایەکە هـەموو دەقێکی زیندوو پێویستی پێی هەیە بۆ ئەوەی بە تەواوەتی بخەملێت.

٢. سـەباح ڕەنجـدەر یەکێکـە لـە شـاعیرانی ئـەدەبی هاوچـەرخی کوردی، کە وێڕای ئەوەی ئەزموونێکی شیعریی خاوەن جیاوکی تایبـەت بەخۆی هەیـە، هاوکات بنـەما و سیماکانی دەربڕینگەرایی بەشـێوەیەکی بەرچاو لە دەقەکانیدا بەرجەستە دەبن، لەمەشـدا شـاعیر توانیویـەتی لـە هـەردوو ئاسـتی دەربڕینگـەرایی عـەقڵانی و دەربڕینگـەرایی ناعەقڵانیـدا دەقەکانی خۆی بەرجەستە بکات.

٣. لەڕوانگەی هەردوو ئاستەکەی دەربڕینگەراییـەوە، هەریـەک لـە چەمکـەکانی شـێواز و شـیعرییەت ڕەهەنـدی جیاوازیـان لـە پانتـایی دەقەکانی شاعیردا وەرگرتووە و ڕەنگیان داوەتـەوە، ئـەم ڕەنگدانەوەیـە زیـاتر لــە شــێوەی کۆمــەڵێک ســیمای تایبەتیـدا دەرکــەوتوون، کــە سـەرجەمیان لـە بنـەما شـەنگستەییەکانی دەربڕینگەراییـەوە دەسـتەبەر کراون.

٤. سـیماکانی دەربڕینگـەرایی لای (سـەباح ڕەنجـدەر) لـە هـەردوو ئاستی ڕوخسار و ناوەڕۆکدا سەرنج دەدرێن، بەڵام مامەڵەی شاعیر بـە جـۆرێکی ئەوتۆیـە، کـە توانیویـەتی تـەواوی دەرکەوتـەکانی ڕێبازەکـە

لەسەر هەردوو ئاستە ناسراوەکەی دەربڕینگەرایی، ئاوێتەی ئەزموونە شیعرییەکەی خۆی بکات و بەمەش خوێنەری زیرەک بە توێژینەوەی زانستی نەبێت، بەئاسانی ناتوانێت هەست بەو تایبەتمەندییانە بکات، کە شاعیر لەڕێگەی لێهاتوویی خۆیەوە لە شیعرەکانیدا دەستەبەری کردوون.

## لیستی سەرچاوەکان

**یەکەم/ بە زمانی کوردی:**

- **کتێب:**


١. ئەلماضی، شکری عەزیز (٢٠١٠)، تیۆری ئەدەب، وەرگێڕانی: سەردار ئەحمەد گەردی، چاپی یەکەم، هەولێر، چاپخانەی ماردین.
٢. بۆرخێس، خۆرخێ لویس (٢٠١٦)، ئەم هونەری شیعرە، وەرگێڕانی: سەیوان محەمەد، چاپی یەکەم، سلێمانی، ناوەندی غەزەلنووس.
٣. پاڵەوان، سەلاح حەسەن (٢٠١٠)، شیعری کراوە لە ئەزموونی شیعری نوێی کوردیدا، چاپی یەکەم، هەولێر، دەزگای ئاراس.
٤. حاجی زادە، محەمەد (٢٠١٨)، فەرهەنگی ڕاڤەیی ئیزمەکان، وەرگێڕانی: سیروان موسا پوور، چاپی یەکەم، هەڵەبجە، کتێبخانەی هەژار موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە.
٥. حەمەئەمین، عەبدولقادر (٢٠١١)، ئەدەب و ڕێبازەکانی ئەورووپی- کوردی، چاپی یەکەم، سلێمانی، چاپخانەی پەیوەند.
٦. خۆشناو، هێمن عومەر (٢٠٠٩)، شیعرییەتی دەقی چیرۆکی کوردی- لێکۆڵینەوەیەکی شێوازگەری، چاپی یەکەم، هەولێر، وەزارەتی ڕۆشنبیری.
٧. ڕەسوڵ، وەهبی (٢٠١٣)، ئەبستراکت ئێکسپرێشنیزم لە نیگارکێشانی هاوچەرخی کوردستانی باشووردا، چاپی یەکەم، سلێمانی، خانەی وەرگێڕان.
٨. ڕەنجدەر، سەباح (٢٠١٣)، سێ کتێب لەبارەی شیعرەوە، چاپی یەکەم، سلێمانی، چاپخانەی بینایی.
٩. ڕەنجدەر، سەباح (٢٠١٤)، ئەزموون وەک ئاخاوتنێک لەناو ژیان، چاپی یەکەم، هەولێر، ئەکادیمیای کوردی.
١٠. ڕەنجدەر، سەباح (٢٠١٨)، دیوانی سەباح ڕەنجدەر، بەرگی دووەم، چاپی یەکەم، تاران، چاپخانەی تاران.
١١. ڕەنجدەر، سەباح (٢٠١٨)، دیوانی سەباح ڕەنجدەر، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، تاران، چاپخانەی تاران.

١٢. سدیق، ئارام (٢٠١٧)، زمان و شیعرییەت (کارکردن لەسەر ئەزموونی شیعریی یازدە شاعیری دوای ڕاپەڕین)، چاپی یەکەم، سلێمانی، ناوەندی ئەندێشە.
١٣. سەجادی- بەختیار، مەحمودی- محەمەد (٢٠٠٤)، فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، هەولێر، دەزگای ئاراس.
١٤. سەڕاج، عەبدوڵڵا (٢٠٠٨)، با لە هونەر بگەین، چاپی یەکەم، هەولێر، بەڕێوەبەرێتیی ڕۆشنبیریی ڕامان.
١٥. شمیسا، سیروس (٢٠١٩)، ڕێبازە ئەدەبییەکان، وەرگێڕانی: هیمداد حوسێن و سەنگەر نازم، چاپی یەکەم، هەولێر، ناوەندی ئاوێر.
١٦. عەبدوڵڵا، پێشڕەو (٢٠١٤)، ئەدەب- شێوەکاری- تیۆر، چاپی یەکەم، هەولێر، ئەکادیمیای کوردی.
١٧. عەسکەر، دانا (٢٠١٧)، ئەرگیومێنتی دژەکان، چاپی یەکەم، کەرکووک، ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی دیالۆگ.
١٨. ماکواری، جۆن (٢٠٠٢)، فەلسەفەی بوونگەرایی، وەرگێڕانی: ئازاد بەرزنجی، چاپی یەکەم، سلێمانی، دەزگای نەوا.
١٩. محەمەد، ئاوات (٢٠١١)، لێکدانەوەی شیعر و ئاماژەکانی پشتەوەی تێکست، چاپی یەکەم، هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری، بەڕێوەبەرایەتی بڵاوکردنەوەی هەولێر.
٢٠. موسا، هاوکار (٢٠١٩)، خەون لە شیعردا- لێکۆڵینەوەیەکی دەروونشیکارییە، چاپی یەکەم، سلێمانی، ناوەندی سارا بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە.
٢١. هاڵبێرگ، پیتەر و دانەرانی تر (٢٠١٨)، تیۆری ئەدەبی و شێوازناسی، وەرگێڕانی: ئەنوەر قادر محەمەد، چاپی سێیەم، سلێمانی، ناوەندی ئەندێشە.

- **گۆڤار:**

١. ئەحمەد، نەجات حەمید (٢٠١٠)، بنیاتە زمانەوانییە جوانکارییەکان لە شیعرەکانی هاشم سەڕاجدا، گۆڤاری هەنار، ژمارە (٥١).
٢. ڕەنجدەر، سەباح (٢٠١٣)، شیعر بەرانبەر ئەبەدییەت- مانیفێستی شیعری، گۆڤاری هەنار، ژمارە (٩٢).
٣. سدیق، ئارام (٢٠١٠)، شیعر و توانای پەنهانکردن لای سەباح ڕەنجدەر، گۆڤاری هەنار، ژمارە (٥٦).
٤. مەلا، ئەحمەد (٢٠١٩)، باجی جیانووسین ئەزموونی سەباح ڕەنجدەر، گۆڤاری سەردەمی نوێ، ژمارە (١).
٥. مەنتک، حەمە (٢٠٠٩)، شێوازی خەونیی لە مانیفێستی شیعری سەباح ڕەنجدەردا، گۆڤاری ئایندە، ژمارە (٨٥).

**دووەم/ بە زمانی عەرەبی:**

- **كتێب:**


١. الاصفر، عبدالرزاق (١٩٩٩)، المذاهب الادبية لدى الغرب مع ترجمات ونصوص لأبرز أعلامها، الطبعة الاولى، منشورات اتحاد الكتاب العرب.
٢. ترحيني، فايز (دون)، الدراما و مذاهب الادب، الطبعة الاولى.
٣. راغب، نبيل (١٩٧٧)، المذاهب الادبية من الكلاسيكية الى العبثية، الطبعة الاولى، القاهرة، الهيئة المصرية العامة للكتاب.
٤. رشدي، رشاد (٢٠٠٠)، نظرية الدراما من أرسطو الى الآن، الطبعة الاولى، الجيزة، هلا للنشر والتوزيع.
٥. طارق، قصي (دون)، الانطباعية أهم مدارس الحداثة، الطبعة الاولى، بيروت- لبنان.
٦. علوش، سعيد (١٩٨٥)، معجم المصطلحات الادبية المعاصرة، الطبعة الاولى، بيروت، دار الكتاب اللبناني.
٧. عياد، شكري محمد (١٩٩٣)، المذاهب الادبية والنقدية عند العرب والغربيين، الطبعة الاولى، الكويت، سلسلة عالم المعرفة.
٨. الفواز، علي حسن، الشعرية العراقية اسئلة ومقترحات للقراءة، الطبعة الاولى، سورية- دمشق، دار الينابيع للطباعة والنشر.
٩. مكاوي، عبدالغفار (١٩٧١)، التعبيرية في الشعر والقصة والمسرح، الطبعة الاولى، القاهرة، الهيئة المصرية للتأليف والنشر.
١٠. مولينية، جورج، الاسلوبية، ترجمة: بسام بركة، الطبعة الاولى، بيروت- لبنان، المؤسسة الجامعية للدراسة والنشر.
١١. ويليك، رينية (١٩٨٧)، مفاهيم نقدية، ترجمة: د.محمد عصفور، الطبعة الاولى، الكويت، سلسلة عالم المعرفة.


- **توێژینەوەی زانستی:**


١. محمد، سرور حسن (٢٠١٠)، ملامح سريالية في شعر أدونيس و صباح رنجدر – دراسة مقارنة– ، رسالة ماجستير، باشراف: د.لطيف محمد حسن، جامعة السليمانية، كلية اللغات، قسم اللغة العربية.


- **ئینتەرنێت:**


١. أحمد، رشا السيد (٢٠١٥)، السردية التعبيرية الشعرية (نقد في ولادة المدرسة السردية التعبيرية الشعرية العربية)، ٢٠١٥/٩/٤، http://www.shomosnews.com
٢. أحمد، عدنان حسين (٢٠١٣)، النزعة التعبيرية في الادب والفن (الذاتية المفرطة)، ٢٠١٣/١٢/٩، موقع العرب، https://alarab.co.uk

٣. بيرقدار، قحطان (٢٠١١)، التعبيرية، ٢٠١١/١/٦،
https://www.alukah.net/literature_language/0/28800/

٤. بيزيو، خالد (٢٠١٠)، التعبيريه نشأتها- تاريخها- خصائصها- الحركات الفنية التي أثرت بها- روادها وفنانوها، ٢٠١٠/١٠/٢٤، http://ugelmascara29.yoo7.com/t108-topic

٥. الحكيم، زياد (٢٠١٣)، ماهية التعبيرية، ٢٠١٣/١٢/٣،
http://www.mnaabr.com/vb/showthread.php?t=10815

٦. عابدين، سارة (٢٠١٩)، جاكسون بولوك كيف نقرأ لوحات التعبيرية التجريدية، ٢٠١٩/٢/٣٠، www.aljazeera.net

٧. عويد، عدنان (٢٠١٨)، المدرسة التعبيرية، ٢٠١٨/٧/٧، http://www.arabjo.net/?p=35991

٨. كحيل، أسماء (٢٠١٧)، المدرسة التعبيرية، أشراف: د.لينا القطان، ٢٠١٧/٤/١٦، https://artinarabic.com

٩. موسوي، أنور غني، وقعنة الخيال والتموج التعبيري في السردية التعبيرية، https://anwergani.wordpress.com

**سێیەم/ بە زمانی فارسی:**

- **کتێب:**

١. انوشه، حسن (١٣٧٤)؛ فرهنگ نامهء ادبی فارسی (دانش نامه ادب فارسی)، چاپ یکم، تهران، سازمان چاپ و انتشارات.

٢. سید حسینی، رضا (١٣٩٤)، مکتب های ادبی، جلد دوم، چاپ هجدهم، تهران، مؤسسه انتشارات نگاه.

- **ئینتەرنێت:**

١. رزایی، احسان (٢٠١٩)، مختصر تمام مکاتب ادبی جهان، http://www.cafe-dastan.ir

**چوارەم/ بە زمانی ئینگلیزی:**

1. E. Gordon (1987), Expressionism: Art and Ideas. New Haven: Yale University Press.
2. E. Krispyn (1964), Style and Society in German Literary Expressionism.
3. Furness , R. S. (1973), Expressionism. London: Methuen, 1973.
4. Gombrich, E.H. (1995). The Story of Art (16. ed. (rev., expanded and redesigned). ed.). London: Phaidon.
5. J. L. Styan (1983). Modern Drama in Theory and Practice: Volume 3, Expressionism and Epic Theatre. Cambridge University Press.
6. Oppenheimer, Lois (2000), The Painted Word: Samuel Beckett's Dialogue with Art. Ann Arbor: University of Michigan Press, 2000.

## ملخص البحث

## الملامح التعبيرية في شعر صباح رنجدر

يتناول البحث كيفية انعكاس ملامح التعبيرية كأحد المذاهب الادبية ذات القيمة الفلسفية التجريبية في أشعار الشاعر ، حيث يعطي الشاعر ضمنها للتجربة الشعرية بعدا ذاتيا ونفسيا. يتكون البحث من فصلين وخاتمة، ويتضمن كل من هذين الفصلين عدة محاور فرعية. فالفصل الاول يتناول الجانب النظري للموضوع ومن خلاله تم الحديث وبالايجاز عن تأريخ التعبيرية وأهم روادها، وبعدها يتم عرض للتعبيرية من حيث الاصطلاح الادبي وكذلك تم الحديث عن كل من ماهية وتعريف المذهب الآنفة الذكر. اما الفصل الثاني المعنون بـ(تجسيد سماة التعبيرية في الامثلة الشعرية للشاعر) فيتضمن الجانب التطبيقي من هذا البحث، وينقسم الى محورين أساسيين وهما: المحور الاول: التعبيرية في الامثلة الشعرية للشاعر من حيث مستوى شعرية النص والمحور الثاني جاء لدراسة التعبيرية من حيث مستوى اسلوبية النص. وتليها النقاط المستخلصة من البحث مع قائمة بالمصادر المختلفة وملخص باللغتين العربية والانكليزية.

## Abstract

This paper, entitled Expressionist Features in the Poetry of Sabah Ranjder, tries to tackle the reflection of the features of expressionism as one of the literary schools with philosophical and experimental values, the poet provides both subjective and psychological dimensions for poetic experience. The paper consists of two sections and a conclusion, each of these sections includes several sub-sections, the first deals with the theoretical frame, and briefly it concerns about the history of expressionism and its most important pioneers, followed by explaining the expressionism in terms of literary terminology accompanied by a definition of the mentioned doctrine (school).

The second chapter, entitled the embodiment of the expressionist characteristics in the poems of Ranjdar, contains the practical frame of the paper, and it's divided into two main sub-sections: the first elaborates on expressionism in the selected poems with regard to textual poetic level while the second sub-section studies expressionism in accordance with textual stylistic level. It ends up with the reached conclusions, works cited, and the abstract by both Arabic and Kurdish languages.

# دکتۆر ئەحمەد عوسمان ئەبووبەکر

## (١٩٣٠ - ٢٠١٤)

## ژیان و بەرهەمەکانی

**پ. د. ئازاد عوبێد ساڵح**
بەشی مێژوو– کۆلێژی ئەدەبیات– زانکۆی
سەلاحەددین – هەولێر

**پێشەکی**

نووسینەوەی مێژوو کارێکی گەورە و شکۆی گەل و نەتەوەیە، بایەخ پێدانی ئەرکی رۆڵە بەتوانا و لێهاتووەکانیەتی. لەم ڕووەوە مێژووی کوردیش وەک رەنگدانەوەی بارودۆخی سیاسیی نەتەوەکە، زۆر درەنگ بواری بۆ رەخساوە دەست بۆ ئەو کارە ببات.

یەکێک لەو مێژوونووسە ئەکادیمییە دیارانەی مێژووی کورد، (د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر)ە کە بەپێشەنگی دەستەی یەکەمی ئەم رەوتە دادەنرێت لەگەڵ هاوڕێکانی دیکەی.

ئەم مێژوونووسە بەزیرەکی و توانا و لێهاتوویی خۆی، بوونی خۆی سەلماندووە، لەم ڕووەوە تەرخانکردنی توێژینەوەیەکی سەرەتایی بۆ ژیان و بەرهەمەکانی بەپێویست زانرا، وەک ئەرکێکی مێژوونووسی کورد لەلایەک و وەک وەفا و مافێکی ئاسایی و سروشتی د. ئەحمەد خۆی، کە هەقی بەسەرمانەوە هەیە وەک مامۆستا و مێژوونووس لەلایەکی دیکەوە.

ئەم توێژینەوەیە لە سێ تەوەری سەرەکی پێکدێت: سەرەتا باس لە مێژووی بنەماڵەکەیی و هاتنە دنیای کراوە، پاشانیش پێگەیشتن و رۆشنبیری و لە سێیەمیشدا بەرهەمەکانی، کە ئەویش لای خۆی چەند سەرباسێکی لە خۆ گرتووە: لێکۆڵینەوە مێژووییەکانی، وتارە مێژووییەکانی، وەرگێڕانەکانی، خستنەڕوویی کتێبە مێژووییەکانی بەتایبەت مێژووی کورد، بەرهەمەکانی دیکەی بەزمانی کوردی و هەروەها بەزمانی ئینگلیزیش، دواتر پاشکۆ (لیستی بەرهەمەکانی).

لەم توێژینەوەیەدا: هەوڵدراوە کەڵک لە هەموو ئەو سەرچاوانە وەربگیرێت کە سەروکاریان بە بنەماڵەکەی و د. ئەحمەد خۆیەوە هەبووە، کە زیاتر لە نیو سەدە لە خزمەتی رۆشنبیریی کوردی بە گشتی و مێژووەکەی بەتایبەتیدا بووە، ئەوانەش چ وەک کتێب، گۆڤار، رۆژنامە، بەتایبەتیش سەرجەم بەرهەمە کۆکراوەکانی بەناوی (الاثار الکاملة للدکتور احمد عثمان) کە کار ئاسانییەکی زۆریان بۆ توێژەر کردووە.

سەبارەت بە ئاستەنگەکان، دەست نەکەوتنی دەقی نامە ئینگلیزییەکەی، چونکە ئەوەی بڵاوکراوەتەوە بەشێکی زۆر کەمە تەنیا (٣٢) ئەڵقەیە، هەروەها شوێنەوارە بەجێماوەکانی دوای کۆچی دوایی نازاندرێ چی هەیە یان نە. بە ئومێدی ئەوەی قەرزی سەرشانمان بەرانبەر پێشەنگێکی مێژوونووسی کوردی دابێتەوە.

**- بنەماڵە و لەدایکبوونی:**

د. ئەحمەد عوسمان لە بنەماڵەی (پیرەباو – پیرەباب)ییە لە تۆرەمەی باپیرە گەورەیان شێخ محەمەد –گرتک- ـە، ئەو یەکەم جار ئەو گوندەی بناری کێوی هەڵگورد، لە ناوچەی باڵەک ئاوەدان کردووەتەوە، پیاوێکی ئاین پەروەر بووە و مەرقەدی لە هەمان ئەو گوندەیە و خەڵک بە پیرۆزی دەزانن و زیارەتی دەکەن. سەرباری ئەوەی کە پلەوپایەی ئایینی هەبووە وەک شێخ، ئەوا زانایەکی ئایینیی شارەزا و ئاگاداربووە و هاوچەرخی شێخی باڵەکان[1] و ئیبن ئادەم[2] و شێخ شەرەفەدین بووە[3].. شێخ محەمەد لەگەڵ ئاژەڵان بەتایبەتی ئاسک (مامز) دۆست بووە، بۆیە خواردن و راوکردنی ئاسکی لە کوڕ و نەوەکانی حەرام کردووە، هەروەها ئەو پیاوە بڕوای بەیەکسانی بووە، نەیهێشتووە کەس ببێتە خاوەن زەوی لە گوندی گرتک، بۆیە خاوەنیەتی بۆ هەمووان بووە، تەنانەت هەموو زەوییەکانی کردووەتە موڵکی مزگەوت، خەڵک زۆر بڕوایان پێی بووە و لەو رووەوە چیرۆکی تایبەتی هەیە. (بێخاڵی ، ١٩٩٧، ل١٠٥).

سەبارەت بە بنەماڵەکەی د. ئەحمەدیش دەڵێت: بنەماڵەکەمان لە شێخانی باڵەکییە و (١٧٠) ساڵ دەبێت هاتووینەتە دەشتی هەولێر لە گوندی پیرداود و مەلازادە بووینە، واتە (مەلا)ش بوونە، لە بنەماڵەی پیرەبابی، دایکیشم خەڵکی ئەو دەشتەی هەولێرە و لە جووتیارەکانی مەخموورن. (دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)، ٢٠٠٧/٣/١؛ کاکەسوور،"مێژوو" (گۆڤار)، ژمارە (٤)، پایزی٢٠٠٧، ل٣٠٨ ).

مەلا محەمەد ناسـناوی (پیرەبـاو)ی هەبـوو، دوای کـۆچکردنی چـوار کـوڕی لە پاش بەجێ ماون بەناوەکانی (عیسـا، مەلا حەسـەن، مەلا عەبـدوڵڵا و مەلا بەکـر). (بێخاڵی، ١٩٩٧،ل١٠٦).

سەبارەت بە خزمایەتی ئیبن ئادەم لەگەڵ شێخ مـحەمەد، د. ئەحـمەد دەڵێـت: ئەوانە یان برا بوونە یان باوکی ئیبن ئادەم برای شێخ محەمەد گەورەی بنەماڵەکەمان بووە، ئەوەیان بە دروستی نازانم، بەڵام دەزانم خزمایەتیمان لەگەڵ ئیبن ئادەم هەیە، کە زانایەکی گەورەی رۆژگاری خۆی بووە. (کاکەسوور،"مێژوو" (گۆڤار)، ژمارە (٤)، پایزی ٢٠٠٧، ل٣١٢ ).

بێخـاڵی وتـارەکەی تـایبەت دەکـات بەبنەمـاڵەی مەلا ئەبـوبەکر، لەبەرئەوەی منداڵەکانی لە شاری هەولێر دەژین و لەگەڵ خەڵکەکەی بەشـداری تـاڵی و سـوێری و خۆشی و ناخۆشییان کردووە و نووسیویە: مەلا ئەبوبەکر کوڕی عیسـا[٤]، کـوڕی مەلا محەمەد پیرەباوییە، لەبەرئەوەی رووی لەناوچەی کۆیە کردووە و لە گوندی (گوزەرە) [گورزەیی] گیرساوەتەوە و بووەتە مەلای ئەو گوندە و خەڵکـی گونـدەکەش بەگەرمـی پێشوازییان لێکردووە و رێزی زۆریان گرتووە، هەر لەو گوندە خێزانی یەکەمی کـۆچی دوایی دەکات، خەڵکی گوندیش ژنێکی لەماڵباتێکی دیـاری گونـدەکە دەدەنـێ، بەڵام بەهۆی گوزەرانی ژیان مەلا ئەبوبەکر روو لە دەشتی هەولێـر دەکـات و لە گونـدەکانی (گردەسـۆر) و (قووچەبڵبـاس) مەلایەتـی دەکـات. مەلا ئەبـوبەکر لە ژنـی یەکەمـی کوڕێکی بەناوی (غەفوور) دەبێت و لە ژنـی دووەمیشـی سـێ کـوڕ و کچێکـی دەبێـت بەناوەکـانی: قـادر، مەحمـوود، عوسـمان و فـاتم، خـۆی منـداڵەکانی فێـری خوێنـدن کردووە، بەرلەوەی کۆچی دوایی بکات بە ساڵێک دەچێتە ماڵی خـوا و ئەو گەشـتەی نـۆ مانـگ دەخـایەنێ، بەپێـی یەکێـک لە بنەماڵەکەیـان مەلا ئەبـوبەکر لە دەوروبەری سـاڵی ١٩١٠ز کـۆچی دوایـی کـردووە. ئەوەی بـۆ ئێـرە گـرنگە مەلا عوسـمانی بـاوکی د.ئەحمەدە کە توێژینەوەکەمان لەبارەی ئەوە، مەلا عوسـمان لە سـاڵی١٩٠٠ز لەدایـک بووە. (بێخاڵی، ١٩٩٧ل١٠٦-١٠٧، بەرزی، ١٩٩٩، ل١٦٢ ).

لەدوای کۆچی دوایی باوکی، مەلا عوسمان دەچێتە گونـدی (پیـرداود) لەنزیـک هەولێر و دەبێتە سەرکاری ئاغـای گونـد و هەر لەو گونـدەش ژن دەهێنـێ و هەر دوو کوڕەکانی (حەمید و د.ئەحمەد) لێرە لەدایک دەبن. هەر بەپێی زانیارییەکانی بێخاڵی لەو گوندە لەگەڵ پیاوەکانی ئاغای گوند دووچاری مشتومڕ دەبن ، هەر بۆیە حەمیدی کوڕی بە بەرد لە سەری پیـاوی ئاغـا دەدات و برینـدار دەبێـت، بەهـۆی ئەو رووداوە،

ئاغا دەریاندەکات و مەلا عوسمان دێتە هەولێر لە ساڵی١٩٣٠، لە هەولێر دەست بەکاری کڕین و فرۆشتن دەکات پاشان لە قەیسەرییەی هەولێر دووکانێک دەکڕێ و خەریکی مامەڵەی بازرگانی دەبێت.(بێخاڵی، ١٩٩٧، ل ١٠٦ – ١٠٧).

د. ئەحمەد خۆشی ئەوە دووپات دەکاتەوە کە لەو ساڵەدا (١٩٣٠) هاتوونەتە هەولێرو بەقسەی دایک و باوکی تەمەنی سێ مانگ بووە و کۆچکی لە سەر بووە و سەرەتا لە گەڕەکی خانەقا نزیک مزگەوتی شێخ مستەفای نەقشبەندی دامەزراون. لە هەموو چاوپێکەوتنەکانی دووپاتی ئەو ساڵەی لەدایکبوونی کردووەتەوە. (دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)، ٢٠٠٧/٣/١؛ کاکەسوور،"مێژوو" (گۆڤار)، ژمارە (٤)، پایزی٢٠٠٧، ل٣١٢ ).

وەک د. ئەحمەد دەڵێت: لە تەمەنی چوار ساڵی بوو کە ئاو بە بۆڕی راکێشراوە لە هەولێر ، واتە ساڵی ١٩٣٤و کارەباشی لە تەمەنی (٦) ساڵی کە دەبێ ساڵی (١٩٣٦) بێت، بۆ هاتووە[٥]. لە تەمەنی پێنج ساڵی واتە لە ساڵی (١٩٣٥) دەگوازنەوە بۆ گەڕەکی تەیراوە ئەویش لەبەرئەوەی برایەکی بچووکی د. ئەحمەد جوانەمەرگ دەبێت و باوکی زۆری خۆشدەویست، لە خانەقا بار دەکەن. سەرەتا لە خانوویەکی بچووک بوونە، دواتر لە خانوویەکی گەورەتر دوای ئەوەی ژیان و گوزەرانیان باشتر بووە (کاکەسوور،"مێژوو" (گۆڤار)، ژمارە (٤)، پایزی٢٠٠٧،ل٣١٣ ).

بە بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی، کەلوپەلی خۆراک کەم بووە، بە پسوولە خۆراک و قوماش دابەش کراوە، بۆیە وێڕای کاری بازرگانی ، باوکی بریکاری کەلوپەلی تەموین وەردەگرێت، ئەویش لەڕێی برادەرایەتی د. ئەحمەد لەگەڵ کوڕی بەڕێوەبەری تەموین ، ئەمەش قازانجێکی باشی هەبووە بۆیان، ئەو کاتە د. ئەحمەد تەمەنی دەبێ (١٢) ساڵ بوویێت، چونکە دەڵێت لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم. کەلوپەلەکانیش کە دەدرا شەکر و چا و جۆرێک قوماش بووە (سپی) خامیان پێگوتووە.(کاکەسوور،"مێژوو" (گۆڤار)، ژمارە (٤)، پایزی٢٠٠٧، ل٣١٢، بیخاڵی ، ١٩٩٧، ل١٠٧).

مەلا عوسمان لە ١٩٨٥/١٢/٢٥ کۆچی دوایی کردووە و ئەو کوڕانەی لەپاش بەجێماون:

١_ حەمید: ساڵی ١٩٢٦ لەدایک بووە و بەشداری لە بزووتنەوەی نیشتمانی کردووە چەندین جار گیراوە، توانیویەتی لە گرتووخانەی (کوت) رابکات، نامیلکەیەکی بەناوی سەلیم سوڵتان لەبارەی (دۆزی کورد) نووسیوە و ساڵی١٩٦٩چاپ بووە و لە ساڵی١٩٩٣ کۆچی دوایی کردووە.

٢- د. ئەحمەد: لەو توێژینەوەیە لێی دەدوێین.

٣- د. سەلاح: لە ساڵی ١٩٤٤ لە هەولێر لەدایک بووە، بڕوانامەی دکتۆرای لە ئابووری وەرگرتووە.

٤- دڵشاد: لە ساڵی١٩٤٧ لەدایک بووە و چووەتە بواری سەربازی و بۆتە سەرهەنگ (عقید) لە سوپای عیراق، لە هەولێر دەژی.

٥- حازم: لە ساڵی ١٩٤٩ لەدایک بووە و کاری ئازاد دەکات، کەبابخانەی (سەفین)ی هەیە.

٦- عەبدولقادر: قەرتاسیەی هەیە.

٧- سەلام: لە ساڵی ١٩٦٠ لەدایک بووە و ئەندازیارە. (بەرزی، ١٩٩٩، ل١٦٢؛ بێخاڵی، ١٩٩٧، ل ١٠٧-١٠٩).

**ـــ پێگەیشتن و رۆشنبیری:**

لەو کاتەی ماڵەکەیان هاتووەتە هەولێر لە گەڕەکی خانەقا دامەزراون، د.ئەحمەد زۆربەی کاتی لەگەڵ منداڵەکان لەناو مزگەوت بەسەربردووە و لەو تەمەنە سیپارە هەڵدەگرێت و دەچێتە حوجرەی مزگەوت بۆ فێربوونی قورئان، تەنانەت باوکی پێچکەی دارینەی قورئانی بۆ کڕیوە تا لەسەری بخوێنێتەوە. هەر لەو تەمەنەدا لەگەڵ ئەحمەد نەقشبەندی لە دەرگای بچووکی قەڵا بەسەر قەڵا کەوتوون و لەدەرگای گەورە هاتوونەتە خوارەوە، پاشان بەرەو سەرا و گەڕەکی عارەبان شۆڕ بوونەتەوە ئینجا بۆ خانەقا و ماڵەوە، دوو سەعاتیان پێچووە، ئەو کاتە لە دەوروبەری سێ چوارساڵان بووە وەک خۆی دەڵێت. هەروەها رۆژانی هەینی شێخ مەلا رەشیدی مەلای مزگەوتی تەیراوە بەزۆری لەگەڵ خۆی بردووە بۆ مزگەوتی گەورەی سەر قەڵات و مەلای گەورەی لێبووە کە ئەوکاتە تەمەنی شێخ مەلا رەشید (٨٠) ساڵ بووە لە تەنیشت خۆی داناوە، تەمەنی د. ئەحمەدیش (٤) چوار ساڵان بووە، بە قەڵات هەڵگەڕاون و چوونەتە مزگەوتی گەورەی قەڵات و نوێژیان کردووە و پاشان گەڕاونەتەوە. (دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)، ٢٠٠٧/٣/١؛ کاکەسوور،"مێژوو" (گۆڤار)، ژمارە (٤)، پایزی٢٠٠٧،ل٣١٢ ).

لە ساڵی ١٩٣٧ لە تەمەنی حەوت ساڵی د. ئەحمەد بۆیەکەم جار چووەتە بەر خوێندنی رەسمی لە قوتابخانەی یەکەمی هەولێر (اربیل الأولی) کە ئەو سەردەمە بە حەوت ساڵی قوتابی دەچووە بەر خوێندن لە قوتابخانەی دەوڵەت، لە ساڵی١٩٤٣ لە

بەکەلۆریای سەرەتایی یەکەم بووە، ئەو رۆژگارە دەفتەری تاقیکردنەوەکان نێردراوەتە مووسڵ بۆ (تصحيحات) پاشان بۆ بەغدا. لەپاشان دەچێتە ناوەندی (دووەم— الثانية) لەو هەوارەشدا لە سێیەمی ناوەندیش یەکەم دەبێت، کە دەفتەری تاقیکردنەوەکان دەنێردرانە بەغدا، پاشان لە دواناوەندیش لەسەر هەموو هەولێر یەکەم دەبێت، لەگەڵ پازدە یەکەمەکانی سەر عیراق چادرگەیەکیان بۆماوەی پێنج هەفتە لە پێنجوێن بۆ دەکەنەوە و لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی مەعارف لە عێراق خەڵات دەکرێن، ئەوکاتە دواناوەندی دوو ساڵ بووە، ئەو سەردەمە پازدە یەکەمەکانی سەر عیراق نێردراونەتە دەرەوە بۆ خوێندن، د. ئەحمەد لەساڵی ١٩٤٨ لە زانکۆی ئەمریکی لە بێرووت وەرگیراوە. (کاکەسوور،"مێژوو" (گۆڤار)، ژمارە (٤)، پایزی٢٠٠٧، ل٣١٢؛ دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)، ٢٠٠٧/٣/١)

هاوڕێ قوتابییەکانی لە هەواری سەرەتایی ئەمانە بوونە: شێخ لەتیف، جەوهەر حوسێن، عەلی فەتاح، شێخ خالس جەواد، عەبدوڵڵا پاشا، محەمەد حوسێن مەلا، بیلال عەزیز، مەعرووف خەزنەدار، هونەر تاهیر و کەوکەز، هادی سەعید، زیوەر خەتاب و محەمەد شەهاب. مامۆستاکانیشی ئەمانە بوون: لە سەرەتایی: تاهیر عەبدوڵڵا رۆستەم، مامۆستای بیرکاری بووە و زۆر هانیداوە، نامیق ئەفەندی، یونس مستەفا، شیت نوعمان کە لە مامۆستا باشەکان بووە، بەڕێوەبەری قوتابخانەش عەبدوڵڵا عەزیز بووە، شێخ غەریبیش زۆر هانیداوە و هەندێ جار لێشیداوە، بەڕێوەبەرێکی پەرۆش بووە، سیروان، جیهاد، سوعاد ئەفەندی، زەکی باروخ و دانیال عوزێر قەساب. (کاکەسوور،"مێژوو" (گۆڤار)، ژمارە (٤)، پایزی٢٠٠٧،ل٣٠٨)

لە هەواری دواناوەندیدا د. ئەحمەد سەرۆکی کۆمەڵەی (لیژنەی) رۆشنبیری دواناوەندییەکەیان بووە لە هەولێر. (عثمان، الصوت الاخر (مجلة)، اربيل، العدد (١٩٨)، ٢٠٠٨/٦/٨ ).

هەموو هاوڕێکانی قوتابخانەی جەخت لەسەر زیرەکیی د. ئەحمەد دەکەنەوە[٦]. د. ئەحمەد لە تەمەنی (١٨) ساڵی لە زانکۆی ئەمریکی لە بەیرووت وەرگیراوە، وەک گەنجێک کە تا ئەوکاتە ئەوەندە لە ماڵ دوور نەکەوتووەتەوە، هەستی بە غەریبی زۆر کردووە کە لە کەسوکاری دوور بووە، تەنانەت هەندێ لە قوتابیان بەو هۆیەوە وازیان لە خوێندن هێناوە، بەڵام د. ئەحمەد توانیویە بەرگە بگرێ و کۆڵ نەدات و خوێندن تەواو بکات. (دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)،٢٠٠٧/٣/١،ل٦).

جێی ئاماژەیە هەر لەو سەروبەندەی کە لە بەیرووت بووە، لە چوار زانکۆی ئەمریکایی ئینـدیانا (Indiana)، ئێلینـۆی (Illinois)، ساوت کالیفۆرنیا ( South California) یۆتا (Yota)، قبووڵی بۆ هاتووە، بەڵام بەهۆی براکەی (حەمید) کە لەسەر سیاسەت گیراوە، دووچاری گرفت بووەتەوە و نەیتوانیوە بچێت و دووچاری بێ هیوایی بووە و دەوامی نەکردووە و ساڵێکی لەدەست چووە. لە ساڵی خوێندنی ١٩٥٠ — ١٩٥١ هاتووەتەوە هەولێر و لە دواناوەندی هەولێر وانەی گوتووەتەوە، دواتر بۆ خوێندن گەڕاوەتەوە و توانیویەتی بە (٥) ساڵ کۆلێژی ئاداب و زانستەکان تەواو بکات، ئەو سەردەمە مێژوو بەشێک بووە لە پەروەردە. جارێکی دیکەش بەهۆی گرتنی براکەی (حەمید) دەریانکردووە، تا لە ساڵی ١٩٥٤ خوێندنی تەواو کردووە. دیارە سەرچاوەی کێشەکان باڵیۆزخانەی عیراق بووە لە لوبنان، ئەگینا زانکۆی ئەمریکی لەگەڵی باش بوونە، بەڵام باڵیۆزخانە پارەی شایستەی خۆی بۆ خەرج نەکردووە و کێشەی بۆ ناوەتەوە و گرێبەستەکانی خوێندنیان وەستاندووە، هەربۆیە تا ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ نەگەڕاوەتەوە عیراق .(دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)،٢٠٠٧/٣/١،ل٦).

دوای تەواوکردنی خوێندنی کۆلێژ لەبەر هۆکاری سیاسی لە لوبنان دوو ساڵ ماوەتەوە و لە خوێندنی ئەهلی لە لوبنان وانەی گوتوەتەوە و دواتریش لە خوێندنی حکومەت لە سوریا بەردەوام بووە تا تەمموزی ١٩٥٨.(علی ، الصوت الاخر (مجلة)، اربیل، العدد (١٩٨)، ٢٠٠٨/٦/٨ ).

لە دیدارێکی دیکەدا دەڵێت چوار ساڵ لە لوبنان پەنابەر بووم، چونکە باوک و برام گیرابوون، لەبەرئەوەی ئەوکاتە حەمیدی برام سکرتێری حزبی شیوعی عیراق بوو.(دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)،٢٠٠٧/٣/١،ل٦).

هەرچەندە ئەو بەشی زانستی تەواو کردبوو، بەڵام د. ئەحمەد حەزی لە مێژوو کردووە و لێرە دەڵێ لە ساڵی ١٩٥٥ بەکالۆریۆسی وەرگرتووە[٧]. لەدوای ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بۆ ماوەیەکی کورت بووەتە بەڕێوەبەری رادیۆی کوردی لە بەغدا.(بابی لالۆ، ٢٠١٤، ل ١٥٢).

لەنێوان ساڵانی ١٩٥٩ — ١٩٦٠ گەڕاوەتەوە عیراق و لە قوتابخانەی ئامادەیی (النضال) بووەتە مامۆستا، پاشان بۆ وەزارەتی مەعاریف بە ناوونیشانی تێبینیار (ملاحظ) گوازراوەتەوە لە بەڕێوەبەرایەتی بروانامەکان دامەزراوە.(خەزنەدار، ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، (هەولێر)، ژمارە (٢١)، ٢٠٠٧/٤/١٩، ل ٣؛ العلاف، ب.د.س، ص٥٦٢ ).

لەدوای ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ دوو جار بۆ بەریتانیا ناوی دەرچووە، بەڵام لەبەرئەوەی لەوێ بۆ خوێندنی باڵا مامۆستای پسپۆڕ بە مێژووی کورد نەبووە، بۆیە ساڵێک ماوەتەوە، تا دواجار چووەتە یەکێتی سۆڤیەتی جاران (رووسیای ئێستا) کە لەو وڵاتەدا خوێندنی باڵای تایبەت بە مێژووی کورد هەبووە و لە ساڵی ١٩٦٠ بابەتی کارنامەی دکتۆراکەی لەژێر سەرپەرشتی پرۆفیسۆر دکتۆر خالفین تۆمارکردووە. (دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)، ٢٠٠٧/٣/١، ل٦؛ کاکەسوور،"مێژوو" (گۆڤار)، ژمارە (٤)، پایزی ٢٠٠٧، ل٣٠٨).

نامەی دکتۆراکەی بەناوی (بزووتنەوەی رزگاری نیشتمانی گەلی کورد ١٩٠٠ — ١٩٢٥، لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی — ئابووریيە) بووە، بۆ ئەوە لە ئەرشیفخانە و کتێبخانەکانی لەندەن بەدوای بەڵگەنامە و گۆڤار و رۆژنامەکانی وەک گۆڤاری کۆمەڵەی گەلان (League Nations Magazine)و رۆژنامەی تایمسی (The Times) لەو رۆژگارە گەڕاوە، تا لە ساڵی ١٩٦٥ نامەکەی تەواو کردووە و بڕوانامەی دکتۆرای وەرگرتووە و بەهۆی بارودۆخی سیاسیی عیراق لەو سەردەمە ساڵێکیش لە مۆسکۆ ماوەتەوە. د. ئەحمەد نامەکەی بە زمانی ئینگلیزی نووسیوە و (٤٥٠) لاپەڕەیە و هێشتا چاپ نەکراوە، بەڵام دوای گەڕانەوەی بۆ بەغدا، خۆی نامەکەی وەرگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی و لە رۆژنامەی (التآخی) کە پارتی دیموکراتی کوردستان لە بەغدا لە دوای رێککەوتننامەی ئاداری ١٩٧٠ دەریکردووە تا (٢٩) زنجیرەی لێ بڵاو کردووەتەوە[8]، بەڵام لەسەر قسەی جەرجیس فەتحوڵڵا کە ئەوکاتە وەک سەرنووسەری رۆژنامەکە بووە راگیراوە. (دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)، ٢٠٠٧/٣/١،ل٦؛ العلاف، ب.د.س، ص٥٦٢).

لەبارەی خوێندنی لە یەکێتی سۆڤیەت دوای ئەوەی لە پەیمانگای رۆژهەڵاتناسی سەر بە ئەکادیمیای زانستی سۆڤیەتی لە مۆسکۆ وەرگیراوە، کە تەنیا لەوێ لێکۆڵینەوەی مێژووی هاوچەرخی کورد هەبووە، بۆ ئەو سەخت بووە، چونکە دەبوا زمانێکی نوێ فێربێت و رۆشنبیری و شێوازێکی نوێی ژیان بوو، ئەوەش کاتی پێویست بووە، بەڵام ناچار بووە، چونکە لە هیچ شوێنێکی دیکە ئەو پسپۆڕییە نەبووە لەوێ دکتۆرای لە مێژووی نوێی کورد وەرگرتووە و نامەکەشی بەناوی (بزووتنەوەی رزگاریخوازی نیشتمانی گەلی کورد ١٩٠٠ — ١٩٢٥) وەرگرتووە. (العلاف، ب د.س ، ص ٥٦٢؛ علی ، الصوت الاخر (مجلة)، اربیل، العدد (١٩٨)، ٢٠٠٨/٦/٨ ).

دیاره کوردناسی رووسیا له ریزی پێشەوەی هەموو دەزگا کوردناسییەکانی ولاتانی ئەوروپا و ئەمریکا بووه، دەرفەتێکی باشی بۆ سەرکەوتن هەبووه، له دەورەی یەکەمی خوێندنی بالای قوتابیانی باشووری کوردستان که چووبوونه رووسیا، د. مارف خەزنەدار له ئەدەب، له دەورەی دووەم د. ئەحمەد عوسمان له مێژوو ئەوانەی چوونه له باکۆ و سان پترسبۆرگ و مۆسکۆ خوێندوویانه و تەواویان کردووه. (خەزنەدار، ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، (هەولێر)، ژماره (٢١)، ٢٠٠٧/٤/١٩، ل٣).

دیاره وێڕای زیرەکی د. ئەحمەد خۆی که بۆ خوێندنی بالا مەرجی سەرەکییه بۆ فێربوون و سەرکەوتن له نووسینەوەی نامەکانی خوێندنی بالا، ئەوا بۆ د. ئەحمەد زانایەکی دیار و دۆستێکی میللەتی کورد بووەته سەرپەرشتیاری نامەکەی ئەویش "نەفتوولّلاها روونۆڤیچ خالفین"ه که پسپۆڕێکی گەورەی مێژوو بووه، له لێکۆڵینەوەکانی بەرامبەر دۆزی کورد مەوزووعی بووه، سەبارەت به زیرەکیی د.ئەحمەد عوسمان، د. مارف ئاماژه بەوه دەکات که زیرەک بووه و بایەخی تایبەتی به هەموو وانەکان داوه و نمرەی باشی له هەموویان هێناوه، یەکەمی پۆل بووه و زۆر هۆگری کتێبی قوتابخانه بووه، هەمووی لەبەر کردووه، ئارەزووی زۆرترین نمره وەرگرتن و یەکەمبوون بووه، هەر بەو هۆیەوه یەکەمی سەر هەولێر بووه بۆ خوێندن نێردراوەته دەرەوەی عیراق له زانستگای ئەمریکی له بەیرووت. (خەزنەدار، ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، (هەولێر)، ژماره (٢١)، ٢٠٠٧/٤/١٩، ل ٣ ).

یەکێکی دیکه له هاوڕێکانی خوێندنی له مۆسکۆ، د. کاوس قەفتان (١٩٣٣ — ٢٠٠٨) لەبارەی د. ئەحمەدەوه دەڵێت: زۆر بەدەگمەن قسەی کردووه، "تاقه کەس بوو لەم جیهانەدا که زەردەخەنه لێوی نەئەکشان"، "د. ئەحمەد عوسمان یەکێکه له خوێندەواره هەره زیرەک و بەتواناکانی گەلی کورد. نه ئەبوو بێته ریزی مێژوونووسان، سالّی (کۆچی) بۆ (زایینی) تیۆرییەکی دۆزییەوه، له لەندەن داوایان لێکرد سەریان لێ بدات. ئینگلیزییەکەی بێ وێنه بوو له خوێندنەوه و تێگەیشتندا، پێویستی به قامووس نەبوو، بەخواستی خۆی زۆرباش خۆی فێری فەرەنسی کرد! گەلی کورد ئەگەر رۆژێک هات لەجیاتی (گەندەڵ ئاغا) رێز له زاناکانی بگرێ ئەبێ د. ئەحمەد عوسمان له سەرووی سەرەوه بێ". ( قەفتان، ٢٠٠٨، ل ٣٢٢ — ٣٢٣ ).

دوای گەڕانەوەی له یەکێتی سۆڤیەتی بۆ عیراق له زانکۆی بەغدا وەک مامۆستای مێژوو له کۆلێژی ئاداب دامەزراوه، چەندین بابەتی گوتووەتەوه لەوانه

مێژووی نوێی ئەوروپای بە زمانی ئینگلیزی، لە ساڵی ١٩٨٦ بووەتە پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە ساڵی ١٩٩٣ گەڕاوەتەوە شاری هەولێر و لە زانکۆی سەلاحەددین — کۆلێژی ئاداب — بەشی مێژوو دامەزراوە(العلاف، ب.د.س، ص ٥٦٣ ).

سەبارەت بە گوتنەوەی وانەی مێژووی هاوچەرخ، د. ئەحمەد ئاماژە بەوە دەکات کە زانکۆی بەغدا ڕێگربوونە لە گوتنەوەی ئەو وانەیە، بەڵام وانەی ئینگلیزییان داوەتێ.( دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)، ٢٠٠٧/٣/١،ل٦).

د. ئەحمەد عوسمان وەک پرۆفیسۆری یاریدەر لە رۆژی ١٩٩٣/٣/٩ بەغدای بەجێهێشتووە و هاتۆتەوە هەرێم و لە زانکۆی سەلاحەددین — هەولێر و لە ١٩٩٣/٣/١٤ لە بەشی مێژووی کۆلێجی ئەدەبیات دەستبەکار بووە و تا خانەنشین بوونی رۆژی ٢٠٠٦/١١/١ لەو بەشە خەریکی وانەگوتنەوە و بەشداری گفتوگۆ و سەرپەرشتی قوتابیانی خوێندنی باڵای کردووە (ماستەر و دکتۆرا).( أمر جامعي، نقل خدمات الصادرة من رئاسة جامعة صلاح الدين/ قسم الشؤون القانونية والإدارية/ الافراد المرقم (١١٨٢/٢/٤) في ١٩٩٣/٣/٩، امر اداري/ مباشرة المرقم (٨٢٩/٢/٤) في ١٩٩٣/٣/١٦ الصادرة من كلية الاداب — الافراد).

سەبارەت بە رەتکردنەوەی نازناوی پرۆفیسۆری لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا د. ئەحمەد دەڵێت: "لەبەر پیرۆزیی ناو و کاری پرۆفیسۆری رەتم کردەوە، چونکە خۆم بە شایستەی پرۆفیسۆری نەدەزانی خۆ پرۆفیسۆری گاڵتەجاڕی مندااڵن نییە، هەرکەسێک بە چەند ساڵێک و چەند نووسینێک ئەو پلەیە وەدەست خەن، بەدڵنیاییی دەڵێم لە رۆژهەڵات و بەتایبەتی لە عیراق ئەو لەقەبە نییە و هەموو ساختەیە، زۆرم پێ سەیرە ئێمە لێرە ناو لە خۆ بنێین پرۆفیسۆر کەچی مامۆستاکانی ئێمە لە زانکۆکانی رۆژئاوا هێشتا ناوونیشانیان یارمەتیدەری پرۆفیسۆر بێت..". ( دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)،٢٠٠٧/٣/١،ل٦).

د. ئەحمەد کە لە بەغدا هاتووەتەوە کوردستان لە شوقەکانی کۆلێژی یاسا بە سەڵتی ژیاوە و ماوەیەکیش چاوەکانی لەدەست دابوو تا نەشتەرگەری کردووە و سەرەنجام لە ٢٠١٤/١/٢٥ کۆچی دوایی کردووە، دوارۆژەکانی ژیانی براوەتەوە لای کەسوکاری، لە رۆژی پێنج شەممە ٢٠١٤/٣/٦ چلەیەکی زۆر هەژارانەمان لە هۆڵی یەعقوبی لە بەشی زمانی ئینگلیزی کۆلێژی زمان بۆ کرد. هەر لەو ماوەیەدا (سوپاسنامە)یەکی تایبەتی لەلایەن سەرۆکی زانکۆوە دراوەتێ سەبارەت بەو وتار و نووسینانەی لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی هەرێمی کوردستان بڵاوی کردوونەتەوە[٩]،

ئەمەش نیشانەی چالاكیی د. ئەحمەد دەردەخات. سەرپەرشتی (٦) نامەی ماستەر و (٦) كارنامەی دكتۆرای كردووە(علی ، الصوت الاخر (مجلة)، اربیل، العدد (١٩٨)، ٢٠٠٨/٦/٨ ).

لە دیدارێكدا د. ئەحمەد پرسیاری ئەوەی لێ دەكرێت كە بۆچی ژنی نەهێناوە؟ لە وەڵامدا دەڵێت كە لە ئەورووپا بووە بەنیاز بووە ژنی ئەورووپایی بهێنێت، بەڵام ئەگەر ژنی ئەورووپایی بهێنابا نەدەبوا بگەڕێتەوە عیراق و كوردستان، ئەویش هەر دەبوا بگەڕێتەوە، بۆ هێنانی ژنی وڵاتی خۆشمان، ئەو رای وایە لەو حاڵەتە دەبێ ملكەچی هەندێ داب و نەریتی كۆمەڵایەتی دواكەوتوو بیت، كە خۆی بڕوای پێیان نەبووە و وەك ئەكادیمی و كەسێكی پێشكەوتووخواز، بۆیە ئەوەشی نەكردووە. بۆیە لە وەڵامی پرسیاری ئەوەی كە پەشیمان نییە؟ دەڵێت: "وەك ئەوەی بەپێی ئەو بۆچوونەی كە خۆم هەمبوو و هەمە بۆم بگونجابا ژن بهێنم باشتر بوو، بەڵام ئێستاش دەڵێم ئەگەر ملكەچی منی تیادا با بۆ دابونەریتی دواكەوتوو ئەوا ژیانی ئێستایی خۆمم بە تەنیایی پێ پەسەندترە. هەرچەند زۆرجار بۆم گونجا ژن بهێنم و زۆر كەسیش لەگەڵم رێك دەكەوتن، بەڵام ئەوەی بەدەربوو لە شەریعەت و یاسا پێم پەسەند نەبوون جێبەجێیان بكەم و ئەوەش رای تایبەتی خۆمە". (دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)، ٢٠٠٧/٣/١،ل٦).

ئەوەی جێی تێڕامانە د. ئەحمەد گلەیی ئەوە دەكات كە لە ژوورێكی بچووك ژیان بەسەر دەبات كە وەك پێویست شایەنی ژیانێكی ئاسایی بۆ كەسایەتییەكی زانستی و خزمەتگوزار بەمێژووی میللەتەكەی لە كوردستانی ئازاد بەو مانایەی كە ئەو خێزاندار نییە بۆیە خانووی پێویستییان نەداوەتێ.( دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)، ٢٠٠٧/٣/١،ل٦).

لەمەدا د. مارف خەزنەداریش گلەییەكەی د. ئەحمەد بە رەوا دەزانێت، بە نەنگی دەزانێت نیو سەدە بە وانەگوتنەوە و نووسینی كتێب خزمەتی نەتەوەكەی كردووە، كەچی بەتەنیا لە ژوورێكی بچووك بژی و دەسەڵات ئاوڕی لێ نەداوەتەوە.(خەزنەدار، ئەحمەد عوسمان ئەبوبەكر، (هەولێر)، ژمارە (٢١)، ٢٠٠٧/٤/١٩، ل ٣ ).

- **كاری سیاسی:**

د. ئەحمەد عوسمان، وەك كەسێكی نیشتمانپەروەر، بەشی خۆی بەشداری لە كاری سیاسی كردووە، بەتایبەتی لە سەرەتای لاوێتییەوە وەك خۆی ئاماژەی پێدەكات،"بە كابرایەكی نیشتمانپەروەر ناسرابووم هەرچەند پێشتر لە ساڵی (١٩٤٢)

لە کۆمەڵی (حیزبی) هیوا بووم و بە شەپاڵ دەناسراین و ناوی نهێنیم (شێردڵ) بوو. هێشتا منداڵ بووین ئەنوەر محەمەدەمین دزەیی برای ئەحمەد حەمەدەمینی دزەیی بەرپرسمان بوو و خەڵکی گوندی دووگردکانن من و مارف خەزنەدار و خالس جەواد لە یەک شانەدا بووین، لەبیرمە ناوی نهێنی دکتۆر مارف (بەهۆش) بوو، لە ڕاستیشدا بەر لە هیوا کۆمەڵەیەکی بەرایی دیکە هەبوو ناوی (دارکەر) و ئەنجا پاشان بوونە (هیوا). ( دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)،٢٠٠٧/٣/١،ل٦).

بەڵام د. مارف خەزنەدار سەبارەت بەو لایەنەی د. ئەحمەد دەڵێت کە ئەوان "ئەندامی بەچکەشێرانی حیزبی هیوا" بوون، دیارە ئەمەش لەبەر کەمیی تەمەنیان بووە کە دوازدە، سێزدە ساڵی بوونە. ئەنوەر دزەیی، د. ئەحمەد و خالس و د. مارفی سوێند داوە وەک ئەندامی بەچکەشێرانی ڕێکخەری شانەکەشیان ناوی عەبدولقادر بووە خەڵکی سلێمانی بووە و ماڵیان لە هەولێر بووە و بە عەلی خشت ناسراوە، بە پیاسە و گەڕان و سووڕان لە دەوروبەری منارەی چۆلی کۆبوونەوەیان کردووە[١٠]. هاوخەباتێکی دیکەشی ئاماژە بەوە دەکات کە لەو قۆناغەدا جۆرە ڕێکخستنێکیان هەبووە، د. ئەحمەد و مارف عەبدولقادر (خەزنەدار)، عومەر گەردی، خالیس شێخ جەواد، زۆربەی جار لای منارەی چۆلی کۆبوونەوەیان کردووە[١١].

لە ساڵی ١٩٤٦ د. ئەحمەد لەگەڵ هاوڕێکانی خەڵکیان بۆ ئاهەنگی نەورۆز کۆکردووەتەوە و چوونەتە گوندی دووگردکان.( دیبەگەیی، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١٦)،٢٠٠٧/٣/١،ل٦).

بەپێی بەڵگەنامەیەکی نووسینگەی تایبەتی وەزارەتی بەرگری عیراق کە ناوی (٣٣) ئەندامی (حزبی رزگاری کورد)ی لقی هەولێری تێدایە، زنجیرەی ناوی ئەحمەد عوسمان (٢٠)ـە، هەر لەگەڵ خالیس شێخ جەواد و عەلی فەتاح دزەیی و ئەنوەر تاهیر و مارف خەزنەدار لە شانەیەکی حزبی تەحەڕووڕ (التحرر) بوونە بە سەرپەرشتی حەمید عوسمان.(خۆشناو، لیوای هەولێر لە دۆکیۆمێنتێکی ساڵی (١٩٤٦) "بەدرخان"، ژمارە (١١١)، ٢٠٠٩/٢/٨، ل ٣).

وێڕای ئەمە لە دوای لەسێدارەدانی چوار ئەفسەرەکە (عزەت عەبدولعەزیز، مستەفا خۆشناو، خەیروڵلا عەبدولکەریم و محەمەد قودسی) لە ١٩ی حوزەیرانی ١٩٤٧ لەبەر ئەوەی بەشداری کۆماری کوردستانیان لە مەهاباد کردبوو، د. ئەحمەد لەگەڵ مامۆستاکەی مووسا سەمەد دەچنە سەرگۆڕی خەیروڵلا عەبدولکەریم لە گەڕەکی تەیراوە و پاشان خۆپیشاندانێکی بچووک لە هەولێر کراوە و خوێندەوارەکان

بەشداربوونە، د. ئەحمەدیش بەشداری کردووە، دوای ماوەیەک یەکێک خوتبەیەکی کورتی داوە و کۆتایی هاتووە.(ابوبكر، دقائق صمت امام قبر الشهيد خيرالله عبدالكريم، ١٩٩٧، خەبات، العدد (٨٨٣)، ١٩٩٧/٧/١٧).

هەر لەو رووەوە د. ئەحمەد لە ساڵی ١٩٥٧ لەگەڵ کۆمەڵێک سیاسەتمەدار و قوتابی و زانا لەوانە جەلال تاڵەبانی (١٩٣٣ — ٢٠١٧)، قەناتی کوردۆ، هۆمەری دزەیی، قەدری جان، سەید عەزیز شەمزینی و چەندانی دیکە بەشداری لە کۆنگرەی لاوانی جیهان لە مۆسکۆ کردووە کە لە تەمموزی ١٩٥٧ بەستراوە (لە ئارشیفەوە، وێنەیەکی بەکۆمەڵی ئەو ناوانەیە کە د. ئەحمەدیشی تێدایە. (لە ئارشیفەوە "سلێمانی" (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە (٥٩)، حوزەیرانی ٢٠٠٥، ل ٥٠ ).

هەر لەرووی سیاسییەوە لەدوای راگەیاندنی رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ رۆژنامەیەک سەبارەت بەو رووداوە مێژووییە بۆ دەربڕینی بیروڕای خۆی پرسیاری لێ دەکات، لە وەڵامدا دەڵێت: سەرباری ئەوەی ئەمە بەرهەمی خەباتی دە ساڵەی دوایی گەلی کوردە، دەسکەوتێکی گەورەشە بۆ کورد و عەرەب و بەرئەنجامی خەبات و قوربانییەکی زۆرە، بۆیە پاراستنی یەک ریزیی هێزە عیراقییەکان و هەردوو گەلی عەرەب و کورد زۆر پێویستە و ئەمە یەکەم جارە عیراق لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەنگاوێکی وا دەهاوێت و هێنانەدی ئۆتۆنۆمی.(عوسمان، هاوکاری، ژمارە (١٣)، ١٩٧٠، ل٣).

د. ئەحمەد عوسمان هەر زوو چووەتە بواری نووسین و بڵاوکردنەوە، لەساڵی ١٩٥١ وتاری لەبارەی ناوچەی هەڵەبجەی بەناوی (مراسل) نووسیوە بۆ رۆژنامەی (صدى الاهالي)[١٢]. هەروەها لە لوبنانیش هەندێ وتار و نووسینی بڵاو کردووەتەوە. (ابوبكر ،٢٠٠٩، ص ٨ ).

- کارە ڕووناکبیرییەکانی:

لەلایەنی ڕووناکبیرییەوە، د. ئەحمەد وەک خۆی ئاماژەی پێکردووە، خاوەن بیرۆکەی دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد و زانکۆی سلێمانی بووە، بەتایبەتیش کۆڕی زانیاری کورد، لەبەرئەوەی دەرچووی ئەکادیمیای زانستی بووە لە مۆسکۆ، ئەوا هەر لەسەرەتای ساڵانی شەستەکان بیری دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کوردی لە هزر و بیر زرنگاوەتەوە، تا لە کۆتایی ١٩٦٩ پێشنیازی بۆ د. ئیحسان فوئادی هاوڕێی وانەبێژی کردووە لە زانکۆی بەغدا، کۆلێجی ئەدەبیات بیرۆکەکەیان گەیاندووەتە

کۆمەڵێـک زانـا و رووناکبیر وەک شـێخ مـحەمەدی خـاڵ، د. ئەورەحمـانی قاسـملو، بەدرخـان سـندی. یەکەمـین کۆبوونەوەیـان لە هـۆڵی (ئیـبن هەیسـەم) لە کـۆلێژی پەروەردەی جاران کردووە و تەنانەت وێنەیەکیشیان بۆ یادگاری بەو بۆنەوە گرتـووە. تـا رێککەوتننـامەی ئـاداری ١٩٧٠ هـاتووە، ئیـدی کـارەکە بەشـێوەیەکی دیـکە کەوتووەتەوە (ابوبکر، ذكريات عن تأسيس المجمع العلمي الكردي وجامعة السليمانية، خەبات، العدد (٨٧٥)، ١٩٩٨/٥/٢٢).

کە کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٠ دامەزرا، د. ئەحـمەد بەشـداری لە چالاکییەکـانی کـردووە و ئەنـدامی ئەو کـۆمەڵەیەش بـووە. بەشـداری لە کۆڕەکـانی کـردووە و کـۆڕی گێـڕاوە، لەوەش گرنگتـر د. ئەحـمەد ئەنـدامی دەسـتەی نووسـەرانی گۆڤـاری کـۆمەڵەی رۆشـنبیری کـوردی (رۆژی کوردسـتان) بـووە کە بە هەردوو زمـانی عەرەبـی و کـوردی دەرچـووە، سەرنووسـەرەکەی سـاڵح یوسـفی بـوو، یەکێک بووە لە گۆڤارە هەرە باشەکانی رۆژگاری دوای ئاداری ١٩٧٠ و دیارە بابەت و وتاری خۆشی تێدا بڵاوکردووەتەوە. ( شمس كردستان، العدد (١)، حزيران ١٩٧١، ص ٣٢؛ العدد (٨) مايس ١٩٧٢، ص ٢٤).

## ٦- (بزووتنەوەی رزگاری نیشتمانی گەلی کورد ١٩٠٠ – ١٩٢٥):

یەکێـک لە کـارە زانسـتییەکانی د. ئەحـمەد لە سـەرەتای کـاری، نووسـینی نـامەکەیەتی لەبـارەی (بـزووتنەوەی رزگـاری نیشـتمانی گەلـی کـورد ١٩٠٠ – ١٩٢٥) وەک لێکـۆڵینەوەیەکی سیاسـی ئـابووری، بە زمـانی ئینگلیـزی نووسـیوە "National Liberation Movement of Kurdish people 1900 – 1925" ئەم کارنـامەیە بە زمـانی عەرەبی کە د. ئەحـمەد خـۆی وەریگێـڕاوە بە زنجیـرە لە رۆژنـامەی "التـآخي" بـڵاوی کـردووەتەوە و (٤٥٠) لاپەڕەیە و وەک کتێـب چـاپ نەکـراوە، تـا (٣١) ئەڵـقەی لـێ بڵاوکـراوەتەوە، وەک خـۆی لە دیدارەکانـدا ئامـاژەی پێکـردووە، جەرجـیس فەتحـوڵڵا سەرپەرشـتی رۆژنـامەکەی کـردووە، رایگرتـووە. (شمـس كردسـتان، العـدد (٢)، تمـوز ١٩٧١، ص١٣؛ العدد (٧)، آذار ١٩٧٢، ص ١٦).

د. ئەحمەد عوسـمان نـامەکەی بەپاڵپشـتی سـەرچاوەی رەسـەن بە زمانەکـانی عەرەبی و کوردی و رووسی و فەڕەنسی و بەتایبەتیش ئەو کتێـب و چـاپکراوانەی بە زمـانی ئینگلیـزی نووسـیوە، بەگشـتی مەیـدانی کارنـامەکە کـورد و کوردسـتان لەنـاو دەوڵەتی عوسمانی گرتووەتە خۆ، پاشان تەسـک دەبێـتەوە بـۆ باسـکردنی باشـووری

کوردستان، لەگەڵ باسکردنی پرسی کورد لەڕووی جیاجیاوە، وەک خۆی دەڵێت بۆیە ئەو ماوەی هەڵبـژاردووە، چـونکە تـا سـاڵی ١٩٢٥ دابەشـکردنی کوردسـتان بەتەواوی دەچەسپێت.(ابوبكر، حركة التحرر الوطني للشعب الكردي ١٩٠٠ – ١٩٢٥، الحلقة الاولى، التآخي، العـدد (٢٥٨)، ١٩٧٠/٦/٩، ص ٢).

کارنـــامەکە لە چـــوار بەش و پێشـــەکییەک پێکهـــاتووە و ئەم ســـەرناوانەی لەخۆگرتووە:

بەشی یەکەم: دانیشـتوان: لەم بەشـەدا بـاس لە کـۆمەڵی کوردەکـان و هـۆز و کۆچەر و نیمچە کۆچەرەکان، دانیشـتوانی شـارەکان کـراوە، هەروەهـا چـۆنیەتی لێـک ترازان و هەڵوەشانەوەی هـۆز و چـۆنیەتی دەستبەسـەراگرتنی هەردوو ئیمپراتـۆریەتی عوسـمانی و ئێرانـی بەســەر کوردسـتان و ســەپاندنی دەســەڵاتی ناوەنـدی بەســەر میرنشـینە کوردییەکـان، لەگەڵ خســتنەڕووی بــارودۆخی نالەبــاری کــۆمەڵایەتی و ئابووری... چوونە سەر بابەتی کورد و شۆڕشە دەستوورییەکانی عوسـمانی و ئێرانـی تا دەگاتە سەر بـزووتنەوەی نیشـتمانی بەر لە شـەڕی یەکەم و دەرچـوونی ڕۆژنـامەی کوردستان ١٨٩٨ و پاشان دروستبوونی کۆڕ و کۆمەڵی کوردی و دەرکردنی گۆڤـار و ڕۆژنـامە بە زمـانی کـوردی (ابـوبكر، حركـة التحـرر الـوطني للشـعب ..، ح (٣١)، التـآخي، العـدد (٦٧٥)، ١٩٧١/٣/٣، ص ٢؛ ابـوبكر، ٢٠٠٩ ، ص ٢٤٧ – ٣٣٣؛ دیبگەیـی، سـەردان، هەولێـر، ژ (١٦)، ٢٠٠٧/٣/١، ل ٦).

بەشی دووەم: کوردستان لە شـەڕی یەکەمـی جیهـانی، ئەو شـەڕەی کە وێـڕای شـەڕ و کاوڵکـاری و ئەو زیـانە زۆرەی بە خەڵکـی کوردسـتان کەوت، کوردسـتان بە پەیمـانی نهێنـی لە سـاڵانی ١٩١٥ – ١٩١٦ دابەش و پـارچە پـارچە کـرا و هـاتنی ئینگلیز بۆ ناوچەکە و داگیرکردنی کوردستانی باشوور لەلایەن ئەو دەوڵەتەوە.(التآخي، العدد (٤٥٩)، ١٩٧٠/٦/١٠؛ ابوبكر،٢٠٠٩ ، ص ٢٤٩ – ٢٥٠ ).

بەشی سێیەم ئەم سەرناوانەی لەخۆگرتووە: باشووری کوردسـتان دوای جەنـگ و سیاسەتی بەریتانیا بەرانبەر بە باشووری کوردستان پاشان کێشەی موسڵ و دۆزی کورد. (ابوبكر، ٢٠٠٩ ، ص ٢٤٩ – ٢٥٠ ) .

لە بەشی چوارەمدا باس لە بزووتنەوەی نیشتمانی کـورد دوای شـەڕی یەکەمـی جیهان – تێڕوانینێک لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و بزووتنەوەی نیشتمانی لە کوردستانی باشوور دەکات. کارنـامەکە وەک گـوترا لە ڕۆژنـامەی (التـآخي) بە ئەڵـقە بڵاوکراوەتەوە، ماوەیەک ڕاگیراوە و جـارێکی دیـکە دەسـتی بە بڵاوکـردنەوە کـردووە،

بەڵام تەواونەکراوە، واتە بە پچڕپچڕی و بێ ئەوەی هەمووی تەواو بکرێ. (ابوبکر،٢٠٠٩، ص٢٥٠).

٢- "موعادەلەی ئەو پێوەندییەی وا لەنێوان مێژووی زایینی و کۆچیدا هەیە":

ئەم لێکۆڵینەوەیەی د. ئەحمەد عوسمان داهێنانێکە بایەخی یەکجار زۆری بۆ بە ئاسانی گۆڕینی ساڵی زایینی بۆ کۆچیدا هەیە، لەو بارەیەوە د. ئەحمەد لە سەرەتادا ئاماژە بەوە دەکات کە بەر لە چەند ساڵێک لە کاتی گوتنەوەی بابەتی مێژوو لە کۆلیجی ئادابی زانکۆی بەغدا گەیشتووەتە دۆزینەوەی یان دانانی موعادەلەیەکی جەبریی سادە سەبارەت بە پێوەندیی نێوان هەردوو مێژووی کۆچی و زایینی و گۆڕینەوەیان بەیەکدی و ئەو ڕێسایەی وەرگرت: ١٠٠ز = ٩٧ک+ ٦٢١٥٤، ز = زایینی، ک = کۆچی، ژمارە (٦٢١٥٤) چەسپاوە، لەجیاوازی نێوان هەردوو مێژووەوە هاتووە، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە ١٦ی تەممووزی ٦٢٢ بۆ مەدینە کۆچی کرد، وێنەی دەیی بەم جۆرەیە = ٦٢١, ٥٤٠ هەرچی ژمارە (٩٧)ە ئەوە دەوروبەری یان نزیکییە لەجێی ژمارەی وردتر (٩٧, ٠٢٢) کە ئەوە ڕاستەکەیە. ئەمە کرۆکی توێژینەوەکەیە و لەکاتی خۆی نیشانی هەندێ برادەری خۆی داوە [١٣] و لە گۆڤاری (نشرة اخبار جامعة بغداد) دا، ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٧٥ وەک کورتەهەواڵێک بڵاوکراوەتەوە.(ابوبکر، معادلة العلاقة بين التاريخين الميلادي والهجري، العراق (جريدة)، بغداد، العدد (٤٨)، ١٩٧٦/٤/١٥).

گۆڤاری (الثقافة) لە پێشکەشکردنی ئەم توێژینەوەی د. ئەحمەد نووسیویە: گرفتی گۆڕینی مێژووی کۆچی بۆ زایینی و بەپێچەوانەشەوە لەو گرفتانەیە کە ڕووبەڕووی توێژەر و مێژوونووسان دەبێتەوە، هەوڵی زۆردراوە بۆ ئەوەی بە ئاسانترین شێوە چارەی بکرێ، بەڵام هێشتا پێیدەوێ، بۆیە ئەم توێژینەوەی د. ئەحمەد عوسمانتان لەو بارەیەوە دەخەینە بەردەست کە زۆر ئاسان و وردە و توێژەر و مێژوونووسان لەکۆڵ خشتە دوورودرێژ و شێوازە ئاڵۆزەکان کردووەتەوە، هەمان توێژینەوە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی کوردی. (ابوبكر، معادلة العلاقة بين التاريخين الميلادي والهجري، (الثقافة)، العدد (٧)، تموز ١٩٧٩، ص ٣٨ – ٦٥)؛ ئەبوبەکر، موعادەلەی ئەو پێوەندییەی لەنێوان مێژووی زایینی و کۆچیدا هەیە، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، زانستگای بەغدا، ژمارە (٢٠ – ٢١)، ١٩٧٧، ل ٤٧ – ٦٩).

لەو توێژینەوەیەدا ژمارەیەک سەرچاوەی بە زمانەکانی عەرەبی و رووسی و ئینگلیزی بەکارهێناوە و بێگومان ئاسانکارییەکی زۆر و وەختێکی زۆر بۆ توێژەر و مێژوونووسان دەگێڕێتەوە، لەباتی گەڕانەوە بۆ ئەو هەموو خشتانەی دانراون، بەو هاوکێشەیە کارەکانیان جێبەجێ دەبێت، ئەمەش خزمەتێکی گەورەیە بە مرۆڤایەتی.

**٣- کورد لە نووسینی موسڵمانەکانی بەرایی ناوی مەڵبەند و تایفە کوردەکان:**

توێژینەوەیەکی زانستی د. ئەحمەد لەبارەی کورد لە نووسینی موسڵمانەکانی بەرایی ناوی مەڵبەند و تایفە کوردەکان[١٤]، تێیدا ئەو نووسین و رایانەی مێژوونووس و وڵاتناسە عەرەب و موسڵمانەکانی بەرایی سەبارەت بە شوێن و مەڵبەند و هەواری کوردەکان و ناوی هۆز و تایفەکانیان بەسەر دەکاتەوە، هەروەها وشەی (کورد، کوردەکان، الکرد، الاکراد، الکردی)، هەبوویێت، بۆئەوەش (٢٦) سەرچاوەی رەسەنی پشکنیوە، بۆ نموونە لەوانە ئەستەخری و ئیبن ئەثیر و ئیبن خردادبە، ئەلبەلازەری، ئەلحەمەوی، ئەدینەوەری، ئەلقەلقشەندی، ئەلمەسعوودی... هتد. (ابوبکر، الكرد في كتابات المسلمين الاوائل – ذكر مواطن وطوائف الاكراد، "مجلة كلية الاداب" (جامعة بغداد)، العدد (٢٤)، ١٩٧٩، ص ٣٢٧ – ٣٥١).

ئەوەی جێی ئاماژەیە د. ئەحمەد پسپۆڕی لە مێژووی نوێیە، کەچی ئەو هاتووە توێژینەوەی لە مێژووی سەردەمی ئیسلامی کردووە، ئەوەش لە خۆشەویستی و پەرۆشی بۆ مێژووی نەتەوەکەی سەرچاوەی گرتووە، نەخوازە کە ئەو سەردەمە پسپۆڕی مێژووی کورد زۆر کەم بوون، بەتایبەتی سەردەمی ئیسلامیش، بۆیە مایەی دەستخۆشی و پێزانینە.

هەر لەو رۆژگارە، بەتایبەتی وتارێکی کورتی لەبارەی وشەی (زم) نووسیوە هەروەک چۆن لە کتێبی (معجم البلدان)ی یاقوت ئەلحەمەویدا باسی کراوە (ابوبكر، مناقشات حول كلمة (زم) وماورد في معجم البلدان لياقوت الحموي، العراق، العدد (٣٦٩)، ١٢/٥/١٩٧٧؛ العدد (٣٧٥)، ١٩/٥/١٩٧٧).

**٤- ناوهێنانی کورد و رێوڕەچەڵەکیان لە نووسراوی موسڵمانەکانی بەرایی:**

بەهەمان شێوەی لێکۆڵینەوەی پێشوو، د. ئەحمەد لێکۆڵینەوەیەکی دیکەی بەم ناوونیشانەی سەرەوە نووسیوە، تێیدا باسی ناوهێنانی کورد و رێوڕەچەڵەک و رەسەنیان لە نووسراوی موسڵمانەکانی بەرایی دەکات، بۆ ئەمەش دیسان سەرچاوە رەسەنەکان گەڕاوە، بەپاڵپشتی زیاتر لە بیست سەرچاوەی کۆن و نوێ بە کوردی و

ئینگلیزی، توێژینەوەکەی نووسیوە . (ابوبكر، ذكر الكرد واصلهم في كتابات المسلمين الاوائل، مجلة المجمع العلمي العراقي – الهيئة الكردية، العدد (١٣)، ١٩٨٥، ص ٣٦١ – ٣٨٣). جێی ئاماژەیە ئەم توێژینەوەیە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی کوردی (ئەبوبەکر، ٢٠٠٥ ل ٦٠ – ٧٨ ).

هەر لە پەیوەندیی بەو سەردەمەوە، بەناوی مێژوو و کەلەپوور – نموونە لە قارەمانیەتی کورد، بەدوای زانیاری لەبارەی کوردەوە گەڕاوە و لە کتێبی (الاعتبار)ی ئوسامە کوڕی مونقیز باسی قارەمانیەتی سوارێکی کوردی موسڵمان بەناوی مەیاح دەکات، لەگەڵ هەندێ نموونەی دیکە . (ابوبكر، من التأريخ والتراث – امثلة عن بطولات كردية، العراق، العدد (٣٣٤)، ١٩٧٧/٣/٣١، العدد (٣٤٣)، ١٩٧٧/٤/١١).

**٥- دۆزی کورد لە سەردەمی ئاشتیدا (لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی):**

کارێکی دیکەی د. ئەحمەد عوسمان توێژینەوەیەکی درێژە، بە زنجیرە لە گۆڤاری (الثقافة) بە زمانی عەرەبی بەناوی دۆزی کورد لە سەردەمی ئاشتیدا (لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی)، (٣١) بەشە و (٢٥٠) لاپەڕەیە و لە (ئابی ١٩٧٩ تا تەمووزی ١٩٧٨) بڵاوکراوەتەوە . لەو توێژینەوەیەش وێڕای سەرچاوەی جۆربەجۆر و بە زمانی جیاجیا زۆربەی هەرەزۆری بابەتەکە پشتی بە بەڵگەنامەکانی حکومەتی بەریتانیا بەستووە، رەنگە د. ئەحمەد لە پێشەنگی ئەوانە بێت کە دەستی بەو بەڵگەنامانە گەیشتبێ و بۆ نووسینەوەی مێژووی ئەو سەردەمەی دوای جەنگ کەڵکی لێ وەرگرتبن، دواتر ناوی بابەتەکە بووەتە (كردستان في عهد السلام). (الثقافة (مجلة)، بغداد، العدد (٨)، آب ١٩٧٩، ص ٣٨ – ٤٨؛ العدد (٢)، تموز ١٩٨٧، ص ١٠٢ – ١١٣؛ ابوبكر، ٢٠٠٥، ص ٣٣٧ – ٥٨٧).

ئەوەی مایەی سەرنجە ئەو توێژینەوەیە هیچ ناونیشانی لاوەکی نییە سەرلەبەری بەناوی (کوردستان لە سەردەمی ئاشتیدا) بڵاوکراوەتەوە، بەڵام زانیاریی ورد و دروستی لەخۆگرتووە، چونکە وەک ئاماژەی پێکرا زۆربەی هەرەزۆری بەڵگەنامەی بەریتانییە، بێگومان بۆ ناساندنی دۆزی کورد بە عەرەبزمانان و نووسینەوە و تۆماری مێژووی نوێی کورد بایەخی زۆر زۆرە بەتایبەتی تێگەیشتن لە هەڵوێستی زلهێزەکان بەتایبەتیش بەریتانیا کە ناوچەکەی داگیرکردبوو، سەرەتا هەندێ بەڵێنی بە کورد دا و شێخ مەحموودیان وەک حوکمداری کوردستانی خواروو ناساند، بەڵام پاشان پاشگەز بوونەوە . (ابوبكر، ٢٠٠٥ ل ٦٠ – ٧٨ ).

لەلایەکی دیکەوە وەک د. کەمال مەزهەر ئاماژەی پێکردووە لە (٢٥) بەشەکەی زنجیرە وتارەکەی (الثقافة)دا زۆر بە دەگمەن هەست بە بوونی دکتۆر ئەحمەد خۆی دەکەیت (ئەحمەد، ١٩٨٣، ل ٢٢٥). واتە زیاتر بابەتەکان وەرگێڕانن و لێکدانەوەی توێژەر وەک پێویست نییە.

دیارە مەبەست لە دۆزی کورد لە سەردەمی ئاشتیدا یان کوردستان لە سەردەمی ئاشتی، رۆژگاری دوای جەنگی یەکەمی جیهانییە، تایبەت کە کوردستان وەک سەرزەمینی شەڕ و پێکدادان و پاشان داگیرکردنی و بەتایبەتی لەلایەن بەریتانیاوە و دابەشکردنەوەی جیهان لەنێوان وڵاتانی زلهێز و براوەی شەڕ، لەبری ئەوەی کوردستان ببێتە دەوڵەت و بە مافە سەرەتاییەکانی بگات، دەبینین ئەمجارە کوردستان کرا بە چوار پارچە و خرایە سەر چوار دەوڵەتی تازە و دروستکراو، بەمەش کورد وێڕای زیان و کاوڵکاری، ستەمی مێژوویی بێ ئەندازەی لێ کرا.

بەگشتی باس لە هاتنی ئینگلیز بۆ ناوچەکە و بەڵێنی دامەزراندنی حکومەتێکی کوردی و لیژنەی کینغ — کراین لە ساڵی ١٩١٩ بۆ بەدواداچوون بە بارودۆخی ئەو ناوچانەی رۆژهەڵات کە هاوپەیمانان بڕیاریان دابوو لە دەوڵەتی عوسمانی دابڕنن کە کوردستانیشی دەگرتەوە، پاشان مەسەلەی نەوتیش هاتە ناوەوە و دامەزراندنی دەوڵەتی ئاسووری و گەشتی نوئیل بۆ کوردستانی باکور، مەسەلەی دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئەرمەنی و کۆنگرەی لەندەن (١٩٢٠) و دۆزی کورد و کۆنگرەی سان ریمو (١٩٢٠) و هەوڵ و کۆششی کۆمەڵە و رێکخراوە و کەسایەتییە کوردییەکان لەو رۆژگارە وەک شەریف پاشا و شێخ عەبدولقادری شەمزینی و ئەمین عالی بەدرخان و بابانییەکان.... هتد. (ابوبکر،٢٠٠٥، ص ٣٣٧ — ٥٨٧).

کوردستان لەدوای شەڕی یەکەمی جیهان، زۆرترین نووسینی لەلایەن د.ئەحمەدەوە لەبارەوە نووسراوە، دیارە ئەمەش بە حوکمی پسپۆڕییەکەیەتی لەو ماوە مێژووییە هەستیارەی مێژووی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی و کورد بەتایبەتی. توێژینەوە و گوتارەکان تا ئەندازەیەک دووبارەبوونەوەیان پێوە دیارە، چونکە لەماوەی جیاجیا نەنووسراون، ئەمە ناونیشانی بابەتەکانیەتی:

- سەرنجێ لە بارودۆخی ناوچە کوردییەکان دوای شەڕی یەکەمی جیهانی.
- یادداشتێک بۆ وەفدی هاوپەیمانان لەلایەن نێردراوی کورد شەریف پاشاوە.
- پێشنیارەکانی بەڕێوەبردنی ناوچە کوردییەکان لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانی.
- دۆزی کورد و کۆنگرەی قاهیرە.

- بەیاننامە و لێدوانەکانی کۆلۆنیل (میرئالای) ئۆزدەمیر پاشا بۆ هۆزە کوردییەکان.
- کوردستان لە بەڵگەنامەکانی لیژنەی کینگ – کراین.
- را و بۆچوون و ئاراستەکان سەبارەت بە دۆزی کورد لە رۆژگاری شەڕ و دوای شەڕی یەکەمی جیهانی.
- را و پێشنیارەکان سەبارەت بە دۆزی کورد دوای شەڕی یەکەمی جیهانی.
- سیاسەتی بەریتانیا بەرانبەر کوردستان (دوای شەڕی یەکەمی جیهانی ساڵی ٩٢١).
- بزووتنەوەی شێخ مەحموود و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان.
- کێشەی موسڵ بەشێکە لە دۆزی کورد.
- رەگوڕیشەی دۆزی کورد لە پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکاندا.
- سیاسەتی بەریتانیا بەرانبەر بە کوردستان تا دانانی مەلیک فەیسەڵ.
- پەیماننامەی سایکس – بیکۆ – سازانۆف و دابەشکردنی تورکیای ئاسیایی و کوردستان.

پرۆژەی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان... تورکیا ١٠ی شوباتی ١٩٢٢.
- هەندێ سیمای دۆزی کورد لە سەردەمی ئێستادا. (ابوبکر، ٢٠٠٥، ص ٩ – ٣٦، ٤٣ – ٥٣، ٥٨ – ١٣١، ١٤٢ – ١٤٥، ٣٣٣ – ٣٣٧).

جێی ئاماژەیە ئەم توێژینەوەیە "کوردستان لە سەردەمی ئاشتیدا" سەرنجی نووسەرانی راکێشاوە و دوو جار بۆ زمانی کوردی وەرگێڕدراوە و دوو جاریش بەسەریەکەوە کۆکراوەتەوە وەک کتێب کۆپی و چاپ کراوە، دیارە ئەمەش هۆیەکەی گرنگیی بابەتەکە و وەک کارێکی زانستیش تۆمارێکی مێژوویی گرنگە. (ابوبکر، ٢٠٠٢).

– وێڕای ئەمانە کۆمەڵە وتارێکیشی هەن جۆراوجۆرن لە نێوان مێژوو و زانست بەتایبەتیش لەبارەی مرۆڤی نوێ و ئەندازەی بۆماوەیی، ئەمەشی لە کاتێکی زوو بووە، هێشتا بە فراوانی بڵاو نەبووبووەوە، ئەو بابەتەکەی لە تشرینی یەکەمی ١٩٧٨ نووسیوە دواتر لەنێوان شوباتی ١٩٨٠ – ١٩٨٢ لە گۆڤاری (الثقافة)ی بەغدایی بڵاوبۆتەوە و تەواویش نەبووە. (ابوبکر ،٢٠٠٥، ص٣٩٠ – ٤١٧).

هەمان بابەتی بە ئینگلیزیش لە نامیلکەیەکدا بڵاو کردووەتەوە ، وێڕای ئەمە پێنج وتاریشی لە رۆژنامەی (Kurdistan News) کە پارتی دیموکراتی کوردستان لە هەولێر دەری کردووە، بڵاوکردووەتەوە، یەکیان بەناوی (زینداندنێک لەسەر شەقام– رژێمی بەعسی تیرۆرست، زنزانة على الشارع – ارهاب النظام البعثي. (Abu-Bakr, 1983, 38p)، تێیدا باسی ئەو ئێش و ئازارەی دووچاری بووە لەسەر دەستی دەسەڵاتی

بەعس لە عیراق دەکات، هەروەها وتارێکی دیکەشی بەناوی "ورووژێنەرەکانی دۆزی کورد لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانی و کاریگەرییەکانی" هەر بە زمانی ئینگلیزی بڵاوکردووەتەوە، کە دیارە ئەمەشیان لەبارەی مێژووەوەیە و بەتەواوی لاپەڕەکەی لەخۆگرتووە. ( Kurdistan News, No. (9), November 1993 ).

بابەتێکی دیکەشی بەناوی (ONE (NESS) AND SUBINFINITE POINTS) ئەویش (٢١) لاپەڕەیە. ( AbuBakr, , 1994, p. 6 ).

د. ئەحمەد هەوڵیداوە بە زمانی کوردیش بنووسێت، لەو رووەوە کۆمەڵێک بابەتی مێژوویی و ئەدەبی و زانستی و فۆلکلۆری نووسیوە و وەرگێڕاوە بۆ کوردی، ئەمە وێڕای هەندێ چاوپێکەوتن بە کوردی. (Abu-Bakr, Baghdad, 1985, (21)p.).

د. ئەحمەد هەندێ بابەتی وەک (سەرنجێ لە نووسینی کوردناسە ئینگلیزەکان لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی)، (ئەسڵی ناونانی بادینان و ئامێدی)، (رووداوی کۆچکردن لە وڵاتی کوردەواری)، (گەشتێک بە جیهانی رۆژنامەوانیی کوردی کۆندا)، (یادەوەری دامەزراندنی کۆڕی زانیاری کورد و زانکۆی سلێمانی)، (نامەیەک لە میدیاوە بۆ یەمامە)، (زیندانێک لەسەر شەقام): (چیرۆکی ئازاری دەستی دیکتاتۆریەت)، (کتێبی هەولێر لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی لە دەوری هزری و سیاسیی ١٩٣٩ — ١٩٥٨)، (لە یادی دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان و... هتد). (ابوبکر، ٢٠٠٥، ص ٥٧٣ — ٦٣٥).

یەکێک لەو بابەتانەی د. ئەحمەد بایەخی پێداوە (هیستۆگرافیا) واتە (کرداری نووسینی مێژوو)ە، لەو رووەوە لە بابەتێکی وا لە ساڵی ١٩٧٠ بەناوی (ئایا مێژووی کورد نووسراوەتەوە؟)، نووسیویە (مێژوو باوکی زانستی ئادەمیزادە، مێژوو گشت شت فێری ئادەمیزاد ئەکات) پاشان دەڵێت دەستکراوە بە نووسینی مێژووی کورد، بەڵام هێشتا سەرەتایە، مەیدانی مێژووی کورد (زەوییەکی نەکێڵراوە).( ابوبکر، ١٩٧٠، ل٨٥ — ٨٨).

جارێکی دیکە بەدرێژی و وردتر لە ساڵی ١٩٧٦ دێتەوە سەر ئەو بابەتە و نووسیویە: "مێژووی کورد پێویستی بە رزگارکەر و دڵسۆزە بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد لەسەر بنەمایەکی زانستی، بەگشتی هیستۆگرافیا ئەو زانستەیە کە مێژوونووس زانیارییە مێژووییەکانی زۆر بەوردی دەگەیەنێتە خوێنەر. لەمەشدا دەبێ کۆمەڵێک زانستی یارمەتیدەر بەسەربکەینەوە بۆ زیاتر قووڵبوونەوە، وەک مێژووی زانستی شوێنەوار، ئەتنۆگرافیا، جوگرافیای مێژوو، .... هتد، زانینی زمانە زیندووەکان، دەبێ

هیستۆگرافیای کوردی پشت بە نووسینی مێژوونووسە کورد و بیانییەکان ببەستێ بە پاڵپشتی تیۆرە نوێیەکانی نووسینی مێژوو..."( ابوبكر، الهيستوغرافيا والتأريخ الكردي، العراق، الاعداد ( ٥و ٦ و٧)، ٢٣ و٢٤ و٢٥/ شباط ١٩٧٦).

سەبارەت بە نووسینەوەی مێژووی کورد، دەڵێت: "پێویستی بە دەزگای زانستی و شارەزایی ئەکادیمییانە هەیە، رۆژهەلاتناسەکان لەبارەی کوردیان نووسیوە، بەڵام بێ ئەوەی مێژووی کورد بنووسنەوە".( مصطفى، حوار مع الاكاديمي المتخصص في التأريخ د. احمد عثمان ابوبكر، زاگروس (مجلة)، اربيل، العدد (١٥)، ٢٧/شباط ١٩٩٩، ص ١٦ — ١٧).

هەر سەبارەت بە نووسینەوەی مێژووی کورد، لە دیدارێکدا دەڵێت: "لەڕووی زانستی لێکدانەوە بۆ مێژووی کورد زۆر گرنگی پێ نەدراوە، تەنانەت لەسەر ئاستی زانکۆکانیش لە دوای راپەڕینی ١٩٩١ ناوەڕۆکێکی زێڕین بۆ مێژووی کورد رەخساوە".(کاکەسوور ، دیدارێک لەگەڵ د. ئەحمەد عوسمان.... مێژوو، ژمارە (٤)، پایزی ٢٠٠٧، ل ٣١٤ — ٣١٥.).

بۆ نووسینەوەی مێژووی کورد لە زانکۆکانی عیراق کەوا بۆچی قوتابییەکان لەسەر مێژووی کوردیان نەنووسیوە، د. ئەحمەد ئەمە بۆ هۆکاری سیاسی دەگێڕێتەوە، چونکە هەر خۆی وەک دەڵێت (١١) ساڵ رێگرییان لێ کردووە مێژووی کورد بڵێتەوە، هەروەها لەبری ئەوە وانەی ئینگلیزی گوتووەتەوە. د. ئەحمەد خۆی بە یەکەم کەس لە باشووری کوردستان دادەنێت کە لە ساڵی ١٩٥٩ بیری لەوە کردووەتەوە بە شێوەیەکی ئەکادیمی لەبارەی مێژووی نوێی کوردەوە بنووسێت.(کاکەسوور، دیدارێک لەگەڵ د. ئەحمەد عوسمان.... مێژوو، ژمارە (٤)، پایزی ٢٠٠٧، ل ٣١٤ — ٣١٥.، دیبەگەیی، سەردان، هەولێر، ژ (١٦)، ١/٣/١٩٩٧، ل ٦ ).

سەبارەت بە کاریگەریی ئایدۆلۆژیای سۆڤیەت بۆ سەر نووسینی قوتابیان لەو وڵاتە، د. ئەحمەد دەڵێت: "ئەوە بۆ قوتابیەکە خۆی دەگەڕێتەوە، هەبوو بۆ خۆبردنە پێش ئەو کارەیان دەکرد، بەڵام بۆخۆم پشت بە هیچ سەرچاوەیەکی ئەم ئایدۆلۆژیایە نەبەستووە، بەڵام زاناکانی سۆڤیەت قەدری زانستیان زۆر لابوو".( کاکەسوور، دیدارێک لەگەڵ د. ئەحمەد عوسمان.... مێژوو، ژمارە (٤)، پایزی ٢٠٠٧، ل ٣١٤ — ٣١٥).

هەرچەند د. ئەحمەد خوێندنی لە سۆڤیەت تەواوکرد، بەڵام نووسینەکانی وەک هەندێ لە هاوەڵانی دووربوو لە ئایدۆلۆجیا، ئەو مێژوونووسێکی بابەتی بوو، پشتی بە رێبازی زانستی مێژوویی بەستووە بۆ گەیشتن بە ڕاستی، تەنانەت دەکرێ بگوترێ کە

ئەو لە ڕێبازی لێکۆڵینەوەدا لەوانە نزیکە کە لە زانکۆکانی ڕۆژئاوا خوێندوویانە، ئەو یەک جۆر سەرچاوە بەکار ناهێنێ، بەڵکو سەرچاوەکانی جۆراوجۆرن، لەپێشەوەش بەڵگەنامەکان، لەگەڵ ئەوەش سەرچاوە خۆیییەکانیشی فەرامۆش نەکردووە، چ بە کوردی، عەرەبی، فارسی، بۆیە وەک مێژوونووسێکی دیاری عیراقی شوێنی دیارە بۆ قوتابخانەی مێژووی عیراق. (ابوبکر، ٢٠٠٥، ص ٥٦٦).

- **وەرگێڕانەکانی:**
- **کتێب:**

د. ئەحمەد کە گەڕایەوە عیراق، یەکەمین کاری چاپکراوی وەرگێڕانی کتێبێکی مامۆستاکەی نەفتوڵڵاها روونۆڤیچ خالفین بوو، کە سەرپەرشتیاری بوو، بەناوی "ململانێ لەسەر کوردستان – الصراع علی کردستان"، (دۆزی کورد لە پێوەندی نێودەوڵەتییەوە لە سەدەی نۆزدەیەم)، لە رووسییەوە کردووەتە عەرەبی و لە ساڵی ١٩٦٩ لە چاپخانەی (الشعب) لە بەغدا چاپ بووە. بێگومان وەرگێڕانی کتێبێکی زانستی لەو ڕۆژگارە لەبارەی کورد و لەلایەن کەسێکی ئەکادیمی شارەزا زۆر گرنگ بوو، چونکە لە هەموو بەشەکانی کوردستان ڕێگای ئەو جۆرە کارانە نەدەدرا. (خالفین، ١٩٦٩، ١٦٨ ص.).

وەرگێڕ لە هەڵبژاردنی بابەتەکە وەک مێژووی کورد زۆر سەرکەوتووە و وەک عەرەبیزانیش ناساندنی دۆزی کورد بە عەرەبزمانان ئەویش کارێکی لەجێی خۆیەتی و بەتایبەتیش کە ڕاستەوخۆ لە زمانی رووسییەوە وەرگێڕدراوە و وێڕای پسپۆڕیی وەرگێڕ لە مێژوو ئەمە خۆی لە خۆیدا کارەکە زیاتر سەرکەوتوو دەکات.

ئەو کتێبە چەند سەردێڕێک لەخۆ دەگرێت: وتەی وەرگێڕ، پێشەکی، هۆزە کوردییەکان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم، خۆ خزاندنی ئینگلیز لە کوردستان لە سێیەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم، رووسیا و کورد لە سێیەکی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەم، راپەڕینی رواندز ١٨٣٥ – ١٨٣٧، کێشانی سنووری تورکیا و ئێران لە چلەکان و پەنجاکانی سەدەی نۆزدەیەم، کورد لە ساڵانی شەڕی قەرەم، لە نێو دوو شەڕدا لە شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی نۆزدەیەم، شەڕی رووسیا – تورکیا ١٨٧٧ – ١٨٧٨ و هەڵوێستی کورد، تاوسەندنی بزووتنەوەی رزگاری و راپەڕینی شێخ عوبەیدوڵڵا، کوردستان لە هەشتاکانی سەدەی نۆزدەیەم، کۆتایی، سەرچاوەکانی. لە وتەی وەرگێڕدا وێڕای دەرخستنی بایەخی کتێبەکە وەک کارێکی

زانستی و پڕ زانیاری لەو سەدەیەدا ئاماژەی بەوەش کردووە کە هەوڵیداوە شوێنپێی نووسەر هەڵبگیرێت لەڕووی شێواز و نووسینی کتێبەکە و خزمەتێک بێت بە بواری فراوانی مێژووی گەلی کورد [١٥].

– مەلا مەحموودی بایەزیدی، دابونەریتی کوردەکان– عادات وتقاليد الاكراد...

ئەو کتێبە لە ئەسڵدا دەستنووسێکی زانای ئایینی مەلا مەحموودی بایەزیدییە (١٧٩٧ – ١٨٦٧)، لە ساڵی ١٩٦٣ روودینکۆ دۆزیویەتییەوە و ساغی کردووەتەوە و پێشەکی بۆ نووسیوە و وەریگێڕاوە و لە مۆسکۆ چاپ بووە. (رەسول، ٢٠٠٩، ل ١٠١).

هەر ئەو کارەی بایەزیدی لەلایەن د. شوکرییە ڕەسوڵەوە کراوەتە کوردی. (بایەزیدی، ١٩٨٣)، د. ئەحمەد ئەو کارەی بایەزیدی لە رۆژنامەی (التآخي) بڵاو کردووەتەوە و لە وەرگێڕانیدا پشتی بە دەستنووسە کوردییەکە و وەرگێڕانە رووسییەکەی روودینکۆ (١٩٢٦ – ١٩٧٧) بەستووە. (التآخي، العدد (٤٨٢)، ٨ تموز ١٩٧٠، ص ٦٦٣؛ ابوبكر، ٢٠٠٩، ص٢٠١).

بایەخی ئەو کارەی بایەزیدی لەوەدایە وەک د. ئەحمەد دەڵێت: شتێکی ناوازەیە لە بواری خۆی، چونکە یەکەمیان بە قەڵەمی رووناکبیرێکی کوردی سەدەی نۆزدەیەم نووسراوە، تا ئەوکاتەی شتی لەو جۆرە نەنووسرابوو، دووەمینیان ئەوەیە کە بە زمانی کوردی (کرمانجی سەروو) نووسراوە، کە رەنگە بە بەراییەکانی پەخشانی کوردی لە قەڵەم بدرێت و بەو هۆیەوە ئاگاداری داب و نەریت و ناو و زاراوەی بەکارهاتووی ئەو رۆژگارە دەبی. (التأخي، العدد (٤٨٢)، ٨ تموز ١٩٧٠، ص ٦٦٣؛ ابوبكر،٢٠٠٩، ص١٩٩–٢٠٠).

نامەکە لەو بابەت و دابە کۆمەڵایەتییە زۆرانە دەدوێت، کە پێشتر لەسەری نەنووسراوە و بایەزیدی لەو کوردانە دەدوێت کە نیمچە کۆچەر و نیمچە نیشتەجێن واتە هەردوو شێواز پەیڕەو دەکەن، واتە کورد هەر کۆچەر نەبوونە، بەڵکو پتر حەزی لە نیشتەجێبوون و ژیانی شارستانی بووە، بۆ ئەمەش رای محەمەد ئەمین زەکی (١٨٨٠ – ١٩٤٨) مێژوونووسی ناودار دەهێنێتەوە، هەروەها لە خستنەڕووی پوختەی ناوەڕۆکی کتێبەکە بەوە دەست پێدەکات کەوا کتێبی "داب و نەریتی کوردەکان" شاکارێکی مەلا مەحموودی بایەزیدییە، بەر لە زیاتر لە ١٢٠ ساڵ (ساڵی ١٩٧٠ ساڵی وەرگێڕانی کتێبەکە)، توحفەیەکە نموونەی ناوازەیە، رەنگیشە تاقانە بێت لەناو تاقانەکانی ئەدەبی مێژووی کۆنی کورد و ئەدەبی نەوەی رابردوو بەیەکەوە،

لەبەرئەوەی تایبەتمەندیی وای تێیدایە کە لە کتێبەکانی دیکەدا نییە. (التآخي، العدد (٤٨٢)، ٨ تموز ١٩٧٠، ص ٦٦٣؛ ابوبكر،٢٠٠٩، ص٢٠٢).

لە ناوەڕۆکی کتێبەکەی بایەزیدی رووداوەکانی نەریتی رابردووی نێو کوردەواری بە شێوازێکی شیرین و رەوان دەگێڕێتەوە، بۆ نموونە باسی پایەی مامۆستای ئایینی و شێوازی خوێندنی ئایینی لە کوردستان دەکات بە وردی، هەروەها ئامۆژگاریکردنی خەڵک، مامۆستا پایە و رێزی زۆر لای خەڵک هەیە، ئافرەت رووپۆشی نییە لە نێو کورد، ئامۆژگاری کچانی لاو و راهێنانیان لەسەر ژیان و داب و نەریت، هەروەها کوڕانیش گوێڕایەڵی گەورەکان دەبن، کورد منداڵەکانیش فێری بەکارهێنانی چەک و سواربوونی ئەسپ و تفەنگ هاویشتن دەکەن، کورد زمانی فارسی لە نووسیندا بەکاردەهێنن. (ابوبكر،٢٠٠٩، ص ٢٠٣ – ٢٠٤ – ٢٤٣).

ئەو وەرگێڕانەی د. ئەحمەد لەلایەن کەمال مەزهەریشەوە هەڵسەنگێنراوە و نووسیویە: "عادات و رسووماتنامەی ئەکرادییە" بە جۆرێکی رێکوپێک و بێ هیچ لادانێک لەلایەن دکتۆر ئەحمەد عوسمانەوە کراوەتە عەرەبی، پێشەکی و لێدوانەکانی وەرگێڕ هەرچەند کەمن، بەڵام ئەوی مەبەستە رایدەگەیەنێت، لەگەڵ ژمارەیەکی کەم سەرنجی تایبەت" ( ئەحمەد، ١٩٨٣، ل ٢٢٣ ).

- کوردی میللی و ئیبراهیم پاشا – الاكراد الملّي وابراهيم باشا:

ئەم کتێبە بە قەوارەی بچووک و بەناوەڕۆک دەوڵەمەند، کارێکی دیکەی د. ئەحمەدە و لە ساڵی ١٩٧٣ لە بەغدا لە چاپخانەی (دار الجاحظ) چاپ کراوە و (٦٤) لاپەڕەیە، نووسەر لە وتەیەکی سەرەتای کتێبەکەیدا دەڵێت مێژووی ئەم عەشیرەتە (مللی) لاپەڕەکانی پڕ پەند و وانەیە لەنێو مێژوو و هۆزەکانی کورددا، ئەمەش هەروا ئاسان نییە، چونکە سەرچاوەکان زۆر کەم و دەگمەنن، دیارە ئەمەش بەشێکی مێژووی کوردە، لە هەمان دەرخستنی رووی سیاسەتی دەوڵەتی عوسمانی بەرانبەر بە گەلانی ژێردەسەڵاتی، مێژوو ئەو رووداوانە لەبیرناکات، نووسەر بۆ ئەم کارە پەنای بۆ چەندین سەرچاوە بردووە کە هەموویان سەرچاوەی بە روومەت و شایانن و لە کۆتایی کتێبەکە تۆمارکراون، ئەمە سەرباری دەستنووسێکی بچووکی بەنرخی یەکێک بەناوی عەبدولکەریم بەهجەت تێیدا زانیاری لەبارەی چارەنووسی ئەم عەشیرەتە و سەرۆکەکانی تۆمارکراوە لەسەر دەستی حکومەتی ئیتیحاد و تەرەقی. (ابوبكر، ١٩٧٣ ص٢–٤).

ناوەڕۆکی کتێبەکە وێڕای وتەی نووسەر، کورتەیەکی چڕ لەبارەی زێد و پێکهاتەی هۆزەکانی مللی، خشتەی ناوی هۆزەکانی مللی، رووداوی میلان، کورتەیەکی مێژوویی، وتەکانی مارک سایکس، کورتەیەکی مێژوویی ژیانی خوالێخۆشبوو ئیبراهیم پاشای مللی بە پێنووسی (عەبدولکەریم بەهجەت — دەستنووسەکە) سەرچاوەکان.

د. ئەحمەد هەر لە بواری وەرگێڕاندا بەشداری وەرگێڕانی کتێبی قوتابخانەکانیشی کردووە، کە لەدوای ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ساڵ بە ساڵ پرۆگرامی قۆناغەکانی خوێندن کرانە کوردی، لەوانە کتێبی (مێژووی چاخە کۆنەکان) بۆ پۆلی یەکەمی ناوەندی لەگەڵ مەجید ئاسنگەر، گیو موکریانی، حەمەکەریم هەورامی لە ساڵی ١٩٧١ لە بەغدا بە (٢٣٩) لاپەڕە چاپ بووە، هەروەها بە هاوبەشی لەگەڵ مستەفا نەریمان و فەرەیدون عەلی ئەمین کتێبی (پەروەردەی نیشتمانی و کۆمەڵایەتی) پۆلی سێیەمیان بۆ زمانی کوردی وەرگێڕاوە و (١٤٠) لاپەڕەیە و لە بەغدا لە ساڵی ١٩٧٣ چاپکراوە. (نەریمان، ١٩٨٨، ل٢٩٧-٣٠٤)

دەقی سێ نامەی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری

ئەم نامانە کاتی خۆی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری ناردوونی بەمەبەستی روونکردنەوەی بارودۆخی راستەقینەی نالەباری کوردستان بۆ حکومات و لایەنە پەیوەندیدارەکان لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا پێش و پاش سەرکردایەتیکردنی راپەڕینی ناوداری ١٨٨٠، ئەو کارەش لەو بەڵگەنامانەی حکومەتی بەریتانیا دەرکەوتووە، کە تا ماوەیەکی درەنگ پێی نەزانرابوو، بۆ دەرخستنی رووی پاکی ئەو بزووتنەوەیەی کورد بە رابەرایەتی شێخ عوبەیدوڵڵا و بنەماڵەکەی[١٦].

ئەو نامانە، دوویان بۆ د. کوچران کونسوڵی بەریتانیا لە ورمێ، یەکەمیان لە ٢٥ی ئەیلوولی ١٨٨٠، دووەمیان لە ٥ی تشرینی یەکەمی ١٨٨٠، لە ماوەی دە رۆژدا دوو نامەی ناردووە، ئەوەش راستیی زوڵم و ستەم و بێدادیی دەسەڵاتدارانی ئێران لەو رۆژە دەردەخات بەرانبەر خەڵکی کوردستان. لە نامەی دووەمدا بەتایبەتی باس لە گەلی کورد دەکات وەک قەوارەیان خودان دەستوور و داب و نەریتی تایبەت بە خۆیان و گلەیی لە هەردوو حکومەتی ئێرانی و عوسمانی دەکات دەرهەق بە خەڵکی کوردستان کە رێگای شارستانییان ون کردووە، یان خۆیان لێ نەبان کردووە، داوا لە کونسوڵ دەکات کە را و بۆچوونی خەڵکی کوردستان بە ئەوروپا بگەیەنێ، بۆ ئەوەی چارەیەک بۆ ئەوە بدۆزرێتەوە، داوای ئەو مافانە دەکەین کە گەلانی دیکە بەدەستیان

هێناوه، نامەی سێیەمی بۆ حاكمی ورمێ ئیقبال دەولەیە لە ١٥ی ئەیلوولی ١٨٨٠، لێرەش بەهەمان شێوه باسی باروودۆخی كوردستان و هەڵوێستی دەوڵەت و كاردانەوەی خەڵكی كوردستان و تەنانەت بە نموونە و ناو ئەو ستەمانەی دەرخستووە كە لە خەڵكی كوردستان دەكرێت، بۆیە كورد نیازی راپەڕینی هەیە و بۆ ئەمە كوردانی ئێران و عوسمانی یەک دەگرن. (نەریمان، ١٩٨٨، ل ٢٩٧ — ٣٠٤ ).

وێڕای وەرگێڕانی ئەو سێ نامەیە، د. ئەحمەد روونكردنەوەی پێویستی بەپێی سەرچاوەكانی بەردەستی داوه، بۆ ئەوەی خوێنەر زیاتر لە بابەتەكە بگات. (شمس كردستان، العدد (٦٩)، نیسان ١٩٨٥، ص ٥؛ ابوبكر، ٢٠٠٩، ص ١٤٩).

د. ئەحمەد لە دیدارێكدا ئاماژە بەوە دەكات كەوا بەنیازە كتێبێكی ئینگلیزی لەبارەی مێژووی كۆنی كورد بكاتە كوردی (شمس كردستان، العدد (٦٩)، نیسان ١٩٨٥، ص ٥؛ ابوبكر، ٢٠٠٩، ص ١٤٩).

**وتارەكانی:**

**أ- كەسایەتییەكان (ناودارەكان):**

لە میانەی وتارە جۆراوجۆرەكانی د. ئەحمەد عوسمان، كۆمەڵێک كەسایەتی جۆراوجۆری كورد و بیانی كردوونەتە كەرەستەی نووسینەكانی، دیارە ئەمەش لە روانگەی تێڕوانینی تایبەتی خۆی كە ئەو كەسایەتییانە چ رۆڵێكیان هەبووە لە مێژووی كورد بەگشتی و لەتەكیدا ئەوانەی كە هاوڕێی بوون وەک وەفا یادی كردوونەتەوە.

زانای گەورەی كورد محەمەد ئیبن ئادەم: لەپێشەوەی ئەو كەسانەیە كە د. ئەحمەد لەبارەیانەوە نووسیویە، ئەم زانا گەورە كوردە لە گوندی رۆست لەدایک بووە (١٧٤٧ — ١٨٣٦ز)، وەک هەر زانایەكی ئەو رۆژگارە لە حوجرە پێگەیشت و ناووناوبانگی دەنگی دایەوە تا ئەوەی دەبێتە موفتی و راوێژكاری میری سۆران و دواتریش لەگەڵی هەڵناكات و بەجێی دەهێڵێت و دەگەڕێتەوە ناوچەكەی خۆی، ئەم زانا گەورەیە ژمارەیەكی زۆری دانراوی جۆراوجۆری هەیە، یەكێكیان وەک بایەخی مێژوویی كتێبی "سلسلة الذهب"ـە، كە باس لە ژیانی خۆی و ئەو تەنگژە و ناخۆشی و ناكۆكییەكانی لەگەڵ میر محەمەدی رواندزی تێدا تۆماركردووە، بەداخەوە دانەی ئەو دەستنووسە ئێستا بەردەست نییە، كاتی خۆی لە كتێبخانەی محەمەد رەشید و عەباس عەزاوی هەبووە، زۆركەس لەسەریان نووسیوە، بەر لە هەموویان شێخ

محەمەدی خاڵ، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و د. ئەحمەد عوسمان و زوبیر بیلال ئیسماعیل و تەنانەت نامەیەکی ماستەریشی لەبارەیەوە نووسراوە. ( ابوبکر، محمد ابن ادم العالم الكردي الكبير، شمس كردستان، العدد (٦)، تشرين الاول والثاني ١٩٧٣).

ئەم وتارە لەگەڵ کۆمەڵێک بابەتی دیکە بۆ زمانی کوردی وەرگێڕدراون. (ابوبکر، ٢٠٠٥،ل ١٦٥ – ١٧٠).

قەرە فاتیمەی ژنە سەرکردەی کورد لە شەڕی قەرەم: لەو وتارەدا سەرەتا باسی کۆمەڵێک ئافرەتی ناوداری کورد دەکات و ناویان دەبا، ئینجا دێتە سەر ژنێکی قارەمانی کورد بەناوی (قەرە فاتیمە) کە بەشداری شەڕی قەرەمی (١٨٥٣-١٨٥٦) کردووە لەگەڵ سوپای عوسمانی وەک خۆبەخش، ئەو ئافرەتە خێزانی یەکێک لە سەرۆک عەشیرەتەکانی ناوچەی مەرعەش بووە لە باشووری تورکیا، مێردەکەی لەلایەن کاربەدەستانی عوسمانی زیندانی کراوە، کە ئەو شەڕە بەرپابووە، ئەو ژنە بە سەرکردایەتی عەشیرەتەکەی بەشداری کردووە و چووەتە ئەستەنبۆڵ و پێشوازی جەماوەری لێ کراوە و بووەتە جێی قسە و باسی ڕۆژنامە ناوخۆیی و بیانییەکان و ڕاپۆرتیان لەو بارەوە نووسیوە، یەک لەو ڕۆژنامانە ( The Illustrate London News– هەواڵە وێنەدارەکانی لەندەن) لە ڕاپۆرتی ڕۆژی ٢٢ی نیسانی ١٨٥٤ ڕاپۆرتێ بەناوونیشانی (قەرە فاتیمە لە ئەستەنبۆڵ) و وێنەشی هەیە. (التآخي، العدد (٩٥٩)، ١٣ شباط ١٩٧٢؛ د. احمد عثمان ابوبکر، الزعيمة الكوردية (قره فاطمة) في حرب القرم، (خەبات)، العدد (٨٣٩)، ١٩٩٧/٨/٢٩).

مەلا مەحموودی بایەزیدی: ئەو زانا ئایینییە کوردەی هاوکاری کونسوڵی ڕووسی لە ئەرەزەڕۆم کرد و چەندین دەستنووسی لەپاش بەجێ ماون، لەوانە کتێبی (عادات و رسوماتنامەی ئەکردایيە - داب و نەریتی کوردەکان)، کە لەساڵی ١٩٦٣ توێژەری ڕووس مارگریت ڕوودینکۆ لەگەڵ وەرگێڕانی بۆ ڕووسی لە مۆسکۆ چاپ و بڵاوی کردەوە، دواتر د. ئەحمەد بۆ عەرەبی وەریگێڕاوە و د. شوکرییە ڕەسووڵیش کردوویيە بە کوردی.(البايزيدي، الصوت الاخر (مجلة)، اربيل، العدد (٢١٨)، ٢٠٠٨/١١/١٢، ص٣٣).

سەرکردەکان: د. ئەحمەد وتاری لەبارەی چەند سەرکردەیەکی مێژوویی گەلی کورد نووسیوە و تێیدا دەوریان لە مێژووی نەتەوەکەیان دەخاتەڕوو و داوا دەکات یادیان بکرێتەوە، ئەوانە ڕەمزی نەتەوە و نیشتمان و هەندێکیان تا سەر پەتی سێدارە چوون یان لە ئاوارەیی سەریان ناوەتەوە، دوای ئەوەی تەمەنی خۆیان لە ڕابەریکردنی گەلەکەیان بەسەربردووە، لەوانە: شێخ عەبدولسەلامی بارزانی، ئیبراهیم

پاشای میللی، شێخ مەحموودی حەفید، قازی محەمەد، خەیروڵڵا عەبدولکەریم، مەلا مستەفای بارزانی، هەریەکەیان بەپێی پێویست دەور و شوێن و پلە و پایە و شێوازی ماڵئاواییان خراوەتەڕوو. (ابوبکر، هل نذكر الشيخ عبدالسلام البارزاني، شمس كردستان، العدد (٥)، آب ١٩٧٣، ص ٢٥ – ٢٦؛ ابوبكر، ابراهيم باشا الملي جانب من التأريخ الكردي المعاصر، التآخي، العدد (١١٥٩)، ١٠ تشرين الاول ١٩٧٣؛ ابوبكر، حان وقت التخليد لنخلد آثار الشيخ محمود الحفيد فقد كان زعيماً وطنياً لأمته، التآخي، العدد (٩٥٩)، ١٣ شباط ١٩٧٢، ص ٨؛ في ذكرى استشهاد المناضل قاضي محمد، التآخي، العدد (٩٩٧)، ٢ نيسان ١٩٧٢، ص ٣؛ دقائق الصمت امام قبر الشهيد خيرالله عبدالكريم، خەبات، العدد (٨٨٣)، ١٩٩٧/٧/١٧؛ في ذكرى ميلاد الزعيم المناضل البارزاني مصطفى....، الصوت الاخر، العدد (١٣٦)، ٢٠٠٧/٣/٧ ).

وێڕای ئەمانە د. ئەحمەد لە نووسینەکانیدا یادی هەندێ کەسایەتی دیکەشی کردووەتەوە، لەوانە بۆ نموونە فازیل ئەلجەمالی سەرۆک وەزیرانی سەردەمی پاشایەتی و کەسایەتی رۆشنبیر و سیاسییەکی لیبرال. عەلی فەتاح دزەیی شاعیر و هاوڕێی خوێندنی، عەبدولوەهاب بەیاتی شاعیری بەناوبانگی عیراق. (ابوبكر، أسطر من ذكرى أربيل عن فاضل الجمالي، خەبات، العدد (٨٢٦)، ١٩٩٧/٨/٨؛ في ذكرى اديب كردستان علي فتاح دزەيى، خەبات، العدد (٨٤٩)، ١٩٧٩/١١/٧؛ بعض الذكريات مع الشاعر عبدالوهاب البياتي، خەبات، العدد (٩٤٦)، ١٩٩٩/١٠/١٥).

لەو نووسینانەی کە هەریەکەو بە بۆنەیەک وەک بیرەوەری و وەک وەفا و هەست و سۆزی هاوڕێیەتی یان بە مەبەستی راگەیاندنی پەند و وانەیەک، ئەو بابەتانەی نووسیوە و تێیاندا زۆر بە راستگۆیی و راشکاوانە هەستی خۆی دەربڕیوە.

**ب- زانست و ئەدەب و زانایانی کورد:**

لە بواری زانست و پەروەردە و فێرکردن و مامۆستا و زانایانی کورد، د.ئەحمەد هەندێ بابەتی لەبارەیانەوە نووسیوە و تێیدا دەور و بایەخی ئەوانەی خستووەتە روو، بۆ نموونە لەبارەی خوێندنی بەرێ بەتایبەتی ئایینی کە مەلا مەحموودی بایەزیدی لە کتێبەکەی (عادات و رسووماتنامەی ئەکرادییە)دا باسی کردووە، لەو بارەیەوە د. ئەحمەدیش بەپاڵپشتی ئەو سەرچاوەیە لەو بوارە دواوە، بەتایبەتی کە مامۆستای ئایینی چەند رێزی لەناو کۆمەڵدا هەیە و دەوری لە بڵاوکردنەوەی خوێندن و فێربوون و شێوازی ئەو جۆرە خوێندنە. (ابوبكر، حول التربية والتعليم، التاخي، العدد (٧٧٠)، ١٩٧١/٦/٢٨، ص ٣).

له وتارێكى ديكەدا باسى (مامۆستاى كورد) دەكات و ئاماژه به ئەحمەدى خانى و حاجى قادرى كۆييیەوه دەكات وەک مامۆستايانى پێشەنگ و دەوريان، ئينجا دێته سەر مامۆستايانى ئەو سەردەمەى تێيدا نووسيوه و چۆن مامۆستا خزمەت بەكۆمەڵ دەكەن له بڵاوكردنەوەى زانست و زانيارى و له هەموو سووچەكانى وڵات له گوند و شاردا. (ابوبكر، المعلم الكردي، التاخي، العدد (٧٦٣)، ٢٠ حزيران ١٩٧١، ص ٣ ).

له وتارێكى ديكەدا لەبارەى زانايانى كوردەوه، باس لەوه دەكات كه تا چەند بەشدارييان له زيندووكردنەوەى كەلەپوورى هزرى و ئەدەبى و زمانى كوردى و فارسى و توركى كردووه له هەموو زانسته جۆراوجۆرەكان بەپاڵپشتى هەندێ سەرچاوه وەک ئەنوەر مايى و شەرەفخانى بەدليسى و چەندانى ديكه ناوى چەندين خوێندنگاى ئايينى دێنێ كه پڕ زانا و فەقێ و شاگردن و مامۆستا و زانا و شارەزاى بواره جياجياكانى زانست. (ابوبكر، قالوا في العلم والادب وعلماء الاكراد، التآخي، العدد (٨٨٤)، ١٩٧١/١١/١٠).

- **شۆڕش و ڕاپەڕينەكانى كورد:**

دەرسيم شۆڕشى بەردەوام: لەو وتارەدا د. ئەحمەد باسى شۆڕشى دەرسيم له ساڵى ١٨٩١ دەكات دژى دەوڵەتى عوسمانى و بەردەوام بووه و ١٩٠١، و ١٩٠٥، و ١٩٠٨، تا ١٩١٧، و ١٩٣٧ .(ابوبكر، درسيم ثورة كردية مستمرة، التآخي، العدد (٩٢٠)، ١٩٧١/١٢/٢٥)

دەرسيم شۆڕشێكى بەردەوام: زۆردارى و ستەمى دەسەڵاتدارانى توركيا دژ به گەلى كورد درێژەى هەبوو، وێڕاى شۆڕشەكانى پێشتر كه له لاپەڕەكانى پێشوو ئاماژەيان پێكرا و ئەوپەڕى درندەيى و هۆڤيانه سەركوت كران، بەڵام بەرخودان و ڕووبەڕووبوونەوه، ئەگەر بۆ ماوەيەكيش بێت، هەر هەبووه، جارێكى ديكه ناوچەى دەرسيم له سييەكانى سەدەى بيستەم ڕاپەڕينێكى ديكەى بەخۆيەوه بينى، بەتايبەتى له ساڵى ١٩٣٧، ئەم شۆڕشه به ڕابەرى سەيد ڕەزاى دەرسيمى بوو. (ابوبكر، درسيم ثورة كردية مستمرة، التآخي، العدد (٩٢٠)، ١٩٧١/١٢/٢٥ ).

-ڕاپەڕينى شێخ عەبدولسەلامى بارزانى: لەو وتارەدا د. ئەحمەد باس لەو ڕاپەڕينه و هۆكارەكانى هەڵگيرسانى و داخوازييەكانى دەكات، تا كۆتايى به ڕاپەڕينەكه دێت و شێخ عەبدولسەلام و هاوڕێكانى لەسێداره دەدرێن، بۆ نووسينى ئەم بابەته چەند سەرچاوەيەكى ڕەسەنى بەكارهێناوه، بەڵام هەندێ ورده هەڵەى تێكەوتووه، يەكيان كه دەڵێت له ساڵى ١٩٠٤ شێخ عەبدولسەلام لەگەڵ هەندێ

سەرۆکی کورد رێکخراوێکی کوردییان لە ئەستەنبوڵ دامەزراندووە. (ابوبكر، حركة الشيخ عبدالسلام البارزاني، التآخي، العدد (٨٦٩)، ١٩٧١/١٠/٢٤، ص ٦).

لەلایەکی دیکەوە نووسیویە یادداشتی داوەتە گەورە سەرۆکەکانی کورد لەوانە شێخ عەبدولقادری نەهری و شەریف پاشا و ئەمین عالی بەدرخان بۆ ئەوەی پشتگیری بکەن. (ابوبكر، حركة الشيخ عبدالسلام البارزاني، التآخي، العدد (٨٦٩)، ١٩٧١/١٠/٢٤، ص٦).

ئەوەی ئاگاداربین شێخ لە کانوونی یەکەمی ١٩١٤ لەسێدارە دراوە، ئەو جموجووڵەی باس دەکرێت دەبێ لە کۆتایی جەنگ بێت . وێرای ئەمانە، ئەو وتارە مێژووییە بۆ ئەو رۆژە زۆر بوو، چونکە سەرچاوەی مێژوویی کەم بوون جگە لەوەی کە بواری بڵاوکردنەوەش زۆر کەم و هەندێ جار ئەو چەشنە وتارانە هەر رێگای بڵاوکردنەوەی نەدەدرا.

- راپەرینی دەرسیمی باکووری کوردستان ١٩٢٠ – ١٩٢١: ئەو راپەرینەی پتر بە راپەرینی (قۆچگیری) ناسراوە، چونکە ئەوی عەشیرەتە دەوری سەرەکی تێدا هەبووە. ئەو راپەرینە ئامانجی سەربەخۆیی کوردستان بووە، ئالای کوردستانیان هەڵکردووە لە شاری (عەمەرانییە) و لە نیسانی ١٩٢١ شۆرشەکە سەرکوت کرا. (ابوبكر، انتفاضة درسيم الكردية في كردستان الشمالية ١٩٢٠ – ١٩٢١، خەبات، العدد (٨٨٩)، ١٩٩٨/٨/٢٨؛ (٨٩٠)، ١٩٩٨/٩/٤ ).

- لە یادی شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران: شۆڕشیساڵی ١٩٢٥ بە رابەرایەتی شێخ سەعیدی پیران، یەکێکە لەو شۆڕشە گەورانەی گەلی کورد لە باکووری کوردستان لە دژی دەسەڵاتدارانی تورکیا، د. ئەحمەد وەک مێژوونووسێک و بۆ یادی ئەو شۆڕشە وتارێکی مێژوویی درێژی نووسیوە، کە بێگومان بۆ ئەو رۆژگارە گرنگ بوو، وەک ئەکادیمییەک ژمارەیەک سەرچاوەی بەکارهێناوە کە هەندێکیان بۆ خوێنەری کورد نەبیستراو و نەزانراو بوون و بە زمانی بێگانەبوون، لەوانە: بلەچ شێرکۆ، لوسیان رامبو، ئیسماعیل شاوەیس، حەسەن ئەرفەع، ئارمسترونگ، لاڤر، برنارد لویس. (ابوبكر، في ذكرى ثورة الشيخ سعيد پيران، التآخي، العدد (٧٦٢)، ١٩ حزيران ١٩٧١، ص ٢).

- شۆڕشی ئاگری داغ: دوابەدوای شۆڕشی ١٩٢٥ لە باکووری کوردستان و سەرەنجام سەرکوت کرا، لە ئەنجامی ئەو زۆرداریيەی لە باکووری کوردستان لە کورد دەکرا لەلایەن کاربەدەستانی تورکیاوە. ئەوجارە شۆڕشێکی گەورەتر و فراوانتر و

ڕێکخراوتر بەنەخشەی ڕێکخراوی خۆیبوون و بە ڕابەری ئیحسان نوری پاشا لە ساڵی ١٩٣٠ بەرپا بوو.

د. ئەحمەد وەک مێژوونووسێک ئەم شۆڕشەشی بەسەرکردووەتەوە و بەهەمان شێوەی وتارە مێژووییەکانی دیکەی سەرچاوەی پێویستی بەکارهێناوە. دەبێ ئاماژە بەوەش بکەین کە ئەم شۆڕشە بە شۆڕشی ئاگری داغ و ئارارات و خۆیبوون و ئیحسان نوریش ناوی رۆیشتووە، دیارە شۆڕشەکە چیای بەناوبانگی ئارارات یان ئاگری داغی کردبووە بنکەی شۆڕش. (ابوبكر، ثورة اگرى داغ الكردية في تركيا، التآخي، العدد (٨٢٦)، ٦/٩/١٩٧١، ص ٢).

- دوو ئەیلوول و یەک شۆڕش: وتارێکە باس لە ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٠ و شۆڕشی ١١ی ئەیلوولی ١٩٦١ دەکات. (ابوبكر، ايلولان وثورة واحدة، التآخي، العدد (٨٢١)، ١١ أيلول ١٩٧١، ص ٥).

## خستنەڕووی کتێب:

یەکێک لەو کارانەی د. ئەحمەد بایەخی پێداون، بەتایبەتی ئەو کتێب و سەرچاوانەی بە زمانی بیانی لەبارەی کوردەوە نووسراون، بۆ ئاشناکردنی خوێنەر و ڕووناکبیرانی کورد، نەخوازە کە ئەو کتێبانە لەو ڕۆژگارە دەگمەن بوون و بەدەست دەکەوتن و بەئاسایی و ئاسانی نەدەگەیشتنە ناو کتێبخانەی کوردی، بۆیە وەک زمانزانێک ئەو ئەرکەی سەرشانی بەجێ هێناوە و ژمارەیەک سەرچاوەی گرنگی ئەو سەردەمانەی لەسەر ڕووپەڕی گۆڤار و ڕۆژنامەکان خستووەتە ڕوو.

-ڕاپەڕینی کوردەکانی ١٨٨٠: ئەم کتێبەی جەلیلی جەلیل لە ساڵی ١٩٦٦ لە مۆسکۆ دەرچووە، سەرەتا لەگەڵ ئاماژەکردن بە بایەخدان بە مێژووی کورد لەدوای جەنگی دووەمی جیهانی و پەیدابوونی پسپۆڕی لە بواری لێکۆڵینەوەی مێژوویی کورد، ئینجا دێتە سەر ناوەڕۆکی کتێبەکە کە خۆی کارنامەی دکتۆراشە [(١٧)].

- کورد و هەق: کتێبێکی (تۆماس بوا)یە و بەناوی خوازراوی (لوسیان رامبو) لە ساڵی ١٩٤٧ بە (١٦٠) لاپەڕە لە پاریس بە زمانی فەرەنسی دەرچووە [(١٨)]. لە خستنەڕووی ئەم کتێبە پێیوایە قەرزێکی داوەتەوە بەرانبەر ئەو نووسەرەی کە کتێبێکی بەرزی نووسیوە، ئەرک و ماندووبوونێکی بۆ کۆکردنەوەی ڕاستییەکان کێشاوە و مێژوویەکی پوختەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانی لێ پێکهێناوە، کتێبەکە ئەم سەرناوانەی لەخۆگرتووە: کوردستان و کورد، ئاسن و ئاگر، لە ژێر باڵی هێزی

ئاسمانی پاشایەتی، لەنێوان گورگ و پڵینگ، بای ئازادی، یەکێتی هێزە لە بەردەم ویژدانی جیهانیدا. (عثمان ابوبکر، الاکراد والحق، شمس کردستان، العدد (٥ و٦)، تشرین الاول والثاني ١٩٧١، ص ١٩ – ٢٢، ٣٤).

گەلی کورد و پەرەسەندنی کۆمەڵایەتی: ئەو کتێبە د. مەسعوود فانی، کۆنە والیی تورک بە زمانی فەرەنسی لە ساڵی ١٩٣٣ لە پاریس دەریکردووە. کتێبەکە لە پێشەکی و (٣٧) بەش و کۆتایی و سێ نەخشە و لیستی سەرچاوەکان پێکهاتووە. لەو کتێبەدا سەرچاوەی رەسەن بەکارهاتوون، بە تێڕوانینی کەمالییانە نووسراوە، هەوڵی داوە ورد بێت لە چوارچێوەی بیروبۆچوونی خۆی، بەڵام هەموو بابەتییانە نییە و ناوەڕۆکی کتێبەکە دەخاتە سوود لەو شوێنانەی کە پێویستیش بکات بەپێی سەرچاوەکان بۆ بەرچاوڕوونی و روونکردنەوە ئاماژەی بە سەرچاوەی دیکە داوە، بەمەش هەروا بەئاسانی بەسەر زانیارییەکاندا گوزەری نەکردووە. ئەو کتێبە بە قەوارەیە بەگشتی بە حەوت زنجیرە لە دوو شوێن و کاتی جیاواز بڵاوکراونەتەوە، سەرەتا لە رۆژنامەی (التآخی) لە ساڵی ١٩٧٣ و دواتریش جارێکی دیکە لە ساڵی ١٩٧٩ لە گۆڤاری (شمس کردستان – رۆژی کوردستان) بڵاوکراونەتەوە و ئەوەی دواتر وەک تەواوکردن و فراوانکردن و پوختە و بژارکردنی وتارەکانی پێشتری (التآخی)یە، هەروەک لە روونکردنەوەیەکدا ئاماژەی پێکردووە. (ابوبکر،٢٠٠٩، ص ٤٦٦ – ٥٠٥).

– بنەماکانی رێکخستنی کۆمەڵایەتی لە کوردستانی خوارووی: ئەم کتێبەی فردریک بارس، لە ساڵی ١٩٥٣ بە زمانی ئینگلیزی لە پایتەختی نەرویج چاپ بووە. نووسەری کتێب زانیارییەکانی لە ساڵی ١٩٥١ لە ناوچەکانی کەرکووک و کۆیسنجق و سلێمانی کۆکردووەتەوە، ناوەڕۆکی لێکۆڵینەوەکە ئەمانەن: چالاکی بژێر و پلەی خزمایەتی، رێکخستنی سیاسی رووالەتی، پێکهاتەی خزمایەتی و رێکخستنی تایفەکانی خۆجێیی، نەسەبی قووچەکی و رێکخستنی ناسیاسی، دیمەنێک لە گوند، ریزبەندی پلەکان و بەش بەشی قەوارەکان، کرداری لێک هەڵوەشاندنەوەی هۆز و ئەنجامەکان، بە رای د. ئەحمەد دیارە تا ئەوکاتە لەڕووی زانستییەوە بە قووڵترین لێکۆڵینەوەی داناوە، کە تێیدا لایەنی کۆمەڵایەتی و ئابووری دانیشتووانە کوردەکان لە ناوچەیەکی دیاریکراو بەوردی لێی کۆڵیوەتەوە. ((التآخي)، العدد (١٣٢٤)، ١٩٧٣/٥/٦؛ (١٣٢٥)، ١٩٧٣/٥/٧؛ (١٣٢٦)، ١٩٧٣/٥/٨ ).

کورد: لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتی مێژووییە، کتێبێکی باسیلی نیکیتینی پسپۆڕ لە لیکۆڵینەوەی کوردی لەساڵی ١٩٥٦ بە زمانی فەڕەنسی لە پاریس دەرچووە، سەبارەت بەو کتێبە د. ئەحمەد ئاماژە بەوە دەکات کەوا بەڕاستی گرنگترین کتێبە لەنێو ئەو کتێبانەی بیانییەکان لەبارەی کوردەوەیان نووسیوە، وێڕای ئەمە ئاماژە بەوە دەکات کە ئەو وەرگێڕانە عەرەبییەی لە بەیرووت چاپ بووە، وەرگێڕانێکی ناتەواوە، بە دەرچوونی عەرەبییەکەش رەواجێکی زۆری لای خوێنەران هەبووە، تەنانەت چاپی دووەمیشیان کردووەتەوە، دیارە کتێبە ئەسڵییەکە سێ ئەوەندەی وەرگێڕدراوەکەیە، لەلایەن د. ئەحمەد بەدواداچوونی وردی کردووە. (ابوبکر، حول كتاب "الاكراد"، شمس كردستان، العدد (٤)، حزيران ١٩٧٣، ص ١٤ — ١٥).

جێی سەرنجە لەگەڵ دەستخۆشی لە د. ئەحمەد بۆ خستنەڕووی رووی راستەقینەی ئەو وەرگێڕانە، لە بەدواداچوونی نووسەرێک گلەیی لە زمانزانە بیانییەکانی کورد دەکات کە هەقە ئەوان ئەو سەرچاوانەی مێژووی کورد وەربگێڕن بۆ خوێنەری کورد، کە تامەزرۆی ئەو سەرچاوانەیە و هیچی دی شک نابات، چ بۆ زمانی کوردی یان زمانی عەرەبی وەربگێڕدرێن بەمەش تەکان بە بزووتنەوەی وەرگێڕان لە کوردستان دەدات، سەدان سەرچاوەی مێژووی کورد بە زمانی بیانی نووسراون. (السندي، شكراً للدكتور احمد عثمان، ولكن!، التآخي، العدد (١٣٨٢)، ١٩٧٣/٧/١٢، ص٦).

– مێژووی میدیا: ئەم کتێبە لە نووسینی (ئەی، ی. م. دیاکونوف) بە زمانی رووسی لە مۆسکۆ لە ساڵی ١٩٥٦ بە (٤٨٥) قەوارەی گەورە دەرچووە. کتێبەکە هەر لە مێژووی کۆنەوەڕا بگرە تا کۆتایی سەدەی چوارەمی بەر لە زایین هاتووە. د. ئەحمەد بە فراوانترین و تێروتەسەلترین کتێبی لەو بوارە داناوە تا ئەوکاتە (١٩٧٧)، کتێبێکی فرەزانیاری و فرە بابەتە، دواتر بەش بەش ناوەڕۆکەکەی دەخاتە روو، ئەوەی جێی سەرنجە نووسەری کتێب وێڕای ئەوەی مێژوونووسە، زمانەوانیش بووە بەمەش کارەکەی ئاسانتر بووە و سەرچاوەی بە زمانی جیاجیا بەکارهێناوە، ئەوەش کارێکی گەورەی شایەنی بایەخ پێدانە. (ابوبکر، كتاب ميديا، العراق (جريدة)، بغداد، العدد (٣١٦)، ١٩٧٧/٣/١٠؛ (٣٢٢)، ١٩٧٧/٣/١٧). بۆ زانین ئەم کتێبە دواتر بۆ زمانی کوردی وەرگێڕدراوە[19].

– کوردەکان، لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە: ئەم کتێبە لە نووسینی حەسەن ئەرفەعی باڵیۆزی پێشووی ئێران لە تورکیا و سوپاسالاری پێشووی سوپای ئێرانە و بە زمانی ئینگلیزی نووسیویە و لەساڵی ١٩٦٦ لە لەندەن چاپ بووە،

نووسەری کتێب ئاماژە بەوە دەکات کە بەشێوەیەکی بێلایەن وێنەیەکی مێژووی کورد نیشـان دەدات، خـۆی لە نـزیکەوە تێکەڵـی کـورد بـووە، نـاوەڕۆکی کتێـبەکە: کورتەمێژوویەکی کورد، کورد لە ئێران، کورد لە تورکیـا، کـورد لە عێـراق، کۆتـایی. لەگەڵ نەخشە و وێنە، بە دوو بەش د. ئەحـمەد کتێبەکەی دانـاوە و بە سـەرچاوەی دیکەی نزیک سەرنج و تێبینی دەربڕیوە و ئاماژە بەوە دەکات کە نووسەری کتێـب لە ڕواڵەتـدا هەنـدێ ڕاسـتی بابەتییـانە دەخـاتە ڕوو، بەڵام تـێکەڵ بە بیـر و بۆچـوونی تـایبەتیی خـۆی، بـۆ خـوێنەر دەردەکەوێ کە دەربـڕی بیـر و بۆچـوونێکی دیاریکراوە. (ابوبکر، کتاب الاکراد — دراسة تأريخية سياسية، شمس کردسـتان، العـدد (٥٧)، کـانون الثاني — شباط ١٩٨٠، ص ١١ — ١٥؛ العدد (٥٨)، آذار ١٩٨٠، ص ١١ — ١٤ ).

– کورد – دەستپێک و مێژووی ئەتنۆگرافی گەلـی کـورد: لە نووسـینی ئەو. ل. ڤیلجیفسکی، لە ساڵی ١٩٦١ بە زمانی ڕووسـی لە لینینگـراد بە (١١٦) لاپەڕە چـاپ بووە. ئەو کتێبە باس لە مێژووی کۆنی ناوچەی کوردەواری دەکات هەر لە سـەرەتاوە تـا دەگـاتە دەوروبەری سـەدەی شەشـەمی زایینـی، د. ئەحـمەد بە لێکـۆڵینەوەیەکی زانستی گەورەی دەزانێت، ئەگەرچی هەنـدێ ڕا و بۆچـوون دەردەبڕێـت و دەردەکەوێ کە نامۆ و مـایەی پەسـەندی خـوێنەران نەبێـت. (ابـوبکر، کتـاب الاکـراد — البدايـة والتـأريخ الاثنوغرافي للشعب الکردي، شمس کردستان، العدد (٦٨)، ١٩٨٤، ص ٦ — ٩).

– خولاصەی مێژووی کورد و کوردستان: بەبۆنەی تێپەڕبوونی ٤٠ سـاڵ بەسـەر دەرچوونی " خولاصە"ی محەمەد ئەمین زەکی[٢٠]، د. ئەحـمەد هـاتووەتەوە سـەر ئەو سەرچاوە بایەخدارەی مێژووی کورد، د. ئەحمەد، ئەمین زەکی بە پێشەنگی مێـژووی نوێی کورد دادەنێت، لەگەڵ باسکردنی هەندێ لایەنی جیاواز بەو سەرناوانە: مێـژووی نەتەوەی کورد، لە سوپاوە بۆ دانـان و نووسـین، سـەدان سـەرچاوەی مێژوویـی، ٢٥٠ سەرچاوە، دوو چاپ لە ماوەی بیست ساڵان، پێشەنگی کتێبە مێژووییەکـان، لێـرەدا سـەرناوی نـاوەڕۆکی کتێـبەکە دەخـاتە ڕوو. زۆر بە بەرزی پەسـنی ئەو مێژوونووسـە پێشەنگە دەدات کە بە وردەکارییەکی بەهـادار و شـێوازێکی مێژوویـی بەرز باسـەکانی خسـتووەتە ڕوو. (ابـوبکر، بمناسـبة مـرور اربعـين سـنة علـى صـدور کتـاب "خلاصـة تـأريخ الکـرد وکردستان"، (التآخي)، العدد (٨٧٥)، ١٩٧١/١٠/٣١، ص ٣ — ٩ ).

– کوردستان لە ئێران: لێکۆڵینەوەیەکی بەهاداری د. ئەوڕەحمانی قاسملوویە لە کتێبی (People without Country- گەلی بێ وڵات) کە لە لەندەن بڵاوکراوەتەوە. د. ئەحمەد بەدرێـژی ئەو لێکـۆڵینەوەی خسـتووەتە ڕوو بەو سـەرناوانە: کـوردی ئێـران،

کورتەیەکی جوگرافیایی، دانیشتوان، زمان و ئەدەب، خوێندن، لەشساغی، باری ئابووری، خەباتی چەکداری ١٩٦٧ – ١٩٦٨، کوردستانی ئێران ئێستا و لەدواڕۆژدا، هەڵوێستی جیاجیای هێزە بەرهەڵستکارەکانی ئێران بەرانبەر دۆزی کورد، هەڵوێستی حزبی تودە، بەرەی نیشتمانی، موجاهیدون رێکخراوی فیدائییەکانی گەلی ئێران، حزب و دیموکراتی کورد لە ئێران، مەرجەکانی سەرکەوتن.(ابوبکر، کردستان في ایران – دراسة للدکتور عبدالرحمن قاسملو، الثقافة (مجلة)، بغداد، العدد (٣ – ٤)، آذار – نیسان ١٩٨٤، ص١٠٧ – ١١٩ ).

– کوردستانی تورکیا بەر لە پەرەسەندن: ئەو کتێبە لە نووسینی مەجید جەعفەرە لە ساڵی ١٩٧٦ بە زمانی ئینگلیزی لە فنلەندا دەرچووە و خۆی کارنامەی دکتۆرایە و پشتی بە لێکۆڵینەوەی ئابووری باکووری کوردستان بەستووە و لە حەوت بەش پێکهاتووە، سەرەتا خستنەڕووی شێوازی لێکۆڵینەوەکە، پاشخانی مێژوویی، ئابووریی ناوچە کوردییەکان، دانیشتوانی ناوچەکە، سیاسەتی تورکیا بەرانبەر بە ناوچەکە، نایەکسانی لە ئاستی گوزەران لە نێوان ناوچە کوردییەکان و ناوچەکانی دیکەی تورکیا و ئەنجام. (ابوبکر، کتاب "ماقبل التطور"، کاروان (مجلة)، اربیل، العدد (٥٦)، حزیران ١٩٨٧).

– کورد رێبەری چڕ (The Kurds: A concise Handbook): لە نووسینی میهرداد، بە زمانی ئینگلیزی لە ساڵی ١٩٩٢ لە واشنتۆن دەرچووە، کتێبێکی زانستی سەرلەبەری باس لە کورد و کوردستانە، بابەت و حوکمەکانی جێی بڕوان و لە دەراوی راستی و مادە زانستی و زانیارییەکانی هەڵێنجاوە، کتێبێکی دەوڵەمەند بە زانیاری و بابەتگەلی جۆراوجۆر. نووسەر سەرلەنوێ نووسینەوەی مێژووی کورد ئەرکێکی گران. بەلای دکتۆر ئەحمەدەوە ئەو کتێبە ئامانجی خۆی پێکاوە، چونکە مێژووی کوردت بەشێوەیەکی پانۆڕامیی سەرنجراکێش دەخاتە بەردەست، هەر لە مێژووی کۆن پاشان ناوەڕاست و ئینجا نوێ. (ابوبکر، قراءة في کتاب الکرد.... دلیل الوجیز، خەبات (جریدة)، اربیل، العدد (٨٤٥)، ١٩٩٧/١٠/١ ).

را و بۆچوونی ڕووناکبیران لەبارەی (د. ئەحمەد) ەوە: هەروەک لە پێشتردا ئاماژەی پێکرا سەبارەت بە ڕەتکردنەوەی نازناوی پرۆفیسۆری لەلایەن د. ئەحمەدی عوسمانەوە، لەو بارەیەوە د. مارف خەزنەداری هاوڕێی منداڵی و خوێندنی ئەو هەڵوێستەی د. ئەحمەدی زۆر پێ ئازایانە و راستگۆیانە و جوانە و پێیوایە د.ئەحمەد وەک زانایەکی ئەوروپایی تەماشای ئەو مەسەلەیە دەکات، بەتایبەتی لە ڕووی

شارەزایی و زانینی زمانی بێگانە، کە زۆر پێویستن، ئەوەش لێرە دەگمەنە و تەنانەت دەڵێت خەریکە پرۆفیسۆرمان لێ پەیدا دەبێت زمانی عەرەبیش نازانێت.(ئەبوبەکر، هەولێر، ژمارە (٢١)، ٢٠٠٧/٤/١٩، ل ٣).

وەک د. مارف نووسیویە، د. ئەحمەد وەک پێویستە ئاوڕی لێ نەدراوەتەوە، ئەو بە هێمنی و لەسەرخۆ خزمەتی مێژوو و جوگرافیا و کولتووری ئەم خاک و میللەتەی کوردی کردووە، ئەوەندەی خەریکی زانست بووە، ئەوەندە ئاوڕی لە کەسێتیی خۆی نەداوەتەوە، لەبەرئەوەی خەریکی زانست بوو، دەبوا رێزی پێویستی لێ بگیرێت، نیو سەدە خزمەتی کردووە بە وانەگوتنەوە و کتێب نووسین لە ژوورێکی بچووک بژی..( ئەبوبەکر، هەولێر، ژمارە (٢١)، ٢٠٠٧/٤/١٩، ل ٣ ).

د. ئیبراهیم عەلافیش لەبارەی د. ئەحمەد نووسیویە: د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر مامۆستایەکی باش، لێکۆڵەرێکی بەتوانا، مرۆڤێکی چاک، بەشداری زۆری لە چالاکی زانستیدا کردووە، لە کۆنگرە نێودەوڵەتییەکانی مێژوو لە ناوەوە و دەرەوەی عیراق بەشداربووە، لە کۆلێژی نیشتمانی لە لوبنان و لە قوتابخانەکانی دواناوەندی لە سوریا وانەی گوتووەتەوە و سەدان لێکۆڵینەوە و توێژینەوە و وتاری لە گۆڤار و رۆژنامەکان بە عەرەبی و بەکوردی هەیە و چەندین دانراویشی هەیە. هەر د. ئیبراهیم عەلاف پێیوایە لەسەر ئاستی کەسی و زانستیش بە زەحمەت لە د. ئەحمەد گەیشتوون، هیچ لێکدانەوەیەکیشم بۆ ئەمە نییە، جگەلەوەی وادیارە هەندێ جار زوو هەڵچووە و بەهیچ جۆرە پاساوێک هەڵەی قبووڵ نەکردووە. ( ابوبکر،٢٠٠٩، ص ٥٦٤).

سەبارەت بە کارەکانی د. ئەحمەد، د. کەمال مەزهەر، لەگەڵ بەسەرکردنەوەی بابەتە دیارەکانی د. ئەحمەد و بەرهەمەکانی بە بەنرخ لەقەڵەم داوە بۆ کتێبخانەی مێژوویی کوردی، ئەو دەڵێت بەرهەمەکانی لەرووی ناوەڕۆک و سەرچاوە دەوڵەمەندن و بایەخیان زۆرە، بەڵام لەرووی داڕشتنەوە کەمێک لاوازن، وێنەی تێروپڕ لە مێشکی خاوەنەکەیاندایە، بەڵام لە دەربڕین کورتیان هێناوە، هەر لەبەرئەوەشە کەمتر خوێنەر بۆ خۆی رادەکێشێت، بەدەگمەن هەست بە بوونی نووسەر دەکرێت، زیاتر قسەی نووسەرانی دیکەیە، بەڵام پاشان دەڵێت، ئەم وردە کەموکورتییانە نە زۆر نە کەم لە بایەخی بەرهەمەکانی د. ئەحمەد کەم ناکەنەوە، ئەو بەسەر هەموو مەرجە پێویستەکانی نووسینی مێژوویدا زاڵە.(مەزهەر، ٢٠٠١، ل ٢٢٢ — ٢٢٦.).

## ئەنجام

د. ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر (١٩٣٠ – ٢٠١٤)، یەکێکە لە دەستەی یەکەمی مێژوونووسە کوردە، بەراییەکانی مێژووی نوێی کورد، کە ئەکادیمییانە و بە ڕێبازی زانستی مێژووی نوێی کوردی نووسیوەتەوە، وەک کەسایەتی، وێڕای زیرەکی، جۆرێک شانازی و ڕەقەکاری پێوە دیاربووە.

وەک کەسێکی زیرەک و بەهرەدار، بواری بۆ ڕەخسا، هەموو قۆناغەکانی خوێندن بە پلەی یەکەم تەواو بکات و فێری زمانە زیندووەکانی رووسی و ئینگلیزی و فەرەنسی، وێڕای کوردی و عەرەبی ببێت و خزمەتی نووسینی مێژووی کوردیان پێبکات.

نامە زانستییەکەی لەبارەی بزووتنەوەی رزگاری نیشتمانی کورد (١٩٠٠ – ١٩٢٥)، کارێکی گەورەی سەردەمێکی زۆر هەستیار و گرنگی مێژووی کوردە، ئەمە جگە لە دەیان لێکۆڵینەوە و وتار و بابەتی مێژوویی جۆراوجۆر و وەرگێڕان و خستنەڕووی کتێبی مێژوویی تایبەت بە کورد کە بە زمانی بیانی نووسراون، سەرباری موعادەلەی گۆڕینی مێژووی زایینی بۆ کۆچی و بە پێچەوانەشەوە بە ڕێگای زۆر ئاسان و کورت و خێرا و یارمەتی زۆر بە توێژەر و ئەوانەی مەبەستیانە دەکات.

جگە لەمانە، د. ئەحمەد لە پێشەوەی ئەوانەیە کە بەڵگەنامەی مێژوویی ئەرشیفی بەریتانیایان لە نووسین و توێژینەوەکانیان بەکارهێناوە، ئەمەش ئەنجامی زمان زانینەکەیەتی، بەڵام ئەوەی گلەیی لە د. ئەحمەد دەکرێت ئەوەیە کە لە توێژینەوەکانیدا زۆر کەم هەست بە بیر و بۆچوون و لێکدانەوەی خۆی دەکرێت، پتر لێکدان و کۆکردنەوە و ریزکردنی سەرچاوەکانە.

لەپاڵ ئەمانەش سەرپەرشتی چەندین نامەی مێژوویی ماستەر و دکتۆرای لە زانکۆی سەلاحەددین - هەولێر – کۆلێجی ئەدەبیات کردووە، وێڕای بەشداربوون لە گفتوگۆی نامەکانیش.

- د. ئەحمەد وەرگێڕێکی باشە بە رووسی و ئینگلیزی و عەرەبی.
- سەرباری ئەمانە هەمووی، لە بواری زانستیش بەرهەمی هەیە بەتایبەتی (ئەندازەی بۆماوەیی) وەک زانستێکی نوێی سەردەم بایەخی پێداوە.
- د. ئەحمەد بە زمانی ئینگلیزیش بابەتی چ بە نامیلکە چ لە ڕۆژنامەکان بڵاوکردووەتەوە.

**پەراوێزەکان:**

(١) پیاوچاکێکە مەزاری لە حاجی ئۆمەرانی سەر بە شارەدێی چۆمانە.

(٢) ناوی محەمەد کوڕی عەبدوڵڵا کوڕی یوسف کوڕی عوسمان کوڕی ئەلیاس کوڕی حوسین باڵەکییە لە گوندی (ڕۆست) لە ناوچەی باڵەک لە ساڵی (١١٩٤ک / ١٧٥١ز) لەدایک بووە، لای باوکی و زانایانی سەردەم خوێندوویەتی، بووەتە زانایەکی ناودار لە زانستە ئایینییەکان و ڕاوێژکاری میری سۆران (محەمەد پاشای ڕواندزی)یش بووە و دانراوی زۆری هەیە بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە: ( الخال، ١٩٦١، ص ١٠٣ – ١٠٥؛ العمادي، ١٩٨٩؛ اسماعیل ، ١٩٨٤، ص ١٠٢ – ١٠٨).

(٣) وێڕای گەڕانێکی زۆر هیچ زانیاریمان لەبارەیەوە دەست نەکەوت.

(٤) پێشتر لە هەمان لاپەڕە نووسیویە ئەم عیسایە یەکێکە لە کوڕەکانی مەلا محەمەد کەچی لێرە بووەتە باوکی مەلا ئەبوبەکر. (بێخاڵی، ١٩٩٧ ، ل ١٠٦)

(٥) کاکەسوور، ل ٣١٩. بەپێی سەرچاوەکان بۆ یەکەمین جار کارەبا لە ڕۆژی ٨ی تشرینی دووەمی ١٩٣٠ بۆ هەولێر دانراوە. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد، ئامادەکردنی: عەبدوڵڵا زەنگەنە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠١، ل٣١٦. هەروەها سەبارەت بە بۆڕی ئاویش، ئەوا لە سەردەمی عەبدوڵڵا پاشا لە نێوانی ساڵانی (١٩١٣-١٩١٨)ی سەرۆکی شارەوانی هەولێر بووە، لە کارێزی کەسنەزانەوە بە تۆڕێکی سادەی بۆڕی گلێنە ئاو ڕاکێشراوە بۆ ناو هەولێر، دواتریش لە سەردەمی داود ئاغای سەعید ئاغای سەرۆکی شارەوانی هەولێر لە نێوان ساڵانی (١٩٢٤-١٩٢٨ ) ئاو لە کارێزی میری بە بۆڕی بۆ قەڵا ڕاکێشراوە، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە (گەزنەیی،١٩٧٧، ص٥٦).

(٦) خەزنەدار، ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، هەولێر، ژ (٢١)، ٢٠٠٧/٤/١٩، ل ٣؛ جەواد، ٢٠١٦، ل ٣٩؛ دیدار لەگەڵ زیوەر خەتاب لە ڕۆژی ٢٠١٧/٨/١ هەولێر، ناوبراو لە ساڵی ١٩٣١ لە هەولێر لەدایک بووە، هاوپۆلی د. ئەحمەد عوسمان بووە، کۆلێجی حقوقی بەغدای تەواو کردووە، ڕۆشنبیرێکی دیاری هەولێرە. دیبەگەیی، سەردان، هەولێر، ژ. (١)، تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦، ل ٣.

(٧) العلاف، ص ٥٦٢؛ لە شوێنێکی دیکە دەڵێ لە ساڵی ١٩٥٤ خوێندنی تەواو کردووە.

(٨) الاثار الکاملة للدکتور احمد عثمان ابوبکر، الجزء الاول، ص ٢٤٥ – ٣٣٣. وادیارە د.ئەحمەد لە هەر دیدارێکدا ژمارەیەکی گوتووە، بەڵام بە گەڕانەوە بۆ ڕۆژنامەی (التآخی) دوائەڵقەی (٣١) بوو.

(٩) نووسراوی سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین – هەولێر/ ڕاگەیاندن ژمارە (٤٩٧٣/٢/٤ لە ١٩٩٣/٩/١٨.

(١٠) بڕوانە: خەزنەدار، ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، هەولێر، ژمارە (٢١)، ٢٠٠٧/٤/١٩، ل ٣؛ خەزنەدار، ٢٠٠٩، ل ١٩٤.

(١١) جەواد ، ٢٠١٦، ل ٣٥. لە بەدواداچوونێکی توێژەر لە ڕێگای تارق جامبازەوە، خالس جواد، ئەوەی ڕاست کردووەتەوە کە حیزبی (هیوا) بووە. پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ تارق جامباز، ٢٠١٧/٨/١٥.

(١٢) صدى الاهالي: ڕۆژنامەیەکی سیاسیی ڕۆژانە بوو، کامل چادرچی خاوەنی بووە، پارێزەر عەبدولمەجید وەنداوی بەڕێوەبەری بەرپرسی بووە، ژمارە (١) لە بەغدا لە ١٨ی ئەیلوولی ١٩٤٩ دەرچووە : (ابراهیم ، ١٩٨٢، ص ١٤٥).

(١٣) دیارە هەوڵی لە پێشتر زۆر هەن لەو بارەیەوە بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: محمد، التقاويم، سلسلة الف كتاب (١٦٣)، مصر، ١٩٥٨، يوسف اوربيلي، جداول لتحويل السنوات الهجرية الى السنوات الميلادية، "المورد" (المجلة)، بغداد، العددين (٣ و ٤)، ١٩٧٤.

(١٤) ئەم توێژینەوە کراوەتە کوردی، بڕوانە: (ئەبوبەکر، ٢٠٠٥، ل ٣٩ — ٥٩).

(١٥) بۆ زانیاریش ئەم کتێبە بەناوی (خەبات لەڕێی کوردستاندا) لەلایەن جەلال تەقی لە ڕووسییەوە کراوەتە کوردی و لە ساڵی ١٩٧١ لە چاپخانەی ڕاپەڕین لە سلێمانی چاپ بووە و (٢٢٤) لاپەڕەیە.

(١٦) جێی خۆیەتی ئاماژە بەوە بکەم کەوا کاتی خۆی کۆمەڵە وتارێکی د. ئەحمەدم لەسەر داوای دەزگای موکریان کردە کوردی، ئەوەبوو لە ساڵی ٢٠٠٤ چاپ و بڵاوکرایەوە، هەر لەگەڵ ئەو کتێبەش (کوردی مللی و ئیبراهیم پاشا)شم کردبووە کوردی و دەستنووسەکەم کۆپی نەکردبوو، دانەی ئەسڵییەکەم دابووە دەزگاکە، دواتر کە دەزگاکە شوێنی گواستەوە، زۆر هەوڵم دا وەری بگرمەوە، چونکە چاپیان نەکرد، بەڵام گوتیان بزر بووە، چەندین جار داوام لە کاک ئاسۆ کەریم کرد کە بەرپرسی دەزگاکە بوو، گوتی لەهەر شوێنێ سەری هەڵدا ئێمە شاهێدین کە تۆ وەرت گێڕاوە، بەداخەوە تا ئێستا دیار نییە و ڕەنجەکەم بەخەسار چوو!

(١٧) بڕوانە: ابوبكر، الثورة الكردية عام ١٨٨٠، شمس كردستان، العدد (١)، حزيران ١٩٧١، ص ١٣ — ١٥، ٢٨؛ ئەم کتێبە لە ساڵی ١٩٨٧ لەلایەن د. کاوس قەفتان کراوە بە کوردی و لە چاپخانەی (الزمان)، لە بەغدا چاپ بووە.

(١٨) بۆ زانین ئەو کتێبە هەموو وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی. بڕوانە: (رامبو، ١٩٩٨ حواشیه).

(١٩) بڕوانە: ئی. م. دیاکونوف، میدیا، برهان قانع لە فارسییەوە کردوویەتی بە کوردی، بەغدا، ١٩٧٨، (٨٨٧)، ل٣١.

(٢٠) بەرهەمەکانی محەمەد ئەمین زەکی چەندین جار و لە شوێنی جیاجیا بڵاوکراونەتەوە، تا کورد ماوە بایەخی خلاصة و مێژوو و گەورەیی ئەو مێژوونووسە هەر دەمێنێ.

**سەرچاوەکان**

**أ- کوردی:**

**١- کتێب:**

-ئەبوبەکر ، ئەحمەد عوسمان (د.)، **کورد و کوردستان لە کۆمەڵە وتارێکی مێژوویيدا،** وەرگێڕانی: ئازاد عوبێد ساڵح، دەزگای موکریانی، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.

-ئی. م. دیاکونوف، **میدیا**، برهان قانع لە فارسییەوە کردوویەتی بە کوردی، بەغدا، ١٩٧٨.

-ئەرفەع ، حەسەن ، **کوردەکان،** و: حامید گەوهەری، چ. منارە، هەولێر، ٢٠٠٧.

-ئەحمەد ، کەمال مەزهەر (د.)، **چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد،** ئامادەکردنی: عەبدوڵڵا زەنگەنە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریان، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠١.

-ئەحمەد ، کەمال مەزهەر (د.)، **مێژوو، کورتەباسێکی زانستی مێژوو و کورد و مێژوو،** چاپخانەی دار آفاق عربیة، بەغدا، ١٩٨٣.

-بەرزی ، عەلی کەمال، **کەسایەتی ناودارانی کورد/ سەدەی بیستەم،** بەرگی یەکەم، هەولێر، ١٩٩٩.

-بێخاڵی ، مەولود ، **هەولێرم وا دیوە و بیستووە، بەرگی دووەم،** لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری ژمارە (٣٣)، چ. رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧.

-بایەزیدی ، مەلا مەحمود ، **داب و نەریتی کوردەکان،** وەرگێڕانی لە رووسییەوە بۆ دیالێکتی کرمانجی خواروو: د. شوکریە رەسوڵ، چ. العدالة، بەغدا، ١٩٨٢.

-جەواد، خالیس شێخ، **نیو سەدە زیاتر لە بواری پەروەردەدا (یادەوەری)،** چ. رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠١٦.

-رەسوڵ ، شوکریە (پ. د.)، **رۆڵی مارگریت روودینکۆ لە بووژاندنەوەی کەلەپووری کورددا،** چ. زانکۆی سەلاحەددین هەولێر، ٢٠٠٩.

-خەزنەدار ، مارف (د.)، دیجلەی هەزرم، بەرگی دووەم، دەزگای موکریان، چ. خانی، هەولێر، ٢٠٠٩.

-قەفتان ، کاوس (پ. د.)، **بیرەوەری چەند رووداوێک لە ژیانما ١٩٣٣ — ٢٠٠٨**، سلێمانی، ٢٠٠٨.

-کەمال رەئووف محەمەد (بابی لالۆ)، **مێژووی رادیۆی کوردی ١٩٣٩- ١٩٥٨**، بەرگی یەکەم، جزمی سێهەم، چ. وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ٢٠١٤.

- مصطفی نەریمان، **بیبلۆگرافیای دووصەد ساڵەی کتێبی کوردی ١٨٧٥ — ١٩٨٦**، دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، چ. الزمان، بەغدا، ١٩٨٨.

- **وتار لە گۆڤار و رۆژنامەکان:**
- ئەبوبەکر ، ئەحمەد عوسمان (د.)، ئایا مێژووی کورد نووسراوەتەوە؟، دەفتەری کوردەواری، بەرگی یەکەم، کانوونی دووەمی ١٩٧٠.
- ـــــــــــــــ، موعادەلەی ئەو پێوەندییەی لەنێوان مێژووی زایینی و کۆچیدا هەیە، گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات، زانستگای بەغدا، ژمارە (٢٠ — ٢١)، ١٩٧٧.
-دیبەگەیی ، نافیع ، سەردان، هەولێر (هەفتەنامە)، ژمارە (١)، تشرینی یەکەمی ٢٠٠٦، ٢٠٠٧/٣/١.
-خەزنەدار مارف (د.)، ئەحمەد عوسمان ئەبوبەکر، هەولێر، ژ (٢١)، ٢٠٠٧/٤/١٩.
-کاکەسوور ، محەمەد عەبدوڵڵا ، دیدارێک لەگەڵ د. ئەحمەد عوسمان، "مێژوو" (گۆڤار)، ژمارە (٤)، پایزی ٢٠٠٧.

٣- **گۆڤار و رۆژنامە:**
-"سلێمانی" (گۆڤار)، سلێمانی، ژمارە (٥٩)، حوزەیرانی ٢٠٠٥.
-هاوکاری (رۆژنامە)، بەغدا، ژمارە (١٣)، ١٩٧٠.

٤- **دیدار و تەلەفۆن:**
-دیدار لەگەڵ زیوەر خەتاب لە رۆژی ٢٠١٧/٨/١ .
-پەیوەندی تەلەفۆنی لەگەڵ تارق جامباز، ٢٠١٧/٨/١٥

٥- **بەڵگەنامە:**
— أمر جامعي، نقل خدمات الصادرة من رئاسة جامعة صلاح الدين/ قسم الشؤون القانونية والإدارية/ الافراد/ المرقم (١١٨٢/٢/٤) في ١٩٩٣/٣/٩— امر اداري/ مباشرة المرقم (٨٢٩/٢/٤) في ١٩٩٣/٣/١٦ الصادرة من كلية الاداب — الافراد.
نووسراوی سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەددین — هەولێر/ راگەیاندن ژمارە (٤٩٧٣/٢/٤ لە ١٩٩٣/٩/١٨.

**ب— عەرەبی:**

**١— الكتب:**
ا— ابوبكر ، احمد عثمان (د.)، كردستان في عهد السلام بعد الحرب العالمية الاولى، رابطة كاوة للثقافة الكردية، ط ١، اربيل، ٢٠٠٢.
— اسماعيل ، زبير بلال ، علماء ومدارس اربيل، مطبعة الزهراء الموصل، ١٩٨٤.
ــــــــــــ، اكراد الملي وابراهيم باشا، مط. دارالجاحظ، بغداد، ١٩٧٣.
— الاثار الكاملة للدكتور احمد عثمان ابوبكر، اعداد: د. ازاد عبيد صالح، ج١ و٢، مركز ژين، السليمانية، ٢٠٠٩.

– العمادي ، رشيد احمد رشيد ، ابن ادم وجهوده النحوية، رسالة ماجستير قدم الى قسم اللغة العربية كلية الاداب، جامعة صلاح الدين (غير منشورة)، تشرين الاول ١٩٨٩.
– رامبو ، لوسيان ، الكرد والحق، ترجمه وقدم له ووضع حواشيه: عزيز عبدالاحد نباتي، وزارة الثقافة، مط. الثقافة، ١٩٩٨.
– العلاف ، ابراهيم (د.)، الدكتور احمد عثمان ابوبكر والبواكير الاولي لتدوين تأريخ حركة تحرر الشعب الكردي، الاثار الكاملة.
– الخال ، محمد ، (الشيخ معروف النودهي البرزنجي)، مطبعة دار التمدن، بغداد، ١٩٦١.
– ن. أ. خالفين (د.)، الصراع على كردستان (المسألة الكردية في العلاقات الدولية خلال القرن التاسع عشر)، ترجمة: د. احمد عثمان ابوبكر، مطبعة الشعب، بغداد، ١٩٦٩.
– نيكتن ، باسيل ، الاكراد، ترجمة: د. نوري الطالباني، دار آراس للطباعة والنشر، مط. وزارة التربية، اربيل، ٢٠٠٤.

**٢– مقالات في الجرائد والمجلات:**

– ابوبكر ، احمد عثمان (د.)، كتاب الاكراد – البداية والتأريخ الاثنوغرافي للشعب الكردي، شمس كردستان، العدد (٦٨)، ١٩٨٤.
________، بمناسبة مرور اربعين سنة على صدور كتاب "خلاصة تأريخ الكرد وكردستان"، (التآخي)، العدد (٨٧٥)، ١٩٧١/١٠/٣١.
________، كردستان في ايران – دراسة للدكتور عبدالرحمن قاسملو، الثقافة (مجلة)، بغداد، العدد (٣ – ٤)، آذار – نيسان ١٩٨٤.
________، كتاب "ماقبل التطور"، كاروان (مجلة)، اربيل، العدد (٥٦)، حزيران ١٩٨٧.
________، قراءة في كتاب الكرد.... دليل الوجيز، خەبات (جريدة)، اربيل، العدد (٨٤٥)، ١٩٩٧/١٠/١.
________، كتاب ميديا، العراق (جريدة)، بغداد، العدد (٣١٦)، ١٩٧٧/٣/١٠؛ (٣٢٢)، ١٩٧٧/٣/١٧.
________، ذكريات عن تأسيس المجمع العلمي الكردي وجامعة السليمانية، خەبات، العدد (٨٧٥)، ١٩٩٨/٥/٢٢.
________، حركة التحرر للشعب الكردي ١٩٠٠ – ١٩٢٥، الحلقة الاولى، التآخي، العدد (٢٥٨)، ١٩٧٠/٦/٩.
________، حركة التحرر للشعب ..، ح (٣١)، التأخي، العدد (٦٧٥)، ١٩٧١/٣/٣.
________، معادلة العلاقة بين التاريخين الميلادي والهجري، العراق (جريدة)، بغداد، العدد (٤٨)، ١٩٧٦/٤/١٥.
________، معادلة العلاقة بين التاريخين الميلادي والهجري، (الثقافة)، العدد (٧)، تموز ١٩٧٩.

ــــــــــــــ، الهيستوريوغرافيا و التأريخ الكردي، العراق، الاعداد ( ٥و ٦ و٧)، ٢٣ و٢٤ و٢٥/ شباط ١٩٧٦.
ــــــــــــــ، مناقشات حول كلمة (زم) وماورد في معجم البلدان لياقوت الحموي، العراق، العدد (٣٦٩)، ١٢/٥/١٩٧٧؛ العدد (٣٧٥)، ١٩/٥/١٩٧٧.
ــــــــــــــ، ذكر الكرد واصلهم في كتابات المسلمين الاوائل، مجلة المجمع العلمي العراقي — الهيئة الكردية، العدد (١٣)، ١٩٨٥.
ــــــــــــــ، من التأريخ والتراث — امثلة عن بطولات كردية، العراق، العدد (٣٣٤)، ٣١/٣/١٩٧٧، العدد (٣٤٣)، ١١/٤/١٩٧٧.
ــــــــــــــ، محمد ابن ادم العالم الكردي الكبير، شمس كردستان، العدد (٦)، تشرين الاول والثاني ١٩٧٣.
ــــــــــــــ، الملا محمود البايزيدي، الصوت الاخر (مجلة)، اربيل، العدد (٢١٨)، ١٢/١١/٢٠٠٨.
ــــــــــــــ، هكذا نذكر الشيخ عبدالسلام البارزاني، شمس كردستان، العدد (٥)، آب ١٩٧٣.
ــــــــــــــ، ابراهيم باشا الملي جانب من التأريخ الكردي المعاصر، التآخي، العدد (١١٥٩)، ١٠ تشرين الاول ١٩٧٣.
ــــــــــــــ، حان وقت التخليد لنخلد آثار الشيخ محمود الحفيد فقد كان زعيماً وطنياً لامته، التآخي، العدد (٩٥٩)، ١٣ شباط ١٩٧٢.
ــــــــــــــ، في ذكرى استشهاد المناضل قاضي محمد، التآخي، العدد (٩٩٧)، ٢ نيسان ١٩٧٢.
ــــــــــــــ، دقائق الصمت امام قبر الشهيد خيرالله عبدالكريم، خەبات، العدد (٨٨٣)، ١٧/٧/١٩٩٧.
ــــــــــــــ، في ذكرى ميلاد الزعيم المناضل البارزاني مصطفى....، الصوت الاخر، العدد (١٣٦)، ٧/٣/٢٠٠٧.
ــــــــــــــ، أسطر من ذكرى أربيل عن فاضل الجمالي، خەبات، العدد (٨٢٦)، ٨/٨/١٩٩٧.
في ذكرى اديب كردستان علي فتاح دزەيی، خەبات، العدد (٨٤٩)، ٧/١١/١٩٧٩.
ــــــــــــــ، بعض الذكريات مع الشاعر عبدالوهاب البياتي، خەبات، العدد (٩٤٦)، ١٥/١٠/١٩٩٩.
ــــــــــــــ، حول التربية والتعليم، التآخي، العدد (٧٧٠)، ٢٨/٦/١٩٧١.
ــــــــــــــ، المعلم الكردي، التآخي، العدد (٧٦٣)، ٢٠ حزيران ١٩٧١.
ــــــــــــــ، قالوا في العلم والادب وعلماء الاكراد، التآخي، العدد (٨٨٤)، ١٠/١١/١٩٧١.
ــــــــــــــ، درسيم ثورة كردية مستمرة، التآخي، العدد (٩٢٠)، ٢٥/١٢/١٩٧١.
ــــــــــــــ، حركة الشيخ عبدالسلام البارزاني، التآخي، العدد (٨٦٩)، ٢٤/١٠/١٩٧١.

ــــــــــــــ، انتفاضة درسيم الكردية في كردستان الشمالية ١٩٢٠ – ١٩٢١، خەبات، العدد (٨٨٩)، ١٩٩٨/٨/٢٨؛ (٨٩٠)، ١٩٩٨/٩/٤.

ــــــــــــــ، في ذكرى ثورة الشيخ سعيد پيران، التآخي، العدد (٧٦٢)، ١٩ حزيران ١٩٧١.

ــــــــــــــ، ثورة اگرى داغ الكردية في تركيا، التآخي، العدد (٨٢٦)، ١٩٧١/٩/٦.

ــــــــــــــ، ايلولان وثورة واحدة، التآخي، العدد (٨٢١)، ١١ أيلول ١٩٧١.

ــــــــــــــ، الثورة الكردية عام ١٨٨٠، شمس كردستان، العدد (١)، حزيران ١٩٧١.

ــــــــــــــ، الاكراد والحق، شمس كردستان، العدد (٥ و٦)، تشرين الاول والثاني ١٩٧١.

ــــــــــــــ، حول كتاب "الاكراد"، شمس كردستان، العدد (٤)، حزيران ١٩٧٣.

ــــــــــــــ، كتاب الاكراد – دراسة تأريخية سياسية، شمس كردستان، العدد (٥٧)، كانون الثاني – شباط ١٩٨٠، ص ١١ – ١٥؛ العدد (٥٨)، آذار ١٩٨٠.

ــــــــــــــ، الكرد في كتابات المسلمين الاوائل – ذكر مواطن وطوائف الاكراد، "مجلة كلية الاداب" (جامعة بغداد)، العدد (٢٤)، ١٩٧٩.

– السندي ، بدرخان ، شكراً للدكتور احمد عثمان، ولكن!، التآخي، العدد (١٣٨٢)، ١٩٧٣/٧/١٢.

– علي ، هرمان ، المؤرخ الكردي احمد عثمان....، الصوت الاخر (مجلة)، اربيل، العدد (١٩٨)، ٢٠٠٨/٦/٨.

– مصطفى ، طاهر ، حوار مع الاكاديمي المتخصص في التأريخ د. احمد عثمان ابوبكر، زاگروس (مجلة)، اربيل، العدد (١٥)، ٢٧/شباط ١٩٩٩.

٣– الجرائد والمجلات:

– التآخي، العدد (٤٥٩)، ١٩٧٠/٦/١٠؛ العدد (٩٥٩)، ١٣ شباط ١٩٧٢؛ د. احمد عثمان ابوبكر، الزعيمة الكوردية (قره فاطمة) في حرب القرم، (خەبات)، العدد (٨٣٩)، ١٩٩٧/٨/٢٩؛ العدد (١٣٢٤)، ١٩٧٣/٥/٦؛ (١٣٢٥)، ١٩٧٣/٥/٧؛ (١٣٢٦)، ١٩٧٣/٥/٨؛ العدد (٤٨٢)، ٨ تموز ١٩٧٠.

الثقافة (مجلة)، بغداد، العدد (٨)، آب ١٩٧٩؛ العدد (٢)، تموز ١٩٨٧.

– شمس كردستان، العدد (١)، حزيران ١٩٧١؛ العدد (٨) مايس ١٩٧٢؛ العدد (٢)، تموز ١٩٧١؛ العدد (٧)، آذار ١٩٧٢؛ العدد (٦٩)، نيسان ١٩٨٥.

**٣– كتێب بە زمانی ئینگلیزی:**

1- Dr. Ahmed Osman Abu-Bakr, Mono Homo Sampiens (The New Human). AL – Jamenm Printing press – Baghdad, 1983.

Kurdistan News, No. (9), November 1993.

2- Dr. Ahmed Osman AbuBakr, The Kurdish Question, the first war and it is aftermath, Kurdistan Times No. (20), September 1994,3- Dr. Ahmed Osman Abu-Bakr, Baghdad, 1985.

## ملخص البحث

### د. احمد عثمان ابوبكر ١٩٣٠ – ٢٠١٤
### حياته ونتاجاته

يتناول البحث احد المؤرخين الرواد الذين خدموا في كتاباتهم تاريخ الشعب الكوردي ويتكون من ثلاثة محاور هى : اسرته و ولادته وثقافته وانخراطه في العمل السياسي ، ثم نتاجاته وبحوثه الاكاديمية الخاصة بتاريخ الكورد وكوردستان، هذا فضلاً عن ترجمتة للكثير من المواضيع التأريخية والفكرية في التاريخ والادب، واخيراً سجلنا رأي العديد من الكتاب والمثقفين به ، واعتمد البحث على الكثير من المصادر المتنوعة.

## Abstract

**Dr. Ahmed Othman Abu Bakir ( 1930- 2014)**

Dr. Ahmed Othman Abu Bakir (1930-2014) Dr. Ahmed's biography This paper examines a biography of one of the most famous Kurdish Academic author (Dr. Ahmed Othman Abu Bakir). This paper is a kind of loyalty for his efforts in writing about Kurdish history. Basically, This paper contains three different parts. First, Dr. Ahmed's biography for instance (his birth). Second, his engagement and roles in politics and the third part is emphasizing on his academic researches, his Translation from foreign languages and his historical articles about Kurdish leaders and Kurdish authors. However, many articles were written about Kurdish revolution ( uprising) by him. Meanwhile, he showed many historical books from different languages about Kurdish and then tried to get opinions about them from Kurdish authors and intellectuals. This paper based on some reliable sources that they are available at the end of this paper.

# لایەنە نەرێنییەکانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە عێراقدا

**پ.د. محەمەد عەبدوڵڵا کاکەسوور**
بەشی مێژوو - کۆلێژی ئەدەبیات-
زانکۆی سەلاحەددین-هەولێر

**پێشەکی**

١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ قۆناغێکی مێژوویی گرنگە لە مێژووی عیراقی هاوچەرخدا. هەرچەندە نووسینی زۆر لە سەر ئەو رووداوە نووسراوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی بۆ جەختکردنەوە لەسەر لایەنە ئەرێنییەکانی و زیاتر ئەم رووداوە بە شۆڕش ناونراوە بە تایبەتی لە ساڵانی یەکەمی ڕووداوەکە. ئێستا دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە نیو سەدە بەسەر ئەم رووداوەدا دەکرێت توێژینەوەی نوێ لە سەر لایەنە جۆر بەجۆرەکانی ئەم رووداوە بکرێت. ئێمەش ئەنجامە نەرێنییەکانی شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ مان کردە ناونیشانی ئەم توێژینەوەیە. چونکە تاکو ئێستا هیچ نووسینێک لە شێوەی کتێب یان توێژینەوە بەم ناونیشانە نەنووسراوە. لە کاتێکدا هەر رووداوێکی مێژوویی سەرەڕای لایەنی ئەرێنی لایەنی نەرێنیشی هەیە، بێگومان ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە عێراق لایەنی ئەرێنی هەیە و لە سەرچاوە جۆربەجۆرەکان زۆری لەسەر نووسراوە بەڵام لە لایەنی نەرێنی بە دوور نییە ئەوەی لەم توێژینەوەیەدا جەختی لە سەر کراوەتەوە.

لە سەرەتادا جیاوازیی شۆڕش و کودەتا خراوەتە ڕوو، روونکراوەتەوە بۆچی بە جیاواز لە زۆری سەرچاوەکان هەردوو رای شۆڕش بوون و کودەتابوونی رووداوەکەمان خستووەتەڕوو دواتر بە شۆڕشمان زانیوە، ئینجا ئەنجامە نەرێنییەکانی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ لە عێراق بەسەر پێنج ناونیشانی سەرەکی دابەش کراوە. یەکەم:

پەرەسەندنی توندوتیژی. دووەم: ناسەقامگیریی سیاسی لە وڵاتدا. سێیەم: ئەنجامە نەرێنییەکان لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی. چوارەم: لە ڕووی خوێندنەوە. پێنجەم: لە بواری پەیوەندییە دەرەکییەکانی عێراق. واتە دەتوانین بڵێین ئەنجامە نەرێنییەکان لە ئاستی ناوخۆو دەرەکي دا لە چوار خاڵی یەکەم زیاتر پەیوەندی بە بارودۆخی ناوخۆی عێراق هەیە. خاڵی پێنجەمیش تەرخان کراوە بۆ لایەنی دەرەکی، بەڵام وەکو لە توێژینەوەکەش خراوەتە ڕوو لایەنی ناوخۆ و دەرەکی کاریگەرییان بەسەر یەکترەوە هەبووە.

لە نووسینی ئەم توێژینەوە ڕووبەڕوی گرفت بووینە لەوانە زۆربەی سەرچاوەکان لە ژێر کاریگەریی لایەنگیری میللی لە عێراق بۆ عەبدولکەریم قاسم لەبەر لایەنە ئەرێنییەکان چاویان لەلایەنە نەرێنییەکان پۆشیوە. هەروەها ئەو گرفتە زۆرانەی عێراق بە درێژایی مێژووی هاوچەرخی پێیدا تێپەڕیوە وای کردووە ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بە بەراورد بە هەندێ قۆناغی دواتر بە ترۆپکی شۆڕشەکان دابنرێت ئەمەش هۆکارێکی تر بوو بۆ زیاتر زەقکردنەوەی لایەنە ئەرێنییەکانی ئەم رووداوە و کەمتر وەستان لەسەر لایەنە نەرێنییەکانی بۆیە ئەگەر بەشێوەیەکی بێ لایەنانە و زانستییانە بێین و ئەم رووداوە هەم بە شۆڕش دابنێین لایەنە نەرێنییەکانیش بکەینە ناونیشانی توێژینەوەکەمان کارێکی ئاسان نابێت بۆ بە دەستهێنانی سەرچاوە و گۆڕینی ئەو بیر و باوەڕە پێشوەختەی زۆربەی خەڵکی عێراق ئێستا لەسەر ئەو رووداوە هەیانە.

لەگەڵ ئەوەشدا سەرچاوەی جۆربەجۆرمان لە نووسینی ئەم توێژینەوەیەدا بەکارهێناوە سەرچاوەی وا کاتێکی نزیک لە ڕووداوەکە نووسراوە و سەرچاوەی لایەنگری ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ و سەرچاوەی ڕەخنەگر لێی هەروەها ئەو سەرچاوانەی لە لایەن عێراقییەکان نووسراون و ئەو سەرچاوانەش کە لەلایەن ڕۆژئاواییەکان لە سەر ئەم ڕووداوە نووسراون لەم سەرچاوانەی بەکارهاتوون:

کتێبێکی (موسى حبيب) (ثورة ١٤ تموز) هەر لە ساڵی ١٩٥٨ هەمان ساڵی شۆڕشەکە نووسراوە هەرچەندە ئەم کتێبە لایەنگری زۆر لە ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ لە عێراقدا دەکات بەڵام هەندێ زانیاری تیادایە لەم توێژینەوەیەدا سوودمان لێوەرگرتووە. هەروەها کتێبێکی نووسەر (محمود جواد العقيلي) ( ١٤ تموز ثورة وانحراف) وەکو لە ناوونیشانی کتێبەکە دیارە ئەم ڕووداوە بە شۆڕش دادەنێت بەڵام باس لە ڕێلادانیش دەکات. لە هەمان توێژینەوەماندا کتێبێکی (احمد باش أعيان) بە ناوونیشانی (انقلاب ١٤ تموز في العراق خلفياته وذيوله مع موجز عن العهد القاسمي ١٩٥٨ - ١٩٦٣) ئەم کتێبە زۆر سوودمان لێ بینیوە چونکە جەخت دەکاتەوە لەسەر لایەنی (کودەتا) بوون و کەموکوڕییەکانی هەرچەندە ئێمە بە شۆڕشی دادەنێین. هەروەها کتێبێکی دکتور مأمون أمين زكي بە ناوی (إزدهار العراق تحت الحكم الملكي ١٩٢١ – ١٩٥٨/ دراسة تاريخية، سياسية، اجتماعية مقارنة) نووسەر لەم کتێبەدا بەراورد لە نێوان ڕژێمی پاشایەتی و کۆماری لە عێراقدا دەکات و یەکەمیان بە باشتر دەزانێ.

هەروەها لەو سەرچاوە ڕۆژئاواییيانەی بەکارمان هێناوە کتێبەکەی (ماريون فاروق سلوغت) و (بيتر سلوغت) (من الثورة الى الدكتاتورية العراق منذ ١٩٥٨) ئەم سەرچاوەیە و چەند سەرچاوەی ڕۆژئاوایی تر بۆچوونی ڕۆژئاواییيەکانمان دەربارەی ئەم بابەتە بۆ بە دیار دەخەن. لەگەڵ چەندین سەرچاوەی جۆربەجۆری تر لە لیستی سەرچاوەکان ریزکراون.

ئەم توێژینەوەیە هەوڵێکە بۆ روانین بۆ ڕووداوەکانی مێژووی عێراق لە روانگەیەکی رەخنەگرانە، دیارە ئەم راستییەش لە بواری نووسینی مێژوو بە شێوەیەکی ئەکادیمییانە پێویستە، هیوادارین ئەمەش سەرەتایەک بێت بۆ ئەوەی مێژوونووسان رەخنە لە ڕووداوەکانی مێژووی عێراقی هاوچەرخ بگرن بەمەبەستی بنیاتنان نەک ڕووخاندن، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کارە وەکو هەر کارێکی مرۆڤ کردە بێ

کەموکوری نابێت لە کاتێکدا هیواداریـن توانیبێتمان خزمەتێکی بچووکمان بە بواری مێژوونووسی کردبێت لە هەمان کاتیشدا هیواداریـن ئەو هەوڵ و ماندووبوونەی لە کۆکردنەوەی سەرچاوە و ڕێکخستنی زانیارییەکان و نووسینی توێژینەوەکە دراوە لە بەر چاو بگیرێت.

**شۆڕشی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨:**

تاکو ئێستا جیاوازی هەیە لە نێوان مێژوونووسان و نووسەران لە سەر ناونانی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ لە عێراقدا بە شۆڕش یان کودەتا، زۆربەی سەرچاوەکان بە شۆڕشی دادەنێن (حبیب، ٢٠١٣، ص١٧، والونداوي،١٩٩٠،ص٣ ) لە کاتێکدا ژمارەیەک سەرچاوە بە کودەتای دەزانن (باش اعیان، ٢٠١٣، ص١٧، وامین زکي،٢٠١١ ص٣٣٨، و تریب،٢٠١٠، ل١٧٥) دەتوانین بڵێین هۆی جیاوازی لە تێڕوانین بۆ ئەم ڕووداوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی هەر ڕووداوێک کەسانێک لێی سوودمەند دەبن و کەسانێکی تر لێی زەرەرمەند دەبن بۆیە ئەوانەی سوودمەند بوونە لە ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ لە عێراق بە شۆڕشیان زانیوە و ئەوانەی زیانی ماددی یان مەعنەوییان لەم ڕوداوە کردووە بە کودەتایان داناوە، هەریەک لەم دوو لایەنەش بۆچوونی خۆیان بە چەندین بەڵگە دەسەلمێنن.

ئەوانەی بە کودەتای دادەنێن جەخت لەوە دەکەنەوە کە سوپا گۆڕانگاری لە وڵات کردووە، ئەوانەی بە شۆڕشیشی دادەنێن جەخت لەوە دەکەنەوە کە جەماوەر دواتر پشتگیرییەکی گەورەی سوپای کردووە، ئەم جیاوازییە لە ناو هێنانە لە ڕۆژی ڕووداوەکە تاکو ئێستا بەردەوامە و لای هەندێک نووسەرو مێژوونووس یەکلایی نەکراوەتەوە، دیارە ئەم ڕووداوە خاڵێکی وەرچەرخانە لە مێژووی هاوچەرخی عێراق بۆیە قسەی زۆری لە بارە کراوە و زۆری لەسەر نووسراوە و پتریش لە قسە لە سەرکردن و لەسەر نووسین هەڵدەگرێت.

سەبارەت بە جیاوازیی کودەتا و شۆڕش دەگەڕێینەوە بۆ سەرچاوەیەک (لە پێشدا دەبێ بزانین کە شۆڕش لەگەڵ (ئینقلاب) جیاوازە لە پێناسەشدا ئینقلاب (کۆدیتا: فەرەنسییە بە مانای ئینقلاب) گۆڕینە لە لووتکە، زیاتر هێزی سەربازی لێ بەکاردێت بێ ئەوەی بنکە و خواروو بەشداری هەبێت، کەچی شۆڕش لە بنکە دەست پێدەکات ئامانجی فراوانتری هەیە، جاریش وایە ئینقلاب ئەنجامێکی شۆڕش دەدا، ئینقلاب هەر زادەی وڵاتانی دیکتاتۆری نییە...) (عبدالخالق، ٢٠٠٨،ل١٦٥).

بە پشتبەستن بەم جیاوازییە لە نێوان شۆڕش و کودەتا دەتوانین بڵێین ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لە عێراق ئەگەر لە سەرەتادا کودەتا بوو نەک شۆڕش چونکە گۆڕانکارییەک بوو سوپا لەو وڵاتەدا ئەنجامی دا هەرچەندە لایەنگریشی زۆر بوو بەڵام رژێمی پاشایەتیش لە عێراق لایەنگری هەبوو، تەنانەت تاکو ئێستاش کەسانێک هەن لە کاتی بەراورد کردن لە نێوان سەردەمی پاشایەتی و کۆماری لە عێراقدا سەردەمی یەکەم بە باشتر دەزانن (امين زكي، ٢٠١١، ص ١٥) دەتوانین ئەم هەڵسەنگاندنەمان بە پەراوێزی مێژوونووسێکی ناودار لە بارەی شۆڕش و کودەتا دەوڵەمەند بکەین کە دەڵێت : شۆڕش دەبێت گۆڕانکاریی بنەڕەتی لە بنکە و لووتکە ئەنجام بدات (احمد، ١٩٧٨،ص٣) هەرچەندە ئەم نووسەرە باس لە ڕووداوێکی تر دەکات بەڵام پێمان وایە دواتر پشتگیرییەکی جەماوەریی ئەوەندە فراوان لەم ڕووداوە کرابوو بە شۆڕش و نموونەی هەرە باڵای شۆڕش لە عیراق بە تێڕوانینی زۆربەی عیراقییەکان لە زۆربەی سەردەمەکانی دواتریش.

ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە تێڕوانینێکی نەرێنیمان هەبێت بۆ ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بە گشتی چونکە پێناسەی وا هەیە بۆ کودەتا و شۆڕش کە ڕۆڵی کودەتا هەمان ڕۆڵی شۆڕشە و بە پێویستییەکی مان و نەمان دادەندرێ (عبدالخالق، ٢٠٠٨،ل ١٥٦) دیارە پێناسەی شۆڕش و کودەتا لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر مەرج نییە وەکو یەک بێت بەڵام بە شێوەیەکی گشتی تێڕوانینێکی ئەرێنی بۆ شۆڕش هەیە بە بەراورد لەگەڵ کودەتا بە تایبەتی لە عێراق.

ئەگەر ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ لە سەرەتادا کودەتاش بێت و دواتر بووبێتە شۆڕش مانای ئەوە نییە کە لایەنی ئەرێنی نەبێت بەڵام زۆر سەرچاوە باسی لایەنە ئەرێنییەکانی ئەم رووداوەیان کردووە (حبیب،٢٠٠٣، ص٣-١٧٦؛ والمقصود، ٢٠٠٩، ص٨٩-١٨١) بەڵام ئێمە لەم توێژینەوەیەدا جەخت لە لایەنە نەرێنییەکانی ئەم کودەتایە دەکەینەوە کە دەتوانین بەسەر چەند خاڵێک دابەشی بکەین:

١- پەرەسەندنی توندوتیژی لە عێراق، دەتوانین بڵێین لە رۆژی دووشەمەی ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨ توندوتیژی لە عێراق پەرەسەندنی بەرچاوی بە خۆوە بینیوە، لێرەدا دەتوانین پەنا ببەینە بەر دەقی یەکێک لە سەرچاوەکان سەبارەت بە رۆژی ئەم رووداوە: ((دوای بوردومانێکی کەم پاساوانانی مەلەکی لە ناو کۆشکی مەلیکدا خۆیان بەدەستەوە دا و مەلیک فەیسەڵی دووەم و عەبدلئیلاهی جێنشین لەگەڵ چەند ئەندامێکی خانەوادەکە هاتنە دەرەوە و لە ماوەی چەند دەقیقەیەکدا هەر هەموویان کوژران)) (تریب،٢٠١٠،ل١٨١).

سەرەڕای ئەوەی بنەماڵەی پاشایەتی لە عێراق بەرگرییان نەکردووە و خۆیان بە دەستەوە داوە بەو پەڕی توندوتیژی و وەحشییانە لە ناوبردراون دەتوانین ئەمەش بە سەرەتای ئەو شەپۆلانەی توندوتیژی دابنێین کە عێراق بە بەردەوامی تاکو ئەمڕۆ پێیدا تێدەپەڕێت، ئەوە بە تێبینی کردنی ئەوەی لە ساڵی ١٩٥٢ کودەتایەکی سەربازی لە میسر روویدابوو کە ئەوەی عێراق تا رادەیەکی زۆر چاولێکەریی رووداوەکەی میسر بوو، بەڵام لە میسر بنەماڵەی پاشایەتی لە ناو نەبردران. (باش اعیان، ٢٠١٣ص ١٧٨)

توندوتیژی هەر بە کوشتن نەوەستا بەڵکو دوای کوشتنی هەر یەکە لە (عبدالاله) و (نوری سعید) کەسانێک هێرشیان کردە سەر تەرمەکانیان و شێواندنیان و پارچە پارچەیان کردن (العقیلي، ٢٠١٣،ص ٢٨-٣٣).

ژمارەیەک کەس بەهەڵە کوژران وەکو (ابراهيم هاشم) سەرۆک وەزیرانی ئوردن و (خلوصي الخيري) و هی تریش و زۆر لە وەزیرەکانی سەردەمی مەلەکی و لایەنگرانی ئەم سەردەمە ناچاربوون خۆیان بشارنەوە لەبەر ئەوەی عەقیدی روکن (عبدالسلام محمد عارف) لێدوانی دابوو کە دەبێت هەموو وەزیرەکانی پێشوو لەبەردەرگای ماڵی خۆیان لە سێدارە بدرێن بەبێ رەچاوکردنی کاروبار و هەڵسوکەوتیان (علاوی، ٢٠٠٠،ص٢٥٦).

لەوانەیە ئەم توندوتیژییە لە رادەبەدەرە بە تایبەتی بەرامبەر بنەماڵەی پاشایەتی لە عێراق تەنانەت ئافرەتەکانی ئەم بنەماڵەیەش، بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ئەنجامدەرانی ئەم کودەتایە لەوە ترسابن کە بە مانەوەی بنەماڵەی پاشایەتی ئەگەری سەرنەکەوتنی شۆڕشەکەیان پتربێت یان یارمەتی بنەماڵەی پاشایەتی لە ئوردن گرفت بۆ سەرانی شۆڕشەکە دروست بکەن، بە تایبەتی کە بزووتنەوەی مایسی ساڵی ١٩٤١ کە لە لایەن چەند ئەفسەرێکی سوپا و خەڵکانێکی تر ئەنجام درا لە کاتی سەرنەکەوتنی و گەڕانەوەی بنەماڵەی پاشایەتی بە تەواوی بۆ دەسەڵات بووە مایەی لێپێچینەوەیەکی توند لەگەڵ ئەو ئەفسەرانەی سوپا (تريب، ٢٠١٠،ل١٢٣-١٢٨) بۆیە دەتوانین بڵێین ئەزموونی شکست خواردووی سوپا لە ساڵی ١٩٤١ کاریگەریی نەرێنی هەبووە لە سەر توندترکردنی ڕادەی توندوتیژیی سوپا لە عیراق لە ساڵی ١٩٥٨ هەرچەندە ئەمە نابێتە پاساو بۆ ئەو توندوتیژییە زۆرەی لە عێراق ئەنجام درا.

ئەم توندوتیژییە هەر لە پایتەخت نەمایەوە بەڵکو بەڕادەی جیاواز بۆ ناوچەکانی تری عێراق گواستراوە و دەتوانین بڵێین ساڵ بە ساڵ بە تینتر دەبوو. نموونەش لەم ڕووەوە زۆرن هەندێکیان دەخەینە ڕوو:

دوای پێکهێنانی دادگای گەل ناسراو بە دادگای مەهداوی بۆ دادگاییکردنی سەرانی رژێمی پاشایەتی لە عێراق توندوتیژییەکی زۆر لە

ناو هۆڵی دادگاکە دەبینرا بۆ نموونە هەندێک جار لە کاتی دادگاییکردنەکە دەنگی ئافرەتێک لەوانەی دانیشتبوون لە ناو هۆڵەکە بەرزدەبۆوە و هاواری دەکرد مردن بۆ خائین لە کاتێکدا هێشتا تاوان بەسەر تاوانبارەکەوە لە لایەن دادگا نەسەلمێندرابوو. یان گەنجێکی پڕ جۆش و خرۆش هاواری دەکرد مردن بۆ خیانەتکاران، هەندێک جار دادگا بەم هاوارکردنانە کاریگەر دەبوو و پتر توند دەبوو لەگەڵ ئەو کەسانەی دادگایی دەکران. (دقاق،٢٠١٠،ص١٧-١٨)

ساڵێک دوای شۆڕشەکە ساڵی ١٩٥٩ شاری موسڵ و کەرکووک رووداوی توندوتیژیی خوێناوییان بەخۆوە بینی ئەفسەرانی سوپا رۆڵی سەرەکییان تیایدا بینی لەم دوو شارەدا و سوپای عیراق بە توندی رووبەڕوویان بۆوە و قوربانیی زۆر لەم دوو رووداوەدا لە هەردوو شارەکەدا هەبووە. (الچاوشلي،٢٠١١، ص١٣٦-١٤٤) هەروەها لە هەمان ساڵدا خودی (عبدالكريم قاسم) سەرۆک وەزیران و وەزیری بەرگری لە ئێوارەی ٧ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٩ رووبەڕووی هەوڵێکی تیرۆرکردنی سەرنەکەوتوو بووەوە. (الچاوشلي،٢٠١١،ص١٤٦-١٤٨) ئەم رووداوانەش بە گشتی بوونە هۆی زیاتر بڵاوبوونەوەی توندوتیژی لە وڵات و ئەوەی جێگای مەترسی بوو ئەم توندوتیژییانە لە ناو کەسانی سەربازی و مەدەنی لەم رووداوانە دەبیندران.

لەم سەردەمەدا زیاتر لە جارێک هەوڵی کوشتنی بارزانی درا لەوانە لە ساڵی ١٩٦١ (عبدالكريم قاسم) پیلانی کوشتنی بارزانی دانابوو لە کاتی گفتوگۆکردن لە رێگای بومبابارانکردن بە فڕۆکە بەڵام لە هەوڵەکەی سەرکەوتوو نەبوو (بارزانی،٢٠٠٤،ل٦١).

ئەوەی توندوتیژی کردە رووداوێکی رۆژانە لە عیراق ڕووبەڕوو بوونەوەی (عبدالكريم قاسم) بوو لەگەڵ کورد لە ساڵی ١٩٦١ ئەم رووبەڕووبوونەوە تاکو کۆتایی سەردەمی قاسم لە ١٩٦٣ بۆ دواتریش بەردەوام بوو کە تیایدا ژمارەیەکی زۆر لە عیراقییەکان بە

جیاوازیی نەتەوە و ئاین و مەزهەبی تیایدا کوژران و هەموو چەکێکی تیایدا بەکار هات. (وانلي، ٢٠١٢،ص١٥٣-٢٤٣،و السمر،٢٠١٢ ص١٧٠-١٧٤)

٢- ناسەقامگیریی سیاسی لە وڵاتدا: هەرچەندە فەرمانڕەوایی (عبدالکریم قاسم) لە عیراقدا ١٩٥٨ – ١٩٦٣ کورت بوو. بەڵام سەردەمێکی ناسەقامگیر بوو لە رووی سیاسی، هەرئەوەش بووە یەکێک لە هۆیەکانی کۆتاییهاتنی سەردەمی فەرمانڕەوایی قاسم لە عیراق لە ٨ی شوباتی ١٩٦٣ کاتێک (عبدالسلام عارف) دەسەڵاتی گرتە دەست و قاسم کوژرا. (دان، بدون سنة النشر، ص٤٦) هەر لە سەرەتای شۆڕشەکە ناکۆکی لە نێوان (عبدالکریم قاسم) و (عبدالسلام عارف) دوو جەمسەرە سەرەکییەکانی شۆڕشەکە بەدیار کەوت. هۆکاری ئەم ناکۆکییانە دەگەڕایەوە بۆ ئەوەی هەر یەکە لەم دوو ئەفسەرە دەیویست خۆی دەسەڵاتی سەرەکیی عیراقی بەدەستەوە بێت. (الملا،٢٠١١،ص١٨٧) خاڵێکی تری جیاوازیی نێوان ئەم دوو کەسە ئەوە بوو عبدالسلام عارف داوای دەکرد یەکێتی عەرەبی یەکسەر لەگەڵ کۆماری عەرەبی یەکگرتوو پێک بهێندرێت ئەگەر (عبدالکریم قاسم) بەوە رازی نەبێت ئەوە دەبێت لە فەرمانڕەوایی لاببردرێت. (العقیلي،٢٠١٣،ص٤٣) لە بەرامبەردا قاسم زیاتر سۆزی بۆ ڕاوبۆچوونی حزبی نیشتمانی دیموکراتی دەچوو، تا ڕادەیەک هەندێک وای بۆ دەچوون بەدەستهێنانی چاکسازی کۆمەڵایەتی نێوخۆ و بونیادنانی کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی عێراقی پێویستە پێش پابەند بوونی راستەقینەیە بە جیهانی عەرەبی. (تریب،٢٠١٠،ل١٩٠) هەرچەندە عێراق بوو بە دەوڵەتێکی کۆماری بەڵام سەرۆک کۆمار بۆ عێراق دانەنرا بەڵکو ئەنجوومەنێکی سەروەری لە سێ کەس پێکهات لەجیاتی سەرۆک کۆمار لەم کەسایەتییانە:

١. فەریق روکن (نجیب الربیعی) _ سەرۆک
٢. (محمد مهدی کبة) _ ئەندام
٣. (خالد نەقشەبەندی) _ ئەندام. (حبیب،٢٠١٣،ص١١٧)

لە راستیدا (عبدالكريم قاسم) هەر زوو بە تاکڕەوی ناسرا زۆربەی دەسەڵاتەکان لە دەستی خۆی بوو هەر خۆی بوو بە سەرۆک وەزیران و وەزیری بەرگری، سەرکردەی گشتی هێزە چەکدارەکانی عیراق. (المقصود،٢٠٠٩،ص٢٤٩، وتريب،٢٠١٠،ل١٨٨) تەنانەت هەر زوو پەیوەندیی (عبدالكريم قاسم) لەگەڵ ئەفسەرانی ئازاد تێکچوو ئەو رێکخستنەی بە شۆڕش هەڵستابوو چونکە وای بڕیار دابوو ئەنجوومەنێک لەم ئەفسەرانە دروست بکات بە ناوی ئەنجوومەنی سەرکرایەتی شۆڕش تاکو لە بڕیاردان بەشدارییان بکات، بەڵام دواتر بۆ ئەوەی دەسەڵات هەر بە دەستی خۆی بێت ئەو ئەنجوومەنەی پێک نەهێنا ئەمەش بووە مایەی ناڕەزامەندی بوونی ئەو ئەفسەرانە (الچاوشلي،٢٠١١،ص١٣١) هەروەها گرفتی تایفەگەری لە عیراق لەسەردەرهێناندا بوو لە پێکهێنانی حکومەتی عیراق لە دوای ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ لە عیراقدا زۆربەی وەزیرەکانی عەرەبی سونە بوون دوای ئەوان بە پلەی دووەم عەرەبی شیعە دەهاتن لەگەڵ دوو وەزیری کورد پەیوەندییان بە بزووتنەوەی نەتەوایەتی گەلی کورد نەبوو بەڵام پەیڕەوانی ئاینەکانی تر لە عیراق بێجگە لە ئاینی ئیسلام هیچ وەزیرێکیان لەم وەزارەتەدا نەبوو. (شومان،٢٠١٣،ص٧٢-٧٣) بە لەبەر چاو گرتنی ئەوەی یەکەم حکومەتی عیراق لە ساڵی ١٩٢٠ وەزیرێکی جوو و مەسیحی تێدا بوو، ئەوە دەکرێ رەخنە لەم حکومەتەی ساڵی ١٩٥٨ بگرین، چونکە ئەگەرچی لەو کاتەدا زۆربەی جووەکان کۆچیان کردبوو بۆ ئیسرائیل ، بەڵام دەکرا مەسیحییەکان یان (صابئه) یان تورکمان نوێنەریان لەم حکومەتەدا هەبێت تاکو پتر مۆرکێکی عیراقی پێوە دیار بێت، هەروەها دوو وەزیری کورد کە ئەوانیش کەم ناسراو بوون. (کەسێک بووە بەناوی (مصطفى علی) بۆ وەزارەتی داد، بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە : شومان،٢٠١٣، ص٧٢) بۆ پشکی کورد زۆر کەم بوو.

(عبدالكريم قاسم) ئەندامی هیچ پارتێکی عیراقی نەبوو، خۆشی هیچ پارتێکی سیاسی لە عیراق دروست نەکردبوو بۆ ئەوەی پشتگیریی

فەرمانڕەوایەکەی بکات. دەکرێت ئەمە بە خاڵێکی ئەرێنی بۆ ئەو لێکبدرێتەوە کە نەیویستووە خۆی بە پارتێک ببەستێتەوە، بەڵکو سەرۆک وەزیرانی عیراق لە هەموو حزبەکان گەورەترە، هەرچەند بە شێوەیەکی گشتی پشتگیرییەکی جەماوەریی بەرفراوانی لە عیراق هەبووە بەڵام بە تێپەڕبوونی کات پەیوەندیی (عبدالکریم قاسم) لەگەڵ هەموو پارتە سیاسییەکان لە عیراق بەرەو خراپی چوو ئەمەش کاریگەری لە سەر ناسەقامگیریی سیاسی لە عیراقدا هەبوو، هەر لە ساڵی یەکەمی شۆڕش پارتە سیاسییەکانی عیراق کاریگەر بوون بە ململانێی نێوان (عبدالکریم قاسم) و (عبدالسلام عارف) ئەوە بوو (عبدالکریم قاسم) توانی لایەنگیریی حزبی شیوعی عیراق و هاوپەیمانیی هێزەکانی چەپ بەدەست بێنێت، لە کاتێکدا حزبی (استقلال) و (البعث العربی الاشتراکی) و بزووتنەوەی نەتەوەیە عەرەبییە ناسرییەکان و ئیخوان موسلیمون لە دەوروبەری (عبدالسلام عارف) کۆبوونەوە. (الملا،٢٠١١،ص١٨٧) هەرچەندە قاسم لە سەرەتادا لە شیوعییەکان نزیک بوو بەڵام لە راستیدا ئەو دەیویست شیوعییەکان وەکو هاوسەنگێک دژی نەتەوە پەروەرە عەرەبەکان بەکاربێنێت و دەیویست ململانێی نێوان حزب و هێزە سیاسییەکانی عیراق لە شیوعی و نەتەوە پەروەریی عەرەب بەردەوام بێت تاکو لەم رێگەیەوە خۆی لە هەردوو لایەن بەهێزتر بێت و بتوانێت فەرمانڕەوایی بکات بۆیە ئەو هەر ماوەیەک لایەنگیری لە یەکێک لەم دوو ئاراستەیە دەکرد. (السمر،٢٠١٢،ص١٧١-١٧٢) ئەم سیاسەتە بە یەکێک لە هەڵە گەورەکانی قاسم لە عیراق دادەنرێت چونکە سیاسەتی (پەرتکە و زاڵ بە) ئەگەر لە لایەن ئیستعمار لە کۆلۆنییەکان بەکار بهێندرێت جێگای نارەزاییە بەڵام کاتێک لە لایەن سەرکردەیەک لە وڵاتێک بەرامبەر هێزە سیاسییەکانی وڵاتەکەی بەرکاربێت ئەوە دەبێتە هۆی پەشێوی و ئاژاوە لە وڵاتدا، دەتوانین لەم رووەوەش بڵێین ئەگەر قاسم ئەفسەرێکی بە توانای سوپا بوو بەڵام سیاسەتمەدارێکی باش نەبوو بە بەڵگەی ئەو ناسەقامگیرییە سیاسییەی لە ماوەی فەرمانڕەواییدا لە عیراقدا هەبوو.

سەبارەت بە مامەڵەی قاسم لەگەڵ کوردیش بە هەمان شێوە بوو لە کاتێکدا لە سەرەتادا ڕێگای بە مەلا مستەفا بارزانی دا لە ١٩٥٨/١٠/٦ لە یەکێتی سۆڤیەتەوە بۆ عیراق بگەڕێتەوە بۆ پارسەنگ دروستکردن بەرامبەر نەتەوە پەروەرە عەرەبەکان ئەوە زۆری پێنەچوو پەیوەندی لەگەڵ کوردیش تێکچوو چونکە نەیدەویست دان بە مافەکانی کورددا بنێت. (تريب،٢٠١٠،ل١٩١) هەر لەم رووەوە پەیوەندیی باشی قاسم لەگەڵ شیوعییەکان بەرەو خراپی چوو، تەنانەت لە ڕقی شیوعییەکان ئەم جارە لە نەتەوە پەروەرە عەرەبەکان نزیک بووەوە. (المقصود،٢٠٠٩،ص٢٥٢) هەرچەندە دیارە کە کۆتایی قاسم لەسەر دەستی نەتەوە پەروەرە عەرەبەکان بوو.

سەرەڕای ئەوەی شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ ڕژێمی پاشایەتی لە عێراق بە ڕژێمێکی دیکتاتۆری و سەر بە ئیستعمار دەزانی، بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە لە ساڵانی ١٩٥٨ – ١٩٦٣ ئەنجوومەنی نوێنەران لە عێراق هەڵنەبژێردرا. (تريب،٢٠١٠،ل١٨٨) لە کاتێکدا عێراق لە سەردەمی پاشایەتی ئەم دامودەزگایە گرنگەی هەبوو، جا هەرچەندە ڕەخنە لە هەڵبژاردنەکانی سەردەمی پاشایەتی لە عیراق بگیرێت، ئێمەش لەگەڵ ئەوەین کە بێ کەموکوڕی نەبووە، بەڵام نەبوونی ئەنجوومەنی نوێنەران لە سەردەمی یەکەمی کۆماری لە عێراق بە هۆکارێک و نیشانەیەکی ناسەقامگیریی سیاسی لە عێراق دادەنرێت.

هەرچەندە دەسەڵاتدارانی نوێی عێراق لە سەرەتادا دەستیان کرد بە ئازادکردنی ئەو بەندکراوانەی لە سەردەمی پاشایەتی گیرابوون بەڵام لە هەمان کاتدا دەست کرا بە بەندکردنی پیاوانی سەردەمی پاشایەتی لە ئەوانەی نەیانتوانیبوو لە عێراق رابکەن.

هەروەها زۆر لە فەرمانبەران کۆتایی بە خزمەتیان هێندرا لە ناو ئەوانەشدا ئەندامانی ئەنجوومەنی ئاوەدانکردنەوە هەبوون. هەروەها چەندین ئەفسەر بوون بە وەزیر و پۆستی مەدەنی گەورە و گرنگیان وەرگرت. (بينروز،١٩٨٩،ص٣٤٢) وەرگرتنی پۆستی مەدەنی لە لایەن کەسانی

سەربازییەوە پتر مۆرکێکی عەسکەرتاری بە کۆمەڵگای عێراقی دەدا ئەمەش لە خزمەت سەقامگیری سیاسی لەو وڵاتەدا نەبوو، هەروەها لە ڕووی لێهاتووییشەوە کەسانی سەربازی کەمتر لە پۆستە مەدەنییەکاندا سەرکەوتوو دەبن.

هەر لە چوارچێوەی بە عەسکەرتایەت کردنی کۆمەڵگا یەکێک لەو هەنگاوانەی (عبدالکريم قاسم) پێی هەڵستا و دواتریش بووە بنەمایەک بۆ دروستکردنی هێزی نانیزامی لە سەردەمانی فەرمانڕەواکانی تریش بریتی بوو لە دروستکردنی بەرگری میللی (المقاومة الشعبية) لەم کاتیشەوە هێزی نانیزامی جۆربەجۆر رۆڵی نەرێنیان لە مێژووی عێراقدا تاکو ئێستا بينيوە. لەم ڕووەوەش لە دوای ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ بە سێ رۆژ فەرمانێک دەرچوو لە (عبدالكريم قاسم) بە پێکهێنانی میلیشای بەرگری میللی لە ١ ی ئابی ١٩٥٨ یاسایەکی تایبەت بە پێکهێنانی دەرچوو، لە ماددەی یەکەمیدا هاتبوو: رێکخستنی میللییە بە ناوی بەرگری میللی، سەر بە وەزارەتی بەرگری دەبێت دەرگای خۆبەخشی بۆ نێر و مێ دەکرێتەوە لە بەغداد لە رۆژی ٩ی مانگەوە. (الخيون،٢٠٠٤،ص٣١٧)

حزبی شیوعی کاریگەرییەکی زۆری لەسەر بەرگری میللی هەبوو لە رێگای ئەندامانییەوە لە ناو ئەو ڕێکخستنە لە ناوەڕاستی مانگی ئاب ژمارەی ئەندامانی ئەم ڕێکخستنە گەیشتە یازدە هەزار کەس. (سلوغت و سلوغت ٢٠٠٣،ص٩٨-٩٩) لە دوای چەند هەفتەیەک دەرگای خۆبەخشی لە لیواکانی تری عیراقیش بۆ بەرگری میللی کرایەوە. (الخيون،٢٠٠٤،ص ٣١٧) ئەم رێکخستنە کێبڕکێی نەدەکرد لەگەڵ سوپای عێراق هەڵسوکەوتەکانی تا ڕادەیەکی زۆر لە ژێر کۆنترۆڵی دابوو. (سلوغت و سلوغت،٢٠٠٣،ص ٩٩) بەڵام دروستکردنی رێکخستنێکی وا لاوازیی دەوڵەت بە تایبەتی سوپا پیشان دەدات لەجیاتی ئەمە دەکرا سوپا بەهێز کرابایە. هەرچەندە لە دوای شۆڕشەکە بە کەمتر لە دوو هەفتە دەستووری کاتی لە عێراق ڕاگەیاندرا لە خاڵی دووەمي دا هاتبوو عێراق

بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب. (باش اعیان، ٢٠١٣،ص٣٨٨) لێرەدا تێبینییەک دروست دەبێت ئایا ئەم ماوەیە ٢٧ی تەممووزی ١٩٥٨ کەم نەبوو بۆ دانان و ڕاگەیاندنی دەستوورێکی کاتی بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە ئەم دەستوورە هەر بە کاتی ماوە و نەبووە هەمیشەیی لە کاتێکدا عێراق لە سەردەمی رژێمی پاشایەتی دەستووری هەمیشەیی هەبوو ئەگەرچی هەموارکردنی تیادا کرابوو. هەروەها ماددەی دووەم عێراق بەشێکە لە نەتەوەی عەرەب گرفتی بۆ دەوڵەتی عێراق دروست کرد چونکە دیارە کورد و تورکمان لە عێراق بەشێک نین لە نەتەوەی عەرەب کە ئەوانیش نەتەوەی دووەم و سێیەمن لە عێراق، بۆیە دەتوانین بڵێین ئەم کەموکورتییە لە دەستوور کاریگەری لە ناسەقامگیری سیاسی لە عێراق هەبوو بە تایبەتی لە پەیوەندیی نێوان حکومەت و کورد.

٣- لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی: گومان لەوەدا نییە (عبدالکریم قاسم) نیازی چاکسازی هەبوو لە عێراق و دەیویست زیاترین ژمارەی عێراقییەکان لە خۆی ڕازی بکات بە تایبەتی هەژارەکان بەڵام کاتی جێبەجێکردنی چاکسازییەکان چەندین هەڵە و کەموکوڕیی دیار ڕوویان دا بە تایبەتی سەبارەت بە یاسای چاکسازیی کشتوکاڵ بیرۆکەی سەرەکی لە دوای دەرکردنی ئەم یاسایە بریتی بوو لەوەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵ لە عێراق زیاد بکرێت لە ڕێگای دابەشکردنی زەویی موڵکدارە گەورەکان بە سەر ئەو جووتیارانەی زەوییان نییە لەسەر ئەو بنەمایەی جووتیار باشتر کار دەکات لە زەوییەک کە موڵکی خۆی بێت نەک زەوییەک کە بە کرێ کاری تیادا دەکات لەم ڕووەوەش عێراق کاریگەر بوو بە یاسای چاکسازیی کشتوکاڵ کە پێشتر لە میسر جێبەجێ کرابوو، بەڵام لە کاتی جێبەجێکردنی ئەم یاسایە بە پێچەوانەوە بەرهەمی کشتوکاڵی لە عێراق کەم بووەوە لەجیاتی ئەوەی زیاد بکات ئەمەش بە شکستی سیاسەتی ئابووری حکومەتی نوێ لە ڕووی کشتوکاڵ دادەنرێت. (بینروز، ١٩٨٩،

ص٣٨٣-٣٩٤) هۆکاری شکستی ئەم یاسایە دەگەڕێتەوە بۆ نەخوێندەواریی زۆربەی جووتیاران و ناشارەزاییان لە کشتوکاڵ کردن بە بێ سەرپەرشتی کردنی خاوەن موڵکە کشتوکاڵییەکان کە پێشتر لێیراهاتبوون لە کاتێکدا خاوەن موڵکەکان بە تێپەڕبوونی کات ئەزموونێکی باشیان لە کشتوکاڵکردن بە هەموو قۆناغەکانی ئامادەکردنی زەوی و خزمەتکردنی بەروبووم و فرۆشتنی بە دەستهێنابوو دەرکەوت جووتیاران ئەو توانایەیان نییە بە پشتبەستن بە توانای خۆیان کشتوکاڵ بکەن، و تیایدا سەرکەوتووبن. (امین زکی، ٢٠١١، ص٤٣٩-٤٤٢) بۆ پڕ کردنەوەی ئەم کەم و کوریەش حکومەت هەڵسا بە دامەزراندنی کۆمەڵەی جووتیاران بۆ ئەوەی قەرز و ڕاوێژ پێشکەش بە جووتیاران بکەن، بەڵام ئەم کۆمەڵانەش بەهۆی بیرۆکراتیەت و کەمیی توانای دارایی کە بۆیان تەرخانکرابوو، سەرکەوتوو نەبوون لە کارەکانیاندا ئەم کۆمەڵانەی جووتیاران لە ژێر سەرپەرشتیی وەزارەتی ناوخۆدابوون. (الچاوشلي، ٢٠١١، ص١٢٥-١٢٦) هەر لە ڕووی ئابووری لە ساڵی ١٩٦١ نرخی شتومەک بەڕادەی ٤٠% بە بەراورد لەگەڵ ساڵی ١٩٥٨ بەرزبووەوە. هەروەها ڕادەی بێکاری لە وڵات زیاد بوو بە ڕادەیەک گەیشتە ٥٠% بە گوێرەی سەرچاوەیەک تۆماری ئەم ڕادەیە بەرزە لە بێکاری دەگەڕێتەوە بۆ توندوتیژی بەربڵاو لە وڵات و ناسەقامگیریی بارودۆخی سیاسی لە وڵات کە بووە هۆی ئەوەی کۆمپانیایەکانی بێگانە بە ڕادەیەکی بەرچاو وڵات جێبێڵن و کۆمپانیایەکانی ناوخۆش نەوێرن وەک پێویست کار بکەن. (امين زكي، ٢٠١١، ص ٤٤٣-٤٤٤)

بە شێوەیەکی گشتی داهاتی دەوڵەت لە عێراق لەو ماوەیەدا لە زیادبووندا بوو ئەمەش بە هۆی زیادبوونی داهاتی فرۆشتنی نەوت لە وڵاتدا، ئەوە بوو لە ماوەی ساڵانی ١٩٥٨ – ١٩٦٣ بەرهەمێنانی نەوت لە ٧٣١.٣ ملیۆن بەرمیل بوو بۆ ١١٦١.٩ ملیۆن بەرمیل واتە بە زیاد بوونی بڕی ٦٠% هەرچەندە داهاتی نەوت بەڕێژەیەکی کەمتر لەوەی

چاوەڕوان دەکرا زیادی کرد لە ٢٢٤ ملیۆن دۆلار لە ١٩٥٨ بۆ ٣٥٣ ملیۆن دۆلار لە ساڵی ١٩٦٣- ئەمەش بەهۆی دابەزینی نرخی ڕاگەیاندراو لە شوباتی ١٩٥٩ و ئابی ١٩٦٠. (سلوغت و سلوغت،٢٠٠٣،ص ١١٧)

هەر زوو (عبدالکریم قاسم) بەیانێکی دەرکردبوو کۆمپانیاکانی نەوتی دڵنیا کردبووەوە کە گۆڕانکاری لە سیاسەتی نەوت لە عێراقدا ناکرێت بە ئەنجامدانی کودەتاکە دیارە ئەمەش لەبەر گرنگیی داهاتی نەوت بۆ عێراق چۆن گرنگە بۆ کۆمپانیاکانیش هەروەها بەڵێنی دابوو کە کۆماری عێراق پارێزگاری بکات لە ناردنە دەرەوەی نەوتی عێراق بۆ دەرەوە. (حبیب،٢٠١٣،ص ١٣٢) عبدالکریم قاسم بە هیچ شێوەیەک بیری لە خۆماڵی کردنی نەوتی عێراق نەکردەوە لەگەڵ ئەوەی بەشێکی زۆری داهاتی عێراق بۆ کۆمپانیا بیانییەکانی بەرهەمهێنانی نەوت لە عێراق دەچوو. (بیندوز،١٩٨٩،ص٤٠٩-٥١٠) لە ڕاستیدا گەورەترین کەموکوڕی ئابووری عێراق لەم ماوەیەدا بریتی بوو لە پشتبەستن بە پلەی یەکەم بە داهاتی نەوت لە بودجەی وڵاتدا. (المقصود،٢٠٠٩،ص ٢٦١) دەتوانین بڵێین پشتبەستن بە داهاتی نەوت هۆکارێکی گرنگ بوو بۆ پشتگوێ خستنی کەرتی کشتوکاڵ و پیشەسازی لە عێراقدا بۆیە سەرنەکەوتنی یاسای چاکسازی کشتوکاڵ لە عێراق بە تەنیا ناگەڕێتەوە بۆ ئەو کەموکوریانەی کە لە یاساکەدا هەبوو، بەڵکو بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر پشتبەستن بە داهاتی نەوت لە وڵاتدا و هەوڵدانی جووتیاران بۆ ئەوەی وەزیفەیەکی بەردەوام لە دەوڵەت بەدەست بهێنن نەک بە کاری کشتوکاڵی قورس خەریک بن.

هەروەها یاسای چاکسازی کشتوکاڵ سەرەڕای لایەنە ئابوورییەکەی لەلایەنە کۆمەڵایەتییەکەش دوژمنایەتی خستە نێوان هەندێک لە جووتیاران و خاوەن موڵکەکانی زەوی کشتوکاڵی کە چەندین نموونەی تۆڵەسەندنەوە و کوشتنی لە هەردوولا لێکەوتەوە. (المقصود،٢٠٠٩،ص ٢٥٣) ئەمەش پتر هانی جووتیارانی دا کۆچ بکەن بەرەو

شارەکان بەمەش لە لایەک ژمارەی دانیشتوانی شارەکان بە شێوەیەکی نائاسایی زیادی کرد و گرفتی ئابووری و کۆمەڵایەتی زۆر لە شارەکان سەریان هەڵدا و لە لایەکی تر دەستی کارکەر لە کەرتی کشتوکاڵ لە کەمبووندا بوو. واتە بە شێوەیەکی گشتی کۆمەڵگای عێراق زیاتر بەرەو ئەوە دەچوو کۆمەڵگایەکی بەرکاهێنەر بێت نەک بەرهەمهێنەر، ئەم لایەنە نەرێنییە لە سەردەمانی دوای ساڵی ١٩٦٣ ش لە هەڵکشاندا بوو.

هەرچەندە لە سەردەمی پاشایەتی گەندەڵی لە نێوان فەرمانبەرانی دام و دەزگاکانی دەوڵەت بڵاو ببووەوە بەڵام شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ نەک نەیتوانی ئەو گەندەڵییە لە ناو ببات بەڵکو لەم ماوەیەدا چەند ئەوەندە بووەوە تەنانەت قسەی زۆر هەبوو لەسەر برای گەورەی (عبدالكريم قاسم) بەناوی (حامد قاسم) کە پێش شۆڕشەکە بازرگانێکی بچووک بوو و دوای کودەتاکە سامانێکی گەورەی بەهۆی نزیکی لە گەورە بەرپرسانی دەوڵەت کۆکردووەتەوە (دان، بون سنة النشر، ٤٤٦) بێگومان بەشێکی زۆری ئەم کەموکوڕیانەی لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتیی عێراق لەم ماوەیەدا دەگەڕێتەوە بۆ ناسەقامگیریی سیاسی لە وڵاتدا، چونکە ناکرێت باری سیاسی ناسەقامگیر بێت و لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتی بە بێ کەمو کوری بن.

لە هەمان کاتیشدا ئابووری کاریگەری هەیە بە سەر لایەنی سیاسی تەنانەت بۆچوونی نوێ هەیە دەڵێت ئابووری سیاسەت ئاراستە دەکات نەک بەپێچەوانەوە. ئێمە پێمان وایە کە ئابووری و سیاسەت هەردووک کاریگەرییان بەسەر یەکتریەوە هەیە.

ئەوەی جێگای سەرنجە عێراق لەم ماوەیەدا نەیتوانی لە ڕووی بە پیشەسازی کردنی وڵات پێشکەوتن بەدەست بهێنێت ڕاستە پیشەسازیبوون پێویستی بە پلان و شارەزایی و بازاڕ هەیە، بەڵام لە ئەنجامی کۆتایی دا سیاسەتی پیشەسازی عێراق لە ١٩٥٨ – ١٩٦٣ شکست خواردوو بوو. (بيندوز،١٩٨٩،ص٤٢٨-٤٢٩)

٤- لە ڕووی خوێندنەوە: لە بواری خوێندن دەسەڵاتدارانی نوێی عێراق هەوڵی ڕازیکردنی زیاترین ژمارەی خەڵکیان دەدا، دەیانویست نەوەیەکی نوێی لایەنگری بە خۆیان دروست بکەن بۆیە ئەگەر خوێندن لە عێراق ناوبانگێکی باشی هەبوو و بڕوانامەکانی عێراق لە هەموو جیهاندا دانپیاندراو بوو، ئەمەش لە بەر ئەوەی جەخت لە جۆریەتی خوێندن دەکرایەوە نەک چەندایەتی، بەڵام لە سەردەمی (عبدالكريم قاسم) گرنگی بە چەندایەتی درا لە خوێندن ئەمەش لەسەر حیسابی جۆرایەتی بوو، لەم ڕووەوەش قاسم بڕیارێکی دەرکرد بە زەحف (خشان) ناسرا و واتە هەر قوتابییەک لە تاقیکردنەوەکان دەرچووبووایە یان نا بە دەرچوو داندرا و بۆ پۆلێکی سەرووتر دەچوو لە هەموو قۆناغەکانی خوێندن ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کۆلیژەکانی عێراق پڕ بن لە قوتابیانی کەم توانا و بۆچوونێک هەیە پێی وایە کە ئەمە سەرەتای خراپبوونی دام و دەزگاکانی خوێندن بوو لە عێراق و لە سەردەمەکانی دواتریش لە دارمان بەردەوام بووە هەروەها پەیدابوونی زاراوەی شۆڕشگێڕ و کۆنەپەرست لە ناو ناوەندەکانی خوێندن کاریگەریی نەرێنی لەسەر ناوەندەکانی خوێندن هەبوو ئەوانەی لایەنگیری شیوعییەکان بوون بە شۆڕشگێڕ و ئەوانی تر بە کۆنەپەرستی ناودەبران. (امين زكي،٢٠١١،ص ٤٢٨-٤٢٩) بەڵام دوای گۆڕانی هەڵوێستی (عبدالكريم قاسم) بەرامبەر شیوعییەکان زۆرترین مامۆستای تاوانبارکراو بە لایەنگری شیوعییەکان خرانە بەندیخانەکان بە ڕادەیەک ٧٥% گیراوەکان لە مامۆستایان بوون. (العقيلي،٢٠١٣-ص٩٠) بێگومان ئەمەش کاریگەریی نەرێنی دەبێت لەسەر پرۆسەی خوێندن و چۆنیەتی ڕوانینی قوتابیان و کەسوکاری قوتابیان بۆ بەشێک لە مامۆستاکانیان. بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ناوەندەکانی خوێندن لە سەردەمی کۆماری پتر لە سەردەمی پاشایەتی کەوتە ژێر کاریگەریی سیاسەت و پارت و ڕەوتە سیاسییەکان ئەمەش کاریگەریی نەرێنی لەسەر پرۆسەی خوێندن هەبووە.

٥- لە بواری پەیوەندییەکانی دەرەکی: بەشێوەیەکی گشتی پەیوەندییەکانی عێراق لە سەردەمی (عبدالکریم قاسم) لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری دراوسێیەکانی عێراق و دەوڵەتە زلهێزەکان باش نەبوو دەتوانین بڵێین بەشێک لەو ناسەقامگیرییە سیاسییەی عێراق تیادا بوو دەگەڕایەوە بۆ شکستی سیاسەتی دەرەوەی عێراق، چونکە دیارە کە سیاسەتی ناوخۆ و دەرەکیی هەر وڵاتێک ناتوانرێت کاریگەری بەسەر یەکترەوە نەبێت.

هەر زوو ئەمریکا و رۆژئاوا ترسیان پەیدا کرد لە دەوڵەتێک دروست ببێت میسر و عێراق و سوریا بەخۆوە بگرێت و بە سەرۆکایەتی جمال عبدالناصر، دەوڵەتێکی گەورە و دەوڵەمەند بتوانێت هەموو وڵاتە عەرەبییەکان قووت بدات و هەڕەشە بکات لە بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا و ئەوروپا لە سعودیە و وڵاتانی کەنداو و بەرامبەر بە ئیسرائیل و ئێران و تورکیا بوەستێتەوە، وەکو کاردانەوەیەکیش ئەمریکا و بریتانیا دەستیان بە جووڵە کرد بۆ ئەوەی شۆڕشەکە وڵاتانی تر نەگرێتەوە وەهێزەکانی مارینز لە بەیروت و ئینگلیز لە ئوردن دابەزین بۆ ئەوەی رێگر بن لە بەرامبەر ئەوەی ڕژێمی ئەم دوو دەوڵەتە بڕووخێن و بکەونە ژێر دەسەڵاتی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو، ئەگەری ئەوە هەبوو هێزەکانی ئەمریکا و بریتانیا لە بەیروت و ئوردنەوە هێرش بکەنە سەر عێراق وەکو ساڵی ١٩٤١ داگیری بکەنەوە، بەڵام (عبدالکریم قاسم) دڵنیایی ڕۆژئاوای کردەوە شۆڕشەکە کارێکی ناوخۆی عێراقە و نیازی نییە بچێتە بەرەی (عبدالناصر) ئەمەش وای لە ئەمریکا و بریتانیا کرد چاودێری بارودۆخەکە بکەن. (دیب،٢٠١٣،ص٦٥-٦٦)

سیاسەتی دەرەوەی عێراق گرنگی دا بە بزووتنەوەکانی رزگاریخوازی عەرەبی بە تایبەتی مەسەلەی فەلەستین و هەروەها پشتگیری کرد لە جەزائیر و عومان بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی بە شێوەی ماددی و مەعنەوی. (الچاوشلي،٢٠١١،ص١٩٦) لێرەدا ئەو تێبینییە

دروست دەبێت ئایا عێراق لە بارودۆخێکی ئابووری وا باش بوو یارمەتی دارایی پێشکەش بەم هەموو بزووتنەوەی وڵاتانە بکات، لە کاتێکدا عێراق هەژاری زۆر بووە و لە هەموو بوارەکاندا دەوڵەت پێویستی بە بودجەی زیاتر بوو بۆ پەرەپێدانی ئابووریی وڵات، هەروەها ئایا گەلی ئەم وڵاتانە و بزووتنەوانە ئەم یارمەتییەی عێراقیان لەبەر چاو بووە و بەهەندیان زانیوە، تەنانەت ئایا هیچ هەڵوێستیان هەبوو کاتێک (عبدالکریم قاسم) لە سێدارە درا، بۆیە ئەمە وا دەکات گومان دروست بێت لە راستیی سیاسەتی دەرەکی عێراق لەم بوارەدا.

بەشێوەیەکی گشتی عێراق لە گۆڕەپانی عەرەبیدا گۆشەگیر بوو. (المقصود،٢٠٠٩،ص ٢٥٧) هەرچەندە پەیوەندی لەگەڵ وڵاتانی رۆژئاوای عەرەبی باش بوو مەبەست لە جەزائیر و مەغریب و تونس و لیبیا ، و پەیوەندی لەگەڵ سودان و صومال سنووردار بوو. (الچاوشلي،٢٠١١،ص١٩٧) بەڵام ئەم وڵاتانە سنووریان لەگەڵ عێراقدا نییە و کاریگەرییان لەسەر عێراق نەبوو یان سنووردار بوو.

سەبارەت بە دەوڵەتە عەرەبییەکانی دراوسێی عێراق ئەوە پەیوەندیی لەگەڵ ئوردن خراپ بوو لە ساڵی ١٩٦٠ کەمێک بەرەو باشبوون چوو، سەبارەت بە سوریا لە سەرەتا باش نەبوو بەڵام دوای جیابوونەوەی سوریا لە میسر باش بوو، سەبارەت بە پەیوەندیی عێراق لەگەڵ سعودیە سارد بوو دوای ئەوەی عێراق داوای کرد کوێت بخرێتە سەر عێراق پەیوەندیی عێراق لەگەڵ سعودیە و کوێت و وڵاتانی تری کەنداو گرژی تێکەوت. (الچاوشلي،٢٠١١،ص١٩٧) بەشێک لە هۆکاری تێکچوونی پەیوەندیی عێراق لەم ماوەیەدا لەگەڵ دراوسێیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ ترسی عێراق لە رژێمی سیاسیی نوێ لە عێراق واتە رژێمی کۆماری چونکە لە دراوسێیەکانی عێراق سوریا و تورکیا رژێمی سیاسییان کۆماری بوو لە کاتێکدا رژێمی سیاسیی سعودیە پاشایەتی، ئێران پاشایەتی و ئوردن پاشایەتی بوون بۆیە ئەو وڵاتانە رژێمی پاشایەتی فەرمانڕەوایی دەکرد، لەوە دەترسان ئەوەی لە عێراق

ڕووی دا بۆ وڵاتەکانیان بگوازرێتەوە بە تایبەتی عێراق گەندەڵی بە رژێمی پاشایەتی بەستبۆوە و چاکسازی و پێشکەوتنی بە مۆرکی رژێمی کۆماری دادەنا. هەروەها ئەو چارەنووسە خوێناوییەی بنەماڵەی پاشایەتی لە عێراق لە ئەنجامی شۆڕشەکە ڕووبەڕووی بووەوە وای کردبوو کە پەیوەندییەکانی عێراق و ئوردن ئاسایی نەبنەوە لە بەر ئەوەی بنەماڵەی پاشایەتی عێراق و ئوردن یەک بنەماڵە بوون لە نەوەکانی شەریف حسێن شەریفی مەککە.

لە ٢٥ ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦١ (عبدالکریم قاسم) کۆنگرەیەکی رۆژنامەوانی ڕێکخست تیایدا باسی لەوە کرد کوێت قائمقامیەتێکی سەر بە پارێزگای بەسرەیە و ٦٠ ساڵە لێی دابڕاوە لە کاتێکدا بەشێکە لە عێراق و ناکرێت لێی جیا بکرێتەوە . (دان، بدون سنة النشر،ص٤٣٧) ئەم بڕیارە بڕیارێکی تاک ڕەوانەی قاسم بوو بە باشی بیری لێنەکرابووەوە مەبەستی زیاتر پڕۆپاگەندە بوو بۆ خەریک کردنی ڕای گشتی عێراق بوو بە بابەتی دەرەکی بۆ ئەوەی کێشە ناوخۆیییەکانی عێراق لە بیر بکرێت، ئەم بڕیارە نەتواندرا جێبەجێ بکرێت و نەتواندرا باوەڕ بە لایەنی تر بهێندرێت بە ڕاستیی ئەم شتە. (الجبوري،٢٠١٢ص٢٣٠) تەنانەت عبدالکریم قاسم خۆی هیچ هەنگاوێکی پراکتیکی نەنا لە رووی سەربازییەوە بۆ گەڕاندنەوەی کوێت بۆ عێراق. (الرفیعي،٢٠١٠،ص٨٧) ئەم هەنگاوە هەڵەیە بووە هۆی داتەپینی پەیوەندیی عێراق لەگەڵ زۆربەی وڵاتە عەرەبییەکان هەروەها بووە هۆی ئەوەی درز بکەوێتە پەیوەندیی عێراق لەگەڵ ئەمریکا و بریتانیا و رۆژئاوا بە گشتی، هەروەها رادەیەکی دانا بۆ باشتربوونی پەیوەندیی عێراق لەگەڵ دەوڵەتانی بلۆکی ڕۆژهەڵات. (الچاوشلي،٢٠١١،خ١٩٨) ئەم هەنگاوەی عێراق بووە هۆی ورووژاندنی کێشەیەکی نێودەوڵەتی هەروەها پەیوەندیی وڵاتە عەرەبییەکانی لاواز کرد، و عێراق ڕێز و شکۆی لە بواری نێودەوڵەتی لە دەست دا. (المقصود،٢٠٠٩،ص٢٥٧) لە هەمان کات پەیوەندیی عێراق لەگەڵ ئێران گوماناوی بوو بە تایبەتی عێراق هەستی دەکرد ئیسرائیل لە ئێرانەوە سیخوڕی بە سەر عێراقەوە دەکات. (الرفیعي،٢٠١٠،ص٧٩) بۆیە

هەرچەند هۆکاری ناوخۆ ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لە کۆتاییهێنان بە سەردەمی (عبدالکریم قاسم) لە عێراق بەڵام هۆکاری دەرەکیش ڕۆڵی لەم ڕووەوە کەم نەبوو. (الجبوری، ٢٠١٢، ص٢٣٣)

٦- باوەڕنەبوونی بە ژیانی حزبایەتی (پارتایەتی) لە عیراقدا: هەرچەندە (عبدالکریم قاسم) یاسای کۆمەڵەکانی ژمارە (١) ساڵی ١٩٦٠ی دەرکرد بە گوێرەی ئەم یاسایە کە لە ٢ی کانونی دووەمی ئەوساڵە دەرچوو بڕیاری کۆتایی مۆڵەتپێدانی پارتەکان و چاودێری کردنیان و هەڵوەشاندنەوەیان بە دەستەی گشتی دادگای تێهەڵچوونەوە سپێردرا کە بەرزترین دەزگای قەزاییە لە عیراقدا بە گوێرەی ئەم یاسایە ڕێگا درا بە هەر کۆمەڵە کەسێک کۆمەڵەیەک پێکبێنن بە مەرجێک لەگەڵ سەربەخۆیی و یەکێتی وڵات و ڕژێمە کۆمارییەکەی ناکۆک نەبێت هەروەها کارنەکات بۆ درز خستنە نێوان نەتەوە و ئاین و ئاینزاکان. بە گوێرەی یاساکە ئەو کەسانە دیاری کرابوون کە نەدەبوایە ببن بە ئەندامی حزب ئەوانیش ئەندامانی هێزە چەکدارەکان، قازییەکان، فەرمانبەری وەزارەتی دەرەوە، قوتابیانی قۆناغی سەرەتایی و ئامادەیی وە سەرۆکی یەکە ئیدارییەکان. پارتەکان مافی ئەوەیان پێدرا ڕۆژنامەیەکی زمان حاڵی خۆیان دەربکەن مەرجی ئەوەش دانرا پەنجا کەس داواکاری دامەزراندنی پارت واژوو بکەن. (البوتاني،٢٠٠٧،ص٢٦٢)

بەڵام لە ڕاستیدا (عبدالکریم قاسم) لەگەڵ هێزە سیاسییە عێراقییەکان تووشی گرفت بوو لەبەر ئەوەی باوەڕی بە دەسەڵاتێک بێجگە لە دەسەڵاتی خۆی نەبوو لەم ڕووەوە هێزە نەتەوەییە عەرەبییەکان ئەوانەی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست و بزووتنەوە نەتەوەییە عەرەبییەکان وە یەکگرتووی نەتەوەیی و پارتی ئیستیقلال نوێنەرایەتییان دەکردن داوای مۆڵەتیان بۆ پارتەکانیان نەکرد لەسەر ئەو بنەمایەی (عبدالکریم قاسم) دیکتاتۆرە و باوەڕی بە دیموکراتییەت نییە. (البوتاني،٢٠٠٧،ص ٢٦٤)

سەبارەت بە حزبی شیوعی لە ٩ی شوباتی ١٩٦٠ مۆڵەتی دا بە گرووپی داوود الصائغ لەسەر حیسابی حیزبی شیوعی عێراقی هۆکاری

نەدانی مۆڵەت بە حزبی شیوعی عێراقی لەلایەن قاسم دەگەڕێتەوە بۆ ترسی لە فرەوانبوونی بنکەی حزب لەناو عێراقییەکان ئەوەی دەبووە هەڕەشە لەسەر تاکڕەویی ئەو. (البوتاني،٢٠٠٧،ص٢٧٨-٢٧٩)

سەرەڕای ئەوەی مۆڵەتی بە پارتی ئیسلامی دا بەڵام دوای کەمتر لە ساڵێک مۆڵەتەکەی هەڵوەشاندەوە و داوای کرد پارتەکە ببێتە کۆمەڵەیەکی خێرخوازی. (البوتاني،٢٠٠٧،ص٣٠٧)

بە گوێرەی سەرچاوەیەک (عبدالکریم قاسم) دەیویست حزبەکان بگۆڕێت بۆ ڕێکخراوی حکومی سەر بە دامودەزگاکانی دەوڵەت ئەمەش بەهۆکاری سەرەکی ئاژاوە و پەشێوی لە عێراق لەو ماوەیەدا دادەنرێت (محمد،٢٠١٥،ص٢١٥)

هەروەها (عبدالکریم قاسم) هۆکاری پەرتبوونی پارتی نیشتیمانی دیموکراتی بوو (البوتاني،٢٠٠٧،ص٢٧١). لەم ڕووەوەش سەرچاوەیەک هۆکاری گرفتی سەرەکی سەردەمی (عبدالکریم قاسم) دەگەڕێنێتەوە بۆ دیکتاتۆریەتی ئەو و باشترین بەڵگەش دەهێنێتەوە بەوەی کە ژمارەی گیراوە سیاسییەکان لە عیراق لەوپەڕی چەپەوە بۆ ئەوپەڕی ڕاست زۆر بەرز بووەوە بەڕادەیەک لە ساڵی ١٩٦٠ گەیشتە بیست و دوو هەزار کەس ئەم ژمارەیەش تاکو ئەو ساڵە ژمارەیەکی پێوانەیی بوو لە مێژووی عیراقی نوێ و هاوچەرخدا. (البکری،٢٠١١،ص٢٠٢)

سیاسەتی دیکتاتۆریانەی قاسم بە باشترین شێوە لە هەڵوێستی بەرامبەر مافە نەتەوایەتییەکانی کورد بەدیاردەکەوێت، هەرچەندە لە ٩ی شوباتی ١٩٦٠ مۆڵەتی کارکردنی دا بە پارتی دیموکراتی کوردستان. بەڵام بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ ئۆتۆنۆمی نەبوو بۆ کورد، تەنانەت ڕێگای نەدا بەوەی لە مۆڵەتی پارتەکەش ئاماژەیەک بەوە هەبێت کە بۆ بەدیهێنانی ئۆتۆنۆمی بۆ کورد لە عیراقدا دەکات. سەرەڕای هەوڵی پارتی بۆ نیشاندانی دڵسۆزی بۆ (عبدالکریم قاسم) بە شێوەی جیا جیا، کەچی (عبدالکریم قاسم) پێشوازی لە چەند سەرۆک عەشیرەتێکی ناحەزی بارزانی کرد. ئەمەش لە لایەن مەلا مستەفا بارزانی

لێکدانەوەیەکی نەرێنی بۆ کرا، لە راستیدا بارزانی متمانەی بە قاسم نەدەکرد. هەروەها قاسمیش پارتی و بارزانی بە رێگر دەزانی لەبەردەم چەسپاندنی دەسەڵاتی بەهێزی لە کوردستان. بۆیە هەوڵیدا پارتی لە پارتێکی سیاسی بکات بە رێکخراوێکی رۆشنبیری لە هەمان کاتیشدا باسی لەوە دەکرد دەیەوێت هاوسەنگییەک لە نێوان بارزانی و عەشیرەتە نەیارەکانی دروست بکات. هەروەها شانازیشی بەوە دەکرد و دەیوت ئەو کورد بەگژ یەکتریەوە دەنێت و بەشێوەیەکی نەزانانە شۆڕشەکانی کوردی لە عیراق بە دەستکردی ئیستیعمار دادەنا. (البوتاني،٢٠٠٧،ص٢٨٩-٢٩٢).

(عبدالكريم قاسم) ئامانجی سەرەکی مانەوە بوو لە دەسەڵات بۆ ئەو مەبەستەش هەموو رێگایەکی دەگرتە بەر لەوانە ناکۆکی خستنە نێوان پارت و کەسایەتییە عێراقییەکان لەم رووەوە سەرچاوەیەک دەڵێ لە یەکەم رۆژدا (عبدالكريم قاسم) و (عبدالسلام عارف) هەندێک بڕیاریان دەرکرد بە دوورخستنەوەی زۆربەی هاوکارەکانیان لە ئەفسەرە ئازادەکان لە بەغدا و دانانیان بە پلەی نزمتر (بارزانی،٢٠١٢،ل٦٣).

هەر لەم رووەوەش توێژەرێکی کورد دەڵێ بەڕای من (قاسم) جێگای متمانە نەبوو وە هیچ بیر و باوەڕێکی بێجگە لە مانەوە لە دەسەڵات نەبوو (بوتانی،٢٠١٠،ص٣٢).

لە راستیدا (عبدالكريم قاسم) تووشی پەشێوی بووبوو گومانی لە هەموو لایەنەکان هەبوو وە ئەو زانیارییانەی هەیبوو زۆر ورد نەبوون و گۆڕانیان بەسەردا دەهات بۆ نموونە لە تەمووزی ساڵی ١٩٥٩ چەپەکانی عیراقی تۆمەتبارکرد بە وەستان لەدوای رووداوەکانی مووسڵ و کەرکووک بەڵام دوای وردبوونەوە پەشیمان بووەوە لەم تۆمەتبارکردنەی چەپەکان (بوتانی،٢٠٠٤،ص٣٦) .

**ئەنجام**

شۆڕشی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ هەرچەندە لایەنی ئەرێنی هەبووە بەڵام لایەنی نەرێنیشی هەبووە، لەم توێژینەوەیە ئەنجامە نەرێنییەکانی ئەم شۆڕشە خراوتە روو.

بڵاوبوونەوەی توندوتیژی بەڕادەیەکی بەرچاو یەکێک لە ئەنجامەکانی ئەم گۆڕانکارییە نوێیە بوو لە عێراق ڕوویدا، بە تایبەتی لەناوبردنی تەواوی بنەماڵەی پاشایەتی لە عێراقدا.

ئەمەش سەرەتایەکی خراپ بوو بۆ رژێمی کۆماری لە عێراقدا. هەرچەندە ئەم توندوتیژییە لە سەرەتادا زیاتر لە بەغدادی پایتەخت بوو بەڵام پەیتا پەیتا ناوچەکانی تری عێراقیشی گرتەوە تەنانەت خودی سەرکردەی ئەو کودەتایەش (عبدالکریم قاسم) ساڵی ١٩٦٣ بووە قوربانیی توندوتیژی لە عێراق و گوللەباران کرا، ئەوەی جێگەی سەرنجە هێزێکی بچووکی ناو سوپا توانییان کودەتا بەسەریدا بکەن و ئەو سوپا گەورەیەی نەیتوانی بیپارێزێ ئەمەش باشترین بەڵگەیە لە سەر ئەوەی ١٤ی تەمموزی ١٩٥٨ نەیتوانیوە سەرکەوتوو بێت لەو بەرنامەیەی بۆ عێراق دایнابوو لە ماوەی ساڵی ١٩٥٨ – ١٩٦٣ ناسەقامگیریی سیاسی گرنگترین سیمای ئەو وڵاتە بوو. عبدالکریم قاسم نەیتوانی هاوسەنگی لە نێوان پێکهاتە نەتەوەیی و ئاینەکانی عێراق دروست بکات پەیوەندی لەگەڵ پارتە سیاسییەکان ناجێگیر بوو، تەنانەت پەیوەندی لەگەڵ (عبدالسلام عارف) ی هاوڕێی خراپ بوو.

لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی بارودۆخی عێراق کەم و کوری زۆری هەبوو لە پشتبەستنی بودجەی عێراق بە پلەی یەکەم بە داهاتی نەوت کە لە زیادبووندا بوو ئەمەش بووە هۆی کەمتر گرنگی دان بە کەرتی ئابووری و پیشەسازی، یاسای چاکسازی کشتوکاڵی لە عێراق سەرکەوتوو نەبوو بەپێچەوانەوە و ئەوە بووە هۆی دابەزینی بەرهەمی کشتوکاڵ لە عێراق. هەروەها لە ڕووی کۆمەڵایەتی بووە هۆی

شەڕ لە نێوان جووتیاران و خاوەن زەوییەکان و هەندێک جار کوژراو هەبووە.

لە ڕووی خوێندنەوە گرنگیی چەندایەتی بە خوێندن درا نەک چۆنایەتی هەروەها بڕیاری زەحف (خشین) لە لایەن (عبدالكريم قاسم) درا واتە دەرچوونی هەموو قوتابیان لە پۆلێکەوە بۆ پۆلێکی سەرووتر ئەگەر لە تاقیکردنەوەکان دەرچووبن یان نا بووە هۆی دابەزینی ئاستی خوێندن لە عێراق و بڕوانامەی عێراق ئەو ناوبانگەی پێشووی نەما.

لە بواری سیاسەتی دەرەکی پەیوەندییەکانی عێراق لەگەڵ زۆربەی دراوسێیەکانی باش نەبوو هەروەها لەگەڵ ڕۆژئاوا جێگیر نەبوو بۆیە دەتوانین بڵێین سیاسەتی دەرەوەی عێراق سەرکەوتوو نەبوو تەنانەت پەیوەندیی خراپی عێراق لەگەڵ زۆربەی دەوڵەتان بە تایبەتی دراوسێیەکانی کاریگەری هەبوو لەسەر ناسەقامگیریی سیاسی لە عێراق، بۆیە بە شێوەیەکی گشتی هەڵەی سەرەکی بریتی بوو لەوەی زۆربەی دەسەڵاتەکان بە دەستی عبدالكريم قاسم بوون ئەویش ئەگەر ئەفسەرێکی بە توانا بوو بەڵام سیاسەتی سەرکەوتوو نەبوو.

## لیستی سەرچاوەکان:

### سەرچاوەکان بە زمانی عەرەبی:


١- احمد ، الدكتور كمال مظهر ،(١٩٧٨)، دور الشعب الكوردي في ثورة العشرين العراقية، بغداد، مطبعة الحوادث.

٢- امين زكي، الدكتور مأمون ،(٢٠١١)، ازدهار العراق تحت الحكم الملكي ١٩٢١ – ١٩٥٨ دراسة تاريخية، سياسية، اجتماعية مقارنة، لندن، دار الحكمة.

٣- باش اعيان، احمد ،(٢٠١٣)، انقلاب ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق خلفياته وذيوله مع موجز عن العهد القاسمي (١٩٥٨ – ١٩٦٣)، لندن، دار الحكمة.

٤. البكري ، د. ياسين سعد محمد ،(٢٠١١)، بنية المجتمع العراقي جدلية السلطة وتنوع العهد الجمهوري الاول ١٩٥٨ – ١٩٦٣ انموذجا، بغداد، ثائر جعفر العصامي للطباعة الفنية الحديثة.

٥- بوتاني ، الدكتور عبدالفتاح علي ،(٢٠٠٤)، من كان وراء حوادث الموصل وكركوك الدامية ٨ اذار– ١٤ تموز ١٩٥٩، اربيل، مطبعة الثقافة.

٦- البوتاني ، الدكتور عبدالفتاح علي ،(٢٠٠٧)، التطورات السياسية الداخلية في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨ – ٨ شباط ١٩٦٣، دهوك، مطبعة خاني.
٧- بوتاني ، عبدالفتاح علي ،(٢٠١٠)، من ارشيف جمهورية العراق الاولى الحركة الشيوعية في تقارير مديرية الامن العامة ١٩٥٨ – ١٩٦٢ دراسة تاريخية سياسية، اربيل، مطبعة حاجى هاشم.
٨- الجبوري ، نصير محمود شكر ، (٢٠١٢) السياسة الخارجية للجمهورية العراقية ١٩٥٨-١٩٦٣ (دراسة في ضوء مقولات مجلس الوزراء)، قطر، دار ضفاف للطباعة والنشر والتوزيع.
٩- الچاوشلي ، هادي رشيد ، (٢٠١١)، الزعيم عبدالكريم قاسم وموعده مع التاريخ، بيروت، الدار العربية للموسوعات.
١٠- حبيب ، موسى ، (١٩٥٨)، ثورة ١٤ تموز، شركة مطبعة بغداد.
١١- الخيون ، رشيد ،(٢٠٠٤)، ضد طائفية العراق... جدل ما بعد نيسان ٢٠٠٣، الطبعة الثالثة، الامارات العربية المتحدة، مطابع المتحدة للطباعة والنشر.
١٢- دان ، اوريل ، (بدون سنة النشر)، العراق في عهد قاسم تاريخ سياسي ١٩٥٨-١٩٦٣، ت: جرجيس فتح الله، السويد، السليمانية دار نبز للطباعة والنشر.
١٣- دقاق، باسيل ،(٢٠١٠)، عهد المهداوي، بيروت، الرافدين للطباعة والنشر.
١٤- ديب، د. كمال ،(٢٠١٣)، موجز تاريخ العراق من ثورة العشرين الى الحروب الامريكية والمقاومة والتحرير وقيام الجمهورية الثانية، بيروت، دار الفارابي.
١٥- الرفيعي ، العقيد محسن- مدير الاستخبارات العسكرية في عهد الزعيم عبدالكريم قاسم ،(٢٠١٠)، انا والزعيم مذكرات ، اعداد و تحرير الدكتور ستار جبار الجابري، بغداد، مطابع شركة مجموعة العدالة للصحافة والطباعة والنشر .
١٦- سلوغت و سلوغت، (٢٠٠٣)، ماريون فاروق سلوغت و بيتر ، من الثورة الى الدكتاتورية العراق منذ ١٩٥٨، المانيا، منشورات الجمل.
١٧- السمر ، عمار علي ،(٢٠١٢)، شمال العراق ١٩٥٨ – ١٩٧٥ دراسة سياسية، بيروت، المركز العربي للابحاث ودراسة السياسات.
١٨- شومان ، عبدالخالق ناصر ،(٢٠١٣)، الطائفية السياسية في عراق العهد الجمهوري، لندن، دار الحكمة.
١٩- العقيلي، محمود جواد ، (٢٠١٣)، ١٤ تموز ثورة وإنحراف، بغداد، دار الجواهري.
٢٠- علاوي، الدكتور عبدالامير ،(٢٠٠٠)، تجارب وذكريات، لندن.

٢١- محمد، سمر فضلا عبدالحميد ،(بدون سنة النشر)، اكراد العراق تحت حكم عبدالكريم قاسم ١٩٥٨ – ١٩٦٣م رسالة مقدمة للحصول على درجة الماجستير، جامعة الزقازيق، كلية الاداب، قسم التاريخ.
٢٢- المقصود ، حامد مصطفى ،(٢٠٠٩)، سيرة ثائر مدارات الاخوة الاعداء ثورة ١٤ تموز الخلفيات، الوقائع، النهايات، وسيرة ذاتية - مصر، دار المرتضى.
٢٣- الملا ، نوار سعد محمود ،(٢٠١١)، العراق بين العهدين الملكي والجمهوري ١٩٢٠ – ٢٠٠٣، الاردن، الاهلية.
٢٤- وانلي، عصمت شريف ، (بدون سنة النشر)، كوردستان العراقية هوية وطنية (دراسة في ثورة ١٩٦١) ترجمة: الدكتورة سعاد محمد خضر، السليمانية، مطبعة شڤان.
٢٥- وائى، اديث ،(١٩٨٩)، أيف، بينروز، العراق دراسة في علاقاته الخارجية وتطوراته الداخلية ١٩١٥ – ١٩٧٥، ترجمة عبدالمجيد حسين القيسي، الجزء الاول، بيروت، الدار العربية للموسوعات.
٢٦- الونداوي، الدكتور مؤيد ابراهيم ،(١٩٩٠)، وثائق ثورة تموز ١٩٥٨ في ملفات الحكومة البريطانية، بغداد، مطابع دار الشؤون الثقافية العامة.

**سەرچاوەکان بە زمانی کوردی:**

1 - بارزانی ، مسعود ، (٢٠٠٤)، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد- شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١ – ١٩٧٥، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.
٢- بارزانی ، مسعود ،(٢٠١٢)، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، ١٩٥٨ – ١٩٦١، بەرگی دووەم، هەولێر.
٣ - تریب ، چارلز ،(٢٠١٠)، چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی عێراق. لێکۆڵینەوەیەکی بەڵگەنامەییە لە مێژووی عیراقی نوێ لەسەرەتای دروست بوونی دەوڵەتی نوێ تا ناوەڕاستەکانی ٢٠٠٢، وەرگێڕانی: محمد حوسێن و عبدالقادر کەلهور، چ ٢، هەولێر، چاپخانەی رۆژهەڵات.
٤- عبدالخالق، مسعود ، (٢٠٠٨)، مەوسوعەی جودی بۆچەمک و زاراوەکانی سەردەم، هەولێر، نووسینگەی التفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن.

## ملخص البحث


## الجوانب السلبية لثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق

١٤ تموز ١٩٥٨ حدث مهم في تاريخ العراق المعاصر. مع ان البعض اعتبره انقلاباً والبعض اعتبره ثورة، ولكن في النتيجة كانت ثورة وأكثر شعبياً من كل الاحداث الاخرى التي سميت بالثورة في تاريخ العراق المعاصر. ومع ان قادة هذه الثورة قاموا بوضع خطط ايجابية، ولكن في نفس الوقت كان لهذه الثورة نتائج سلبية ايضا. لذلك اخترنا هذا الموضوع (الجوانب السلبية لثورة ١٤ تموز في العراق) عنوانا لبحثنا. وخاصة ان احداً لم يتناول هذا الجانب.

في البداية تم التطرق الى الفرق بين الانقلاب والثورة، بعد ذلك بينا رأينا بان هذا التغيير الذي حدث في العراق في ١٤ تموز ١٩٥٨ كان ثورة، وقمنا بتقسيم النتائج السلبية الى خمسة نقاط رئيسية هي:

١. ازدياد العنف في العراق ومن ابرز مظاهرها قتل معظم افراد العائلة الملكية في العراق عام ١٩٥٨.

٢. عدم الاستقرار السياسي في العراق: كانت علاقة عبدالكريم قاسم مع كل من القوميين العرب والشيوعيين والكورد غير مستقرة، حتى سرعان ما ظهر الخلاف بين عبدالكريم قاسم وعبدالسلام عارف. وفي عام ١٩٦١ قام حرب بين الحركة القومية الكوردية والجيش العراقي واستمر الى انتهاء حكم عبدالكريم قاسم في العراق في ٨ شباط ١٩٦٣.

٣. من الناحية الاقتصادية والاجتماعية: كان الاقتصاد العراقي يعاني من مشاكل كثيرة ابرزها اعتماد الاقتصاد الرئيسي على مورد وحيد وهو النفط، اضافة الى ذلك فان قانون الاصلاح الزراعي في العراق ادى الى تقلص الانتاج الزراعي بدل ان يؤدي الى زيادة الانتاج الزراعي. ومن الناحية الاجتماعية تدهورت العلاقات بين الفلاحين واصحاب الاراضي الزراعية الى درجة وجود قتلى بين الجانبين في بعض الحالات.

٤. من الناحية التعليمية: على الرغم من الاهتمام بالجانب الكمي في التعليم وزيادة عدد الطلاب في مختلف المراحل، الا ان ذلك كان على حساب نوعية التعليم في العراق اي انخفاض المستوى التعليمي في العراق.

٥. من ناحية العلاقات الخارجية: تدهورت العلاقات الخارجية للعراق مع معظم دول الجوار والقوى العظمى في العالم، مما كان له اثر على عدم الاستقرار السياسي في العراق لانه ادى الى تدخل بعض الدول في الشؤون الداخلية العراقية.

## Abstract

### The negative sides 14th of July, 1958 revolution in Iraq

Fourteen of July 1958, was an important event in the history of modern Iraq. Although this event is mentioned as a revolution in many sources. The leaders of this revolution achieved some good acts but, at the same time, the revolution resulted in many negative points in Iraq. Thus, the title of this paper is chosen depending on these negative sides. It is worth mentioning here, that no paper has been done under this title our own times.

This paper starts with clarifying the differences between a Coup and a revolution. Regarding the negative consequences of this Coup, they are dealt with in five main titles:

1- The development of violence in Iraq, especially the elimination of the Iraqi royal family.

2- Political instability in Iraq: Abdul Karim Qassem's relationship with Arab nationalists, communists and Kurds was unstable, until the dispute between Abdul Karim Qasim and Abdul Salam Aref, the greatest leaders of the July 14 revolution in Iraq, soon emerged. In 1961, a war between the Kurdish nationalist movement and the Iraqi army continued and ended the rule of Abdul Karim Qasim in Iraq in 1963.

3- In terms of economic and social: The Iraqi economy was suffering from many problems, notably the dependence of the main economy on the sole supplier of oil, in addition to the law of agricultural reform in Iraq led to a reduction of agricultural production rather than lead to an increase in agricultural production. From the social point of view, relations between farmers and owners of agricultural land have deteriorated to the point where there are dead between the two sides.

4- In terms of education: Despite the interest in the quantitative aspect in education and increase the number of students in various stages, but that was at the expense of the quality of education in Iraq, which led to a decline in the level of learning in Iraq.

5- Foreign affairs: Iraq's foreign affairs have deteriorated with most neighboring countries and the world's superpowers, which had an impact on the political instability in Iraq because it led to the intervention of some countries in the internal affairs of Iraq.

# عەبدولخالق مەعرووف
## (١٩٣٥-١٩٨٥)
# ژیان و ڕۆڵی سیاسیی و ڕۆشنبیری

**د.فەرەیدون عەبدولڕەحیم عەبدوڵڵا**
کۆلێژی پەروەردەی بنەڕەتی
بەشی زانستە کۆمەڵایەتییەکان
زانکۆی سەلاحەدین – هەولێر

**پێشەکی**

هێشتا زۆرن ئەو کەسایەتییە نیشتمانپەروەرانەی کە لە رابردوودا رۆڵێکی مەزنیان گێڕاوە، کەلێنی گەورەیان پڕ کردۆتەوە، جێ دەستیان دیاربووە، کاریگەرییان هەبووە و خزمەتی زۆریان کردووە، بەڵام لە ناوەندە ئەکادیمییەکاندا ئاوڕیان لێنەدراوەتەوە. عەبدولخالق مەعرووف یەکێکە لەو کەسایەتییانە کە لە ناوەندە ئایینییەکاندا پێگەیشت، بەڵام زوو ئەو ناوەندە جێدەهێڵێت و تێکەڵ بەبواری تەکنیک دەبێت و وەکو تەکنیکارێکی بلیمەت دەردەکەوێ، پاشان وەک شارەزایەکی بواری ئەدەبی کلاسیکی کوردی، دواتریش وەک رووناکبیرێکی گەورە و کاریگەر دەناسرێت.

هەڵبژاردنی ئەم بابەتەش بۆ تویژینەوە هەر لە سۆنگەی مەزنی ئەو کەسایەتییەوە سەرچاوەی گرتووە، کە لەژیانیدا رۆڵێکی گەورەی گێڕاوە لە خزمەتکردن بەنەتەوەکەی ، بە تایبەت لە رێگەی دروستکردنی ئێزگەی رادیۆ و پێشخستنی لەناو شۆڕشی کوردستاندا، پاشانیش لە رێگەی بەرهەمی نووسینەوە.

ئەم تـوێژینەوەیە لە پێـنج تەوەر، ئەنجـام، لیسـتی سـەرچاوەکان، پاشـکۆکان، پوختەی توێژینەوە بەهەردوو زمـانی عەرەبی و ئینگلیـزی، پێکهـاتووە. لە تەوەری یەکەمـدا بـاس لە لـەدایکبـوون و پێگەیشـتنی کەسـایەتی عەبـدولخالق مەعـرووف دەکەیـن کە لەو قۆنـاغەدا وەکـو کەسێکی ئـایینی دەردەکەوێت، ئەویش بەهـۆی خوێندنی و پیشەکەشی وەک ئیمـام تـابوور لە سوپای عێراقدا. لە تەوەری دووەمیشدا بـاس لە کەسـایەتی و تایبەتمەنـدییەکانی عەبـدولخالق مەعـرووف دەکەیـن کە خـاوەن کەسـایەتییەکی بەرز و جیـاواز بـووە. لە تەوەری سێیەمیشـدا بەناوونیشـانی (هەڵوێسـت و ژیـانی سیاسـی) بـاس لە هەڵوێسـتی نیشتمانپەروەرانە و ژیانی سیاسی عەبدولخالق مەعرووف دەکەین، کە لەپـاڵ پیشـەکەی و لەپێنـاو نەتەوەکەیـدا تـێکەڵ بە سیاسـەت دەبێت و پاشان بە یەکجاری ژیانی ئایینی جێدەهێڵێت و دەچێتە ریزی شۆڕشی کوردسـتانەوە. لە تەوەری چوارەمیشـدا بـاس لە چالاکییەکـانی عەبـدولخالق مەعـرووف لە بـواری تەکنیـک و دروسـتکردنی ئێـزگەدا دەکەین و تێیدا تیشک دەخەینە سەر رۆڵی لەخۆبووردووانەی کە وەک بلیمەتێـک بەهـرەکەی دەخـاتە خـزمەت پرسـی نەتەوەکەی و رۆڵێکـی کـاریگەری تێـدا دەگێڕێـت. لە تەوەری پێـنجەم و کۆتاییشـدا بـاس لە بەرهەمە نووسـراوەکانی عەبدولخالق مەعرووف دەکەین، کە ژیانیشی هەر لەپێناو نووسین و بیرکردنەوە و راستگۆیی دانا. دواتریش بەچەند خاڵێک ئەو ئەنجامانە دەخەینە روو کە لە توێژینەوەکەدا سەبارەت بەو کەسایەتییە، پێیانگەیشتووین.

بۆ ئامـادەکردنی ئەم توێژینەوەیە پشـتمان بەسـتووە بە بەڵگەنـامە بڵاونەکـراوە و بڵاوکراوەکـان، دیـدارەکان، نـامەی زانکـۆیی، کتێـب، ئینسـکلۆپیدیا، چـاپکراوە حکومییەکـان، گۆڤـار، رۆژنـامە، کاسـێتی تۆمـارکراو و بەرنـامەی تەلەفزیـۆنی. بەڵگەنامەکـان بـایەخی تـایبەتی خۆیـان هەبـوو بـۆ تـوێژینەوەکە بەتـایبەت بڵاونەکراوەکـان، کە یەکەم جـارە لێـرەدا دەخـرێنە بەرچـاو و بڵاودەکـرێنەوە، بەڵگەنـامەی

بڵاوکراوەش بایەخی خۆی هەبوو، چونکە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەباتی نهێنی و شاخ. هەروەها دیدارەکانیش کە لەگەڵ کەسوکارو هاوڕێ نزیکەکانی عەبدولخالق مەعرووف کراون، سەرچاوەی ئێجگار بەنرخی ئەم توێژینەوەیەن، لەبەرئەوەی زۆربەی زانیارییەکانیان یەکەم جارە بڵاودەکرێنەوە. کتێبەکانیش بەهەردوو زمانی کوردی و عەرەبی بەشێکی دیکەی سەرچاوەکانی ئەم توێژینەوەیەن و سوودیان لێوەرگیراوە بەتایبەتی (بەهاریزان بیرەوەری و بەسەرهات...)ی کاکە مەم بۆتانی، (رحلة الأيام والقدر المقدور)ی دکتۆر محەمەد شەریف ئەحمەد و (چیرۆکی من و گوندەکەم- بەرگی سێیەم)ی حەمەکەریم هەورامی، کە نووسەرەکانی هەر سێ کتێبەکە هاوڕێی عەبدولخالق مەعرووف بوون. هەروەها کتێبەکانی عەبدولخالق خۆیشی، باشترین کەرەستە بوون بۆ هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکانی، بەتایبەتیش (ئادەمزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا) کە دوای بڵاوبوونەوەی کاردانەوەی زۆری بەدوای خۆیدا هێنا و دواتریش ئەو بابەتە کرایە بیانوویەک بۆ تیرۆرکردنی لەلایەن حوکومەتی عێراقەوە. سەرچاوە جیاوازەکانی دیکەش کە لە لیستی سەرچاوەکاندا خراونەتە روو، هەریەکەیان گرنگی و بایەخی خۆیان هەبوو لە دەوڵەمەندکردنی توێژینەوەکەدا.

ئاستەنگەکانی ئەم توێژینەوەیە، کەمیی سەرچاوە و زانیاریی بەردەستە دەربارەی ئەم کەسایەتییە. نەنووسینی بیرەوەری و یادداشتیش لەلایەن عەبدولخالق مەعرووفەوە لەوانەیە زۆر لایەن و وردەکاریی ژیانی ئەو کەسایەتییەی بەشاراوەیی هێشتبێتەوە، ئەوەش خۆی لەخۆیدا توێژەر دووچاری ئاستەنگ دەکاتەوە، هەرچەندە لە رێگەی دیدارەکانەوە تا رادەیەک توانراوە ئەم کێشەیە چارەسەر بکرێت.

لە کۆتاییدا، پێمانوایە هیچ کارێکی زانستیی تەواو و بێ کەموکوڕیی نییە، بۆیە هیواداریین بەرەخنە و سەرنجی زانستییانە هەوڵ بدرێ کەموکوڕییەکان چارەسەر بکرێن و خزمەتی زیاتر بەم کەسایەتییە بکرێت.

**یەکەم: لەدایکبوونی و پێگەیشتنی:**

عەبدولخالق مەعرووف محەمەدئەمین لە ١ی کانونی دووەمی ١٩٣٥ لە گوندی سەید عوبێد لە ناحیەی کەندیناوەی سەر بەشارۆچکەی مەخموور لە بنەماڵەیەکی ئایینی لەدایک بووە (دیدار لەگەڵ محەمەد ئیسماعیل، هەولێر، ٢٨ی تەموزی ٢٠١٦). مەعرووفی باوکی مەلایەکی دیاری ناوچەکە بووە، پیاوێکی ئازا و قسەخۆش و نیشتمانپەروەر بووە (رۆڤار، ژمارە ١٧، ٢٠٠٥، ل٢). باوکی لە گوندەکانی شۆڕەزەرتکە، سەید عوبێد، سەید ئەمین، شێخ شەروان، زەمزەمۆک ی ناحیەی کەندیناوە مەلایەتی کردووە. ئاغاکانی ئەو گوندانە بەربەرەکانێی زۆریان کردووە و بە پشتیوانی جووتیارانیان لەقەڵەمداوە، هەر بەو هۆیەشەوە لەکاتی راپەڕینی جووتیارانی دەشتی هەولێر لەساڵی ١٩٥٣دا خانووەکەیان رووخاندووە و لە گوندەکەیدا دەریانکردووە، ئەویش هاتۆتە هەولێر و تێیدا نیشتەجێ بووە (دیدار لەگەڵ مەحفوز عەبدولقادر مەعرووف، هەولێر، ٢٧ی نیسانی ٢٠١٩).

عەبدولخالق ساڵی ١٩٤٤ خراوەتە بەر خوێندن و تا پۆلی پێنجەمی سەرەتایی خوێندووە، پاشان باوکی لە قوتابخانە دەریهێناوە و خستوویەتییە بەر خوێندنی ئایینی لە حوجرە لای مەلا (دیدار لەگەڵ محەمەد ئیسماعیل، هەولێر، ٢٨ی تەموزی ٢٠١٦)، لە حوجرەش قۆناغەکانی قوتابی و سوختەیی و موستەعید[1]ی تەواوکردبوو، ئیجازەی دوازدە عیلمەکەی مەلایەتی بەسەرکەوتوویی وەرگرتبوو (خەزنەدار، ٢٠١١، ل١٨٦).

ساڵی ١٩٥٤ عەبدولخالق مەعرووف لەگەڵ نزیکەی ٢٠٠ موستەعید و فەقێ، داوایەکیان پێشکەشی موتەسەریفی هەولێر ئیسماعیل حەقی کردووە، بۆ کردنەوەی پەیمانگایەکی ئایینی، بۆئەوەی لە پلەی فەقێ رزگاریان بێت، موتەسەریفیش پشتگیریی داواکارییەکەیانی کردووە، هەرچەندە ژمارەیەک مەلا چوونەتە لای موتەسەریف ناڕەزاییان دەربڕیوە و بەشیوعییان لەقەڵەمداوە و ویستوویانە بەلێدانی بدەن (کوردستانی نوێ، ژمارە ٤٥٤٢، ٢٠٠٨/٤/١٠). ئەو هەنگاوەی عەبدولخالقیش نیشانەی ئەوەیە کە ویستوویەتی ئایین

لەدەست مەلاکان دەربهێنێت، فێربوون و خوێندنی ئایینی بە ئەکادیمی بکات و خوێندکاران لەرێگەی پسپۆران و ئەکادیمیستانەوە فێربن نەک لە حوجرە و مزگەوت لەسەر دەستی مەلا، هەربۆیەش دژی ئەو هەنگاوە مەلاکان نارەزاییان دەربڕیوە.

دوای خوێندنی ئایینی، ساڵی ١٩٥٤ بەمەبەستی درێژەدان بەخوێندن بڕیاری داوە بچێتە زانکۆی ئەزهەر لە میسر، بۆ ئەم مەبەستە سەرەتا داواکارییەکی پێشکەشی زانکۆکە کردووە، بەڵام بەبیانووی نەبوونی بڕوانامەی فەرمیی دانپێدانراو داواکارییەکەی پەسند نەکرا و هەلی خوێندنی لەو زانکۆیە بۆ نەڕەخسا، لەبەرئەوە بەناچاری گەڕایەوە هەولێر، پاشان چۆتە بەغدا و لەوێدا لەلای شێخ محەمەد قزڵجی (١٨٩٧–١٩٥٩)و عەلائەدین سەجادی (١٩٠٧–١٩٨٤) خوێندوویەتی (رۆڤار، ژمارە ١٧، ٢٠٠٥، ل٣؛ باس، ژمارە ٢٤٤، ٢٠١٥/٦/٣٠). ئەو خوێندنەش هەر بەئامانجی ئەوەبوو جارێکی دیکە بۆ وەرگیرانی لە زانکۆی ئەزهەر زەمینە خۆش بکات (دیدار لەگەڵ دکتۆر محەمەد شەریف ئەحمەد، هەولێر، ١٦ی شوباتی ٢٠١٩).

ساڵی ١٩٥٦ عەبدولخالق مەعرووف یەکێک بووە لەو ٣٠ کەسەی کە بەشداری تاقیکردنەوەیەکی وەزارەتی بەرگری عێراقی کردووە بۆ ئیمام تابووری، لەئەنجامدا تەنیا ٢ کەس لە تاقیکردنەوەکە سەرکەوتوو بوونە، کە عەبدولخالق یەکێکیان بووە و بۆتە ئیمام تابووری سوپا لە بەغدا. ئەو کارەشی دیسان ئامانجی زەمینەخۆشکردن بووە بۆ وەرگیرانی لە زانکۆی ئەزهەرو دەیویست لەو رێگەیەوە مۆڵەتی خوێندن وەربگرێ و کارەکانیشی بۆ وەرگیران لە زانکۆکە ئاسانتر بکات، ئەمە سەرەڕای ئەوەی کە ئیمام تابوور پلەکەی ئەفسەر و مووچەکەشی باش بوو، بەڵام بەهۆی هێرشە سێ قۆڵییەکەی (ئیسرائیل، فەرەنسا و بەریتانیا) بۆ سەر میسر هەر لەو ساڵەدا، ئەو پلانەشی سەری نەگرت (دیدار لەگەڵ دکتۆر محەمەد شەریف ئەحمەد، هەولێر، ١٦ی شوباتی ٢٠١٩؛ احمد، ٢٠١١، ص١٧) و هەر بەئیمام تابوور مایەوە تا لە ساڵی ١٩٦٣ دا پێوەندیی بە شۆڕشی کوردستانەوە کرد.

**دووەم : کەسایەتی و تایبەتمەندییەکانی:**

عەبدولخالق مەعرووف مرۆڤێکی خوێن گەرم و چاو مەیلەو قاوەیی بوو، هەموو گیانی وزە و ورە بوو، هەمیشە دەم بەپێکەنین بوو کە قاقای لێدەدا لە دوورەوە گوێت لێدەبوو (بێکەس، بەرگی یەکەم، ٢٠١٣، ل١٥٧). شێوە و دەنگی پێکەنینی زۆر تایبەت بوو، لەناخەوە بەدەنگێکی بەرز پێدەکەنی و بەوەش ناسرابوو (دیدار لەگەڵ عەبدولڕەقیب یوسف، سلێمانی، بەڕێگەی تەلەفۆن، ٨ی شوباتی ٢٠١٩؛ دیدار لەگەڵ بارزان مەلا خالید، هەولێر، ٢١ی شوباتی ٢٠١٩؛ دیدار لەگەڵ عەبدولغەنی عەلی یەحیا، هەولێر ١٧ی نیسانی ٢٠١٩). بەردەوام پێدەکەنی و هەرگیز خەمبار نەدەبوو (دیدار لەگەڵ بارزان مەلا خالید، هەولێر، ٢١ی شوباتی ٢٠١٩) زۆر قسەخۆش و نوکتەباز بوو، شەوانە کۆڕی دانیشتنی لەگەڵ هاوڕێیانیدا گەرموگوڕ و خۆش دەکرد. (دیدار لەگەڵ کاکە مەم بۆتانی، هەولێر، ١٧ی شوباتی ٢٠١٩؛ دیدار لەگەڵ عومەر حەمەدەمین دزەیی، هەولێر، ٦ی نیسانی ٢٠١٩).

عەبدولخالق بەقەڵافەت گەورە و باڵابەرز بوو، بەڵام بە هەست کەسێکی دڵ ناسک و بەسۆز و جوانپەرست و هەژار پەروەر بوو (ڕۆژنامەی باس، ژمارە ٢٨١، ٢٠١٦/٤/١٢). کەسایەتییەکی بەهێزی هەبوو، چاوتێر و سەربڵند بوو، هەمیشە بەهەڵوێست بوو سەری دانەنواندووە و ڕاستگۆ بووە لەگەڵ خۆی و دەستپاک و زمان پاک بوو. (کوردستانی نوێ، ژمارە ٤٥٤٢، ٢٠٠٨/٤/١٠). هاوڕێیانی خۆی زۆر خۆشدەویست و بەرانبەریان بەهەڵوێست بوو و دەستی یارمەتی و هاوکاری بۆ درێژکردوون، تەنانەت لەڕووی ماددیشەوە (دیدار لەگەڵ عومەر حەمەدەمین دزەیی، هەولێر، ٦ی نیسانی ٢٠١٩)، لەم ڕووەشەوە هەڵوێستی گەورەی نواندووە بەجۆرێک کە ساڵێکیان یەکێک لە هاوڕێکانی تووشی نەخۆشی شێرپەنجە بووە، عەبدولخالق ویستوویەتی خانووی خۆی بۆ بفرۆشێت و بەمەبەستی چارەسەرکردنی ڕەوانەی دەرەوەی وڵاتی بکات، بەڵام هەر زوو هاوڕێکەی بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە کۆچی دوایی کردووە. (دیدار لەگەڵ هاشم کەریم سلێمان، هەولێر، ١٠ی نیسانی ٢٠١٩).

عەبدولخالق هەرگیز بەدوای پارە نەبوو، چونکە بڕوای پێنەبوو، تەنانەت دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتی ١٩٧٠ بەهۆی ئەوەی پێشتر ئیمام تابوور بووە لە سوپای عێراقدا، خانەنشین کراوە و ٣٠ دیناری بۆ بڕاوەتەوە، لەهەمان کاتیشدا لەنێو شۆڕشی کوردستانیشدا مانگانە ٦٠ دیناری هەبووە، بەڵام دوای بڕینەوەی مووچەی خانەنشینی خۆی داوای لە بەرپرسانی کورد کرد کە ٣٠ دینار لە مانگانەکەی ببڕن، بەهۆی وەرگرتنی مووچەی خانەنشینی لە حکومەتی عێراق. (رۆژنامەی میدیا، ژمارە ١٦٩، ٢٠٠٤/٩/١).

عەبدولخالق سەرەڕای ئەوەی هەرگیز بەدوای ماددەدا نەبووە و بیری لە دەوڵەمەندی نەکردۆتەوە، لەهەمان کاتیشدا کەسایەتییەکی نیشتمانپەروەر بووە و هەمیشە لەخەمی ئازادی کوردستاندا بووە، هەربۆیەش نسکۆی شۆڕشی کوردستان لەساڵی ١٩٧٥دا زۆر کاری لێدەکات بەجۆرێک ئەو شەوەی کە لەلایەن سەرکردایەتی کوردەوە بڕیاری کۆتاییهێنان بە شۆڕش دەدرێت، عەبدولخالق لە رێگەی خواردنەوەی بڕێکی زۆر لەخواردنەوە کحولییەکانەوە هەوڵ دەدات لەواقیعی شکست دەرچێت و کۆتایی پێهێنانی شۆڕشی پێ قبوڵ ناکرێت. (دیدار لەگەڵ دکتۆر محەمەد شەریف ئەحمەد، هەولێر، ١٦ی شوباتی ٢٠١٩).

عەبدولخالق مرۆڤێک بوو لەگەڵ دونیای پێشکەوتن و مۆدێرن و عەلمانییەت و زانست و مەعریفەدا بوو، بڕوای بەخورافیات و هەڵسوکەوتی تەقلیدی و سواو نەبوو، خاوەنی کەسایەتی خۆی بوو، لەگەڵ رەوتی تازەگەری و پێشکەوتنەکان و گۆڕانکارییەکان بوو لەهەموو بوارێکدا، بەردەوام رەخنەی لە شتە باو و سواو و گەندەڵە تەپیوەکان دەگرت. پێیوابوو نابێ لە کاروانی بەرەو پێشچوونی دونیا دابڕێین و بەجێ بمێنین. (رۆژنامەی خەبات، ژمارە ٢٤٦٢، ٢٠٠٧/٤/١٢). رووناکبیرێکی بێ هاوتا بوو لەخۆی نەبێ لە کەسی تر نەچووە، رووناکبیرانە دەیڕوانییە رووداو و دیاردە سیاسییەکان، ژیرانە لە هەموو پرسێکی فەلسەفی قووڵ دەبۆوە. ئەوەندە لە ئایین شارەزا بوو

بەپێی میتۆدی مەلایەتی و شەریعەت هەموو مەلایەکی دەبەزاند، تەنانەت هەموو مامۆستایەکی فەلسەفە لە زانکۆ و شێخێکی تەریقەتیش زاتی نەدەکرد لەگەڵیدا بکەوێتە گفتوگۆ. ئەو خۆی ناسیبوو پێش ئەوەی خەڵک بناسێ، گومانی لە بیروباوەڕی خۆی نەبوو، دوودڵیی نەدەزانی، سووریش بوو لەسەر بۆچوونەکانی تا پلەی لاساری لە هەندێ هەڵوێستدا، کە ئەمانە هەموو رەوشتێکن زانای راست و دروست پێڕەوی دەکات. (خەزنەدار، ٢٠١١، ب١٨٦-١٨٧).

عەبدولخالق لەکاتی رۆیشتندا روو لە ئاسمان بوو، ئەوەشی لەبەر لووتبەرزییەوە نەبوو، بەڵکو سروشتی خۆی وابوو، لەنێو کۆمەڵگەشدا نەیتوانیوە بەئاسانی بژیت، بەڵکو هەمیشە جیاواز و روحێکی یاخیبوونی تێدابوو، خاوەن فیکرو بوێر بوو، وەک نموونەیەکیش سەبارەت بە روحە یاخیبووەکەی و جیاوازییەکەی، ساڵی ١٩٧٩ ماڵیان لە گەڕەکی ئازادی بوو، رۆژانە بەسواری پایسکل دەچووە دووکانەکەی کە لەلای قەڵای هەولێر بوو، لەکاتێکدا پارەی هەبوو ئۆتۆمبیل بکڕێت، زۆر لەخزمان و هاوڕێیانیشی پێیاندەگوت بۆ تۆ جوان نییە بەپایسکل هاتوچۆ بکەی، بەڵام ئەو دەیگوت دەمەوێت ئەو بەستەڵەک و عەیبەیە بشکێنم و ئەمە لە کەسایەتی من کەم ناکاتەوە، چونکە ئەوەی من دەیکەم لە بەرژەوەندیی گشتیی دایە و پایسکل ژینگە پیس ناکات و خەرجی نییە و تەنگ بە خەڵک و شەقامەکانیش هەڵناچنێ. شتێکیش کە سوودی هەبێت، بۆچی مرۆڤ ئەو ئازایەتییەی تێدا نەبێت کە پێڕەوی بکات؟ دواتریش ئۆتۆمبیلێکی بچووکی کڕی. (رۆژنامەی باس، ژمارە ٢٨١، ٢٠١٦/٤/١٢). ئەو نموونەیەش سەرەڕای جیاوازی و روحی یاخیبوونی، سادەیی و ژینگە دۆستیی عەبدولخالق مەعرووف نیشان دەدات.

ئەو مرۆڤە نەک هەر خۆی بایەخی بە ژینگە و خاوێنی داوە، بەڵکو هانی خەڵکیشی داوە بۆ پاک راگرتنی سروشت و پاراستنی تەندروستییان، بۆ نموونە ئەو ماوەیەی کە لە ئێزگەی دەنگی کوردستانی عیراق کاری دەکرد لە ناوچەی چۆمان، دانیشتوانی

ناوچەکەی هانداوە کە ئاودەست لە ماڵەکانیان دروست بکەن و ژینگە و سروشتی ناوچەکە پیس نەکەن، لەبەرئەوەی لەو سەردەمەدا واتە سالانی شەستەکان و حەفتاکان زۆربەی خەڵکی گوندەکان ئاودەست لە ماڵەکانیاندا نەبوو. (دیدار لەگەڵ قەرەنی ئەسوەد، هەولێر، ٢١ی ئابی ٢٠١٧؛ دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولخالق مەعرووف، هەولێر، ١٧ی مایسی ٢٠١٩).

نموونەیەکی دیکە لەسەر کەسایەتیی جیاوازی عەبدولخالق مەعرووف بۆ ئەو کاتە دەگەڕێتەوە کە ئیمام تابووری سوپا بوو لە بەغدا، رۆژێکیان بە جلوبەرگی مەلایەتییەوە چۆتە یەکێک لە سینەماکانی ئەو شارە بۆ سەیرکردنی فیلمێک. (دیدار لەگەڵ عەبدولغەنی عەلی یەحیا بۆتانی، هەولێر ١٧ی شوباتی ٢٠١٩)، دەتوانین بڵێین بەو کارەی ویستوویەتی وا نیشان بدات کە نابێت هیچ شتێک ببێتە بەربەست لەبەردەم پێشکەوتندا و ئەو لەگەڵ شکاندنی کۆت و پێوەند بووە.

عەبدولخالق لە پێوەندییەکانیدا زۆر جێی متمانە بووە، تەنانەت لەماوەی شۆڕشی ئەیلولیشدا ئەو ماوەیەی کە لە ئێزگەدا کاری کردووە (١٩٦٣-١٩٧٥)، مەلا مستەفا بارزانی و سەرکردایەتی کورد زۆر متمانەیان پێ هەبووە. (دیدار لەگەڵ مەحفوز عەبدولقادر مەعرووف، هەولێر، ٢٧ی نیسانی ٢٠١٩)، بەهۆی راستگۆیی و نیشتمانپەروەریشییەوە مەلا مستەفا بارزانی زۆر پشتی پێدەبەست، تەنانەت گوتبووی: هەرکاتێک عەبدولخالق ویستی سەردانم بکات، دەرگا بۆی کراوەیە و کەس رێی لێ نەگرێت، چونکە زۆر متمانەی پێ هەبوو. (دیدار لەگەڵ قەرەنی ئەسوەد، هەولێر، ٢١ی ئابی ٢٠١٧)، بەڵام عەبدولخالق ئەگەر بۆ کارێکی پێویست نەبووایە نەدەچووە لای، لەبەرئەوەی مەراییکەر نەبوو. (دیدار لەگەڵ محەمەد رەشید عەبدولرەحمان/ حەمە رەشید هەرەس، سلێمانی- بەرێگەی تەلەفۆن، ٢٨ی مارتی ٢٠١٩).

دیارە هەر بەهۆی ئەو تایبەتمەندییانەی کە لە سەرەوەدا خستمانە ڕوو، مستەفا زەڵمی (١٩٢٤-٢٠١٦)یش، پێیوابێت کە عەبدولخالق مەعرووف کەسایەتییەکی جیاوازی هەبووە و ئەم جیاوازییانەی

تێدابووە: بتکوشتایە درۆی نەدەکرد، هەرگیز بەدوای پلەو پایەدا نەدەچوو، دڵسۆزێکی کورد و کوردستان بوو و لەزیرەکیشدا بلیمەت بوو (زەڵمی، ٢٠١٦، ل١٢٨).

**سێیەم: هەڵوێست و ژیانی سیاسی:**

خوێندنی ئایینی و هەوڵدانی بۆ وەرگیرانی لە زانکۆی ئەزهەر نەبووە هۆی ئەوەی کە عەبدولخالق مەعرووف لەپرسی نەتەوەکەیدا بێلایەن بێت، بەڵکو هەر لەساڵی ١٩٥٦دا کە بۆتە ئیمام تابوور لە سوپای عێراقدا، هەر لەو ساڵەشدا پێوەندی بەپارتی دیموکراتی کوردستانەوە کردووە و ژیانی سیاسی دەستپێکردووە. (ئینسکلۆپیدیای یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، ٢٠١٣، ل١٩٢).

لە ساڵی ١٩٦٣دا عەبدولخالق بەغدای جێهێشت و گەڕایەوە هەولێر، پاشان لە کۆیە پێوەندی بەشۆڕشی کوردستانەوە کرد و لەوێش کەڵکیان لە توانا و شارەزاییەکانی وەرگرت بۆ دامەزراندنی ئێزگەی شۆڕش. (رۆڤار، ژمارە ١٧، ٢٠٠٥،ل٣).

بەهۆی ململانێی سیاسییەوە، ساڵی ١٩٦٤ دابەشبوون و کەرتبوون لەنێو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا روویدا و لەئەنجامدا ژمارەیەک لەئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی لەو حیزبە جیابوونەوە. (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: البوتاني، ٢٠٠٢، ص١٣٣-١٤٩)، دواتر ئەو باڵە بەباڵی مەکتەبی سیاسی ناسران. عەبدولخالق مەعرووف یەکێک بوو لە ئەندامانی ئەو باڵە و هەر لەگەڵ ئەوانیشدا بەرەو هەمەدان رۆیشت، پاشان گەڕانەوە و ئەویش گەڕایەوە سەر کارە سەرەکییەکەی کە ئێزگە بوو. (رۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٤٥٤٢، ٢٠٠٨/٤/١٠؛ بێکەس، بەرگی یەکەم، ٢٠١٣، ل١٥٧).

لە ساڵی ١٩٦٨یشدا لەکاتی گفتوگۆی نێوان حکومەتی عێراق و سەرکردایەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستاندا، عەبدولخالق مەعرووف کراوەتە بەڕێوەبەری گومرگی قەزای دووکان، بەڵام لەکاتی شکستهێنانی گفتوگۆدا لەلایەن حکومەتەوە دەسگیر کراو رەوانەی

بەندیخانەی بەغدا کرا لەوێشەوە گواسترایەوە بەندیخانەی مووسڵ، بەڵام لەلایەن سەرکردایەتی کورد مەلا مستەفا بارزانی (١٩٠٣-١٩٧٩) برووسکەیەکی توند ئاڕاستەی حکومەت کرا بۆ ئازادکردنی، ئەوەبوو ئازادکرا و جارێکی دیکە پێوەندی بەشۆڕشی کوردستانەوە کرد. (گۆڤاری گەیاندن، ژمارە ١، کانوونی دووەمی ٢٠٠٧، ل٥٤؛ ڕۆژنامەی باس، ژمارە ٢٤٤، ٢٠١٥/٦/٣٠).

هەرچەندە لەماوەی شۆڕشی ئەیلولدا عەبدولخالق مەعرووف زیاتر وەک تەکنیکارێکی بلیمەت خزمەتی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستانی کردووە (لە تەوەری پێنجەمی تویژینەوەکەدا ئەم بابەتە زیاتر روون دەکەینەوە)، بەڵام دوای تەواوکردنی خولی ئەلیکترۆنی و گەڕانەوەی لە ئەڵمانیا لە ساڵی ١٩٧٢دا، ماوەیەک کراوەتە بەرپرسی ئیدارەی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و لە چەند خولێکی پێگەیاندنی کادیرانی ئەو حیزبەشدا محازەرەی پێشکەش کردووە. (دیدار لەگەڵ مەحفوز عەبدولقادر مەعرووف، ٢٧ی نیسانی ٢٠١٩؛ دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولقادر مەعرووف، ١٧ی مایسی٢٠١٩).

ساڵی ١٩٧٥ دوای رێککەوتننامەی جەزائیر، عەبدولخالق قسەی بۆ پێشمەرگەکان دەکرد و ورەی بەرز دەکردنەوە، چونکە لەو کاتەدا بەهۆی ئەو رێککەوتننامەیەوە ورەیان دابەزیبوو، بەڵام بەقسەکانی عەبدولخالق ورەیان بەرزبۆوە کە پێیگوتبوون ئێمە درێژە بە شۆڕش دەدەین و خۆمان رادەستی حکومەتی عێراق ناکەینەوە و نابێ پێشمەرگە بیر لە دانانی چەک بکاتەوە، ئەو بارودۆخەش کاتییە و تێیدەپەڕێنین. (دیدار لەگەڵ مەلا محەمەد بەحرکەیی، هەولێر، ٣٠ی مارتی ٢٠١٩). ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە عەبدولخالق مەعرووف لەکاتی شکستی جووڵانەوەی سیاسی و چەکداریی کورددا بێ ئومێد نەبووە و پێیوابووە کە دەبێ شۆڕشی کورد بەردەوام بێ تا گەیشتن بەسەرکەوتن.

دوای نسکۆی شۆڕشی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥دا، عەبدولخالق مەعرووف رووی کردۆتە ئێران و لەوێشەوە چۆتە ئەڵمانیا. (کوردستانی نوێ، ژمارە ٤٥٤٢، ٢٠٠٨/٤/١٠). لەوێشدا لەتێکۆشان نەوەستا، بەڵکو هەر دوای دامەزراندنی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان لەساڵی ١٩٧٥دا، بەشداری کردووە لە دامەزراندنی لقی ئەورووپای یەکێتی نیشتمانی. (شەهید رێبەری گەلە، ١٩٨٥، ل٢)، پاشانیش بۆتە ئەندامی کۆمیتەی ئەورووپای یەکێتی. (ئەحمەد، ٢٠١٠، ل١٦٤-١٦٥).

بەڵام دوای ماوەیەک هەر لەو ساڵەدا چۆتە باڵیۆزخانەی عێراق لە ئەڵمانیا و چاوی بە باڵیۆز کەوتووە و خۆی پێناساندووە و پێیگوتووە ئەگەر هیچ رێکارێکی بەرانبەر نەگرنەبەر، ئەوا دەیەوێ بگەڕێتەوە هەولێر و دەست بەژیانی ئاسایی خۆی بکاتەوە، باڵیۆزیش بەڵێنی پێدەدات کە هیچ رێکارێکی لەگەڵدا ناکەن، بۆیە عەبدولخالق مەعرووف لەساڵی ١٩٧٦دا گەڕایەوە هەولێر. (دیدار لەگەڵ هاشم کەریم سلێمان، هەولێر، ١٠ی نیسانی ٢٠١٩). دوای ئەوە دەستی بەکاری ئازاد کرد، سەرەتا دووکانێکی لای قەڵای هەولێر دانا بۆ چاککردنەوەی رادیۆ و تەلەفزیۆن، بەڵام بەهۆی ئەوەی کە پارەی چاککردنەوەی لە خەڵک وەرنەدەگرت، یان ئەگەر کەرەستەی خۆی بۆ بەکاربهێنایە پارەیەکی کەمی وەردەگرت، بۆیە لەپێناو باشترکردنی گوزەرانی هەر لەلای قەڵا دووکانێکی دیکەی دانا و وەکالەتی کۆمپانیایەکی ئەفریقی وەرگرت بۆ کەلوپەلی کارەبایی، بەڵام لەوێشدا کەلوپەلەکانی بەقازانجێکی زۆر کەم و هەندێ جاریش هەر بەبێ قازانج دەیفرۆشتنەوە. (دیدار لەگەڵ عەبدولغەنی عەلی یەحیا، هەولێر، ١٧ی شوباتی ٢٠١٩)، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەرگیز بیری لەلای مادده و خۆ دەوڵەمەندکردن نەبووە و قازانجی بۆ خەڵک ویستووە نەک بۆخۆی.

بەڵام سەرەڕای خەریکبوونی بە کاری ئازاد، دەستبەرداری سیاسەت نەبووە، بەڵکو دوای گەڕانەوەشی لە ئەڵمانیا هەروەکو دۆستێکی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان مایەوە. (ئینسکلوپیدیای یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، ٢٠١٣، ل١٩٢).

دووکانەکەیشی بەتەنیا شوێنی کاسبی نەبوو، بەڵکو ببووە شوێنی کۆبوونەوەی رووناکبیران و گفتوگۆی رۆشنبیری و سیاسی. (دیدار لەگەڵ کاکە مەم بۆتانی، هەولێر، ١٧ی شوباتی ٢٠١٩)، هەرئەوەش وای کردبوو کە لەلایەن دکتۆر مارف خەزنەدارەوە (١٩٣٠-٢٠١٠) دووکانەکە بە (ئەکادیمیای عەبدولخالق مەعرووف) ناوبنرێ. (خەزنەدار، ٢٠١١، ل١٨٥). تەنانەت رووناکبیرانی شاری سلێمانییش لە دووکانەکەیدا سەردانیان کردووە. (دیدار لەگەڵ عەبدولرەقیب یوسف، سلێمانی- بەرێگەی تەلەفۆن، ٨ی شوباتی ٢٠١٩)، هەروەها لەو دووکانەدا باسی هەموو شتێک دەکرا، هەرچەندە هەندێ جار لەگەڵ شیوعییەکان و بیروباوەڕیان هەڵی نەدەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەم پاک و دڵ بێگەرد و مێشک سارد بوو بەرانبەریان و رێزی دەگرتن. (خەزنەدار، ٢٠١١، ل١٨٧). ئەو لە خەباتی شاخیشدا ئەوکاتەی کە لە ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق کاری دەکرد، هەمان هەڵوێستی بەرانبەر ئەو کەسانە هەبووە کە کاریان لەگەڵیدا کردووە و پێشتر شیوعی بوونە لەوانەش ساڵح حەیدەری و سامی عەبدولڕەحمان و زوهێر عەبدولمالک کە کوردێکی فەیلی بوو، عەبدولخالق پێیوابوو کە ئەوانە شیوعین و کوردپەروەر نین، هەربۆیەش خۆشی نەدەویستن، چونکە خۆی کوردپەروەر و ناسیۆنالیست بوو. (دیدار لەگەڵ عومەر حەمەدەمین دزەیی، هەولێر، ٦ی نیسانی ٢٠١٩). عەبدولخالق مەعرووف ئاراستەی بیرکردنەوەی بەرەو رۆژئاوا بوو، نەک رۆژهەڵات، باوەڕی بە جەمسەری سۆسیالستی نەبوو، زیاتر سەرسام بوو بەپێشکەوتنەکانی ئەڵمانیای رۆژئاوا. (دیدار لەگەڵ عەبدولغەنی عەلی یەحیا، هەولێر، ١٧ی شوباتی ٢٠١٩).

عەبدولخالق مەعرووف نەیدەویست کوڕەکانیشی خزمەتی سەربازی بکەن، ئەوەبوو کاتێک پشکۆی کوڕە گەورەی لەساڵی ١٩٨٤دا خوێندنی زانکۆ تەواو دەکات، دەبوو وەکو هەر کەسێکی دیکە سەربازی بکات، بەڵام عەبدولخالق ناهێڵێ بچێتە ریزی سوپای عێراقەوە و هەرخۆی تەسلیمی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانیی کوردستانی دەکات

و دەبێتە پێشمەرگە، ئەویش هاوشێوەی باوکی لە بواری تەکنیک لە ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان کار دەکات. (دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولخالق مەعرووف، هەولێر، ١٧ی مایسی ٢٠١٩). عەبدولخالق دەیگوت من چۆن پێشمەرگە بوویمە دەبێ کوڕەکانیشم ڕێچکەی من بگرن. (دیدار لەگەڵ قەرەنی ئەسوەد، هەولێر، ٢١ی ئابی ٢٠١٧).

جێی ئاماژە پێدانە لەپێش جەنگی عێراق ئێرانەوە (١٩٨٠-١٩٨٨)، گرووپێک لە ڕووناکبیران کە پێکهاتبوون لە: عەبدولخالق مەعرووف، نوری نانەکەلی، موحسین ئاوارە، محەمەد ئەمین محەمەد ساڵح (دهۆکی)، کاکە مەم بۆتانی، پاشان عەبدولحەمید عەبدولمەجید و حەیدەر هەمزەش بوونە ئەندامی گرووپەکە، زۆرجاریش مامۆستایان قەرەنی ئەسوەد، نەوزاد محەمەد عەلی، ئیسماعیل خۆشناو، عادل عەبدولسەمەد و خورشید ئیسماعیل بەشدارییان دەکرد، هەندێ جاریش دکتۆر نافیع ئاکرەیی، مامۆستایان ئەنوەر جاف، نەجیب ئامێدی، عەبدولباست عەبدولسەمەد دەچوونە پاڵیان، گرووپەکەش بە بازنەی یانەی ئازادی ناسرابوون، لە یانەکەدا کە کەوتبووە گەڕەکی ئازادی دەوری یەکتریان دەدا و هەندێ جاریش ڕووناکبیرانی شارەکانی دیکەش کە دەهاتنە هەولێر میوانی ئەم بازنەیە دەبوون، ئەو بازنەیە شەوچەرەیان ئەدەب و فەلسەفە و چالاکییە ڕووناکبیرییەکان بوو، بەچرپە و هێما دەنگوباسی کوردقڕان و شۆڕشیان دەگێڕایەوە، کە دەوری مێزەکەشیان لەپیاوانی حیزبی بەعسی فەرمانڕەوا چۆڵ دەبوو، باسی سیاسەت، شۆڕش و چالاکییەکانی پێشمەرگە، شەڕی ناوخۆ...هتد بەئاشکرا دەکرا، بەڵام هەموویان جێی متمانەی یەکتری بوون، هەربۆیەش هەرچی دەگوترا لە بازنەکە دەرنەدەچوو و کەسیان تووشی نشوستی نەهاتن. ئەو بازنەیە سەر بەهیچ ڕێکخراوێکی سیاسی نەبوون و کوردایەتی تاکە ڕێگایان بوو. (ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ١٢٦١، ١٩٩٦/٤/١٢).

لەمـاوەی گفتوگـۆی یەکێتـی نیشـتمانیی کوردسـتان و حکـومەتی عێراقیش لە سـاڵانی ١٩٨٣-١٩٨٤دا. (بۆ زانیاریی دەربارەی گفتوگۆکە بڕوانە: سمایل، ٢٠١٠، ل٣٩-٥٤)، مـحەمەد مـوکری و حەمەی حەمە بـاقی وەک دوو نوێنەری یەکێتیی نووسـەرانی کوردستان شـارەکان دەگەڕان، تـا بیر و بۆچـوونی یەکێتیـی نووسـەران بـاس بـکەن و هەنگاوەکـانی گفتوگـۆ بگێـڕنەوە و داوا لە ئەدیبـانیش بـکەن بەرهەمەکانیـان بـۆ گۆڤـاری نووسـەری کوردسـتان بنێـرن. لەو چوارچێوەیەشـدا دوو نووسـەرەکە لەگەڵ ژمارەیەک ڕووناکبیری شـاری هەولێر لەماڵی نوری نانەکەلی[٢] لە شـاری هەولێردا دانیشـتنێک سـاز دەکەن و تـا بەرەبەیـان پرسـەکان تـاوتوێ دەکەن، یەکێـک لەو ڕوونـاکبیرانەش عەبـدولخالق مەعـرووف بـووە، تەواوی ڕوونـاکبیرانیش لەسـەر ئەوە کـۆک بـوونە کە حکـومەتی عیراق جێی بڕوا نییە و بەرانبەر جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان بەفێڵە، دەبێ بەژیری و وردی مامەڵەی لەگەڵدا بکەن. (بۆتانی، ٢٠٠٨، ل٧٧). عەبـدولخالق مەعـرووف بـڕوای بە حیزبـی بەعس نەبـوو تـا گفتوگـۆی لەگەڵـدا بکرێـت، پێیوابـووە کە نیـاز و ئامـانجی بەعـس لەو گفتوگـۆیەدا سوود وەرگرتن لە کات و خۆ تەرخانکردنیان بووە بۆ جەنگی عێراق-ئێـران ١٩٨٠-١٩٨٨. لە دانیشتنەکەشـدا جەختـی لەسـەر یەکگرتـوویی هەڵوێستی کردۆتەوە و پێیوابووە کە بەو یەکگرتووییە دەتوانن ڕۆڵـی زیـاتر لە بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کوردسـتاندا بگێـڕن. (دیدار لەگەڵ حەمەی حەمە باقی، هەولێر، ٢٨ی مارتی ٢٠١٩).

شـایانی باسـە هەر لەمـاوەی گفتوگۆی نێوان حکومەتی عێراق و یەکێتیی نیشـتمانییدا، سـەدام حسـێن سـەرۆک کۆمـاری عێراق (١٩٧٩-٢٠٠٣)، لەمیـانی لێدوانێکیدا گوتبـووی: "لەو ڕۆژانەدا کەسـێک سـەردانی کردم، منیش پێمگوت تۆ پێتوانەبێت لەو کەسانە شەریفتری کە پێش تـۆ سـەردانیان کـردووم". عەبـدولخالق مەعـرووفیش وای لێکـدەدایەوە کە سـەدام حسـێن لەو قسـانەیدا مەبەسـتی مـام جەلال تاڵەبـانی سـکرتێری گشـتی یەکێتیـی نیشـتمانیی بـووە کە لەوکـاتەدا بەمەبەسـتی گفتوگـۆ

سەردانی بەغدای کردووە، هەربۆیەش عەبدولخالق ئەو قسانە بەسووکایەتی دەزانێت و راستەوخۆ دوای گوێبیستبوونی لە کوردستان دا سەردانی مام جەلال دەکات و زۆر بەتووڕەییەوە پێیدەڵێت: " نابێت ئەو قسانە قبوڵ بکەیت، دەبێت هەر ئێستا وەڵامی بدەیەوە". دیارە کەم کەس هەبوو بەو شێوەیە قسە لەگەڵ مام جەلال بکات. (دیدار لەگەڵ حەمەی حەمە باقی، هەولێر، ٢٠١٩)، بەڵام ئەوە نیشانەی بڕوا بەخۆبوونی عەبدولخالق مەعرووف بووە بەرانبەر سەرکردەیەکی کورد، هەڵوێستەکەشی لە سۆنگەی نیشتمانپەروەری و دڵسۆزی بووە بۆ نەتەوەکەی.

لێرەدا پێویستە ئەوەش بڵێین کە عەبدولخالق مەعرووف دۆستێکی دێرینی مام جەلال بووە، لە سەرەتای دەستپێکردنی گفتوگۆی یەکێتیی نیشتمانی و حکومەتی عێراقیشدا، رۆژێکیان مام جەلال زیاتر لە (٢٠) رووناکبیری داوەتی سووڕداش کرد[٣]، تا بیروبۆچوونیان لەبارەی گفتوگۆوە وەربگرێ، کە عەبدولخالق یەکێک بووە لەوان و لەوێشدا بێمتمانەیی خۆی بەرانبەر حکومەت نیشاندابوو، هەروەها دژایەتی خۆیشی بۆ شەڕو ناکۆکی نێوان حیزبە سیاسییەکانی کوردستان نیشان دابوو و چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیانی بەپێویست زانی بوو. لە هەمان کاتیشدا بەپێویستی زانی بوو کە رووناکبیرانیش ململانێی نێوانیان بەلاوە بنێن و یەکگرتوو بن، چونکە ئەوکات ئەوانیش لەنێو خۆیاندا خەریکی ململانێ بوون و بەیاننامەیان لەسەر یەکتر دەرکردووە. (دیدار لەگەڵ مەلا بەختیار، هەولێر، ٢٤ی مایسی ٢٠١٦).

هەر لەو دانیشتنەیدا لەگەڵ رووناکبیران، مام جەلال دوای ئەوەی بارودۆخەکە بۆ ئامادەبووان شیدەکاتەوە، هەوڵ دەدات دانیشتنەکە بقۆزێتەوە بۆ قسەکردن لەسەر ئەدەب و هونەر، روو دەکاتە شێرکۆ بێکەس (١٩٤٠-٢٠١٣)و داوای خوێندنەوەی شیعری لێدەکات، ئەویش تازەترین شیعری خۆی کە (دووڕیان) بووە، دەخوێنێتەوە، دوای خوێندنەوەیشی چەپڵەی بۆ لێدەدەن و مام جەلال و ژمارەیەکی دیکەش

سەرسامیی خۆیان بەرانبەر شیعرەکە نیشان دەدەن کە لە ناوەڕۆکەکەیدا باسی لە بێئومێدی خەڵک و چەقبەستنی گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عێراق دەکات، عەبدولخالق مەعرووفیش سەرنجی خۆی دەربارەی شیعرەکە دەردەبڕێت و دەڵێت: " ئەمن پێموایە، ئەو شیعرە هەر قسەکانی مام جەلال بوون و کاک شێرکۆ کردوونی بەشیعر"، ئەو کۆمێنتەش شێرکۆی توورە کردووە و بە عەبدولخالقی گوتووە: "تۆ کەی لە شیعر ئەزانی؟... شیعر و دەرنەفیز! من رەخنەم قبووڵە، بەڵام قەت ئامادە نیم گوێ لە رەخنەی دەڕنەفیزی بگرم". ئیتر بۆ چەند چرکەیەک بێدەنگی باڵی بەسەر دانیشتنەکەدا کێشاوە، مام جەلالیش بۆ کۆتاییهێنان بە بێدەنگییەکە گوتوویەتی: " ئەوەی کاک عەبدولخالق دەیڵێ، ئەسڵەن وانییە... شیعرەکەی کاک شێرکۆ قسەکانی من نەبوون، لە راستیدا قسەکەی من شیعرەکەی کاک شێرکۆ بوون". (کوێستانی، ٢٠١٧، ل٣٣٨-٣٣٩).

هەر بەهۆی پتەوبوونی پێوەندیی لەگەڵ مام جەلالدا، لەماوەی گفتوگۆی نێوان یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و حکومەتی عێراقدا، یەکێتی لیستێک بۆ ئەنجومەنی یاسادانانی عێراق ئامادە دەکات و لەسەر داوا و پێشنیازی مام جەلال ناوی عەبدولخالق مەعرووفیش وەکو کەسێکی نیشتمانپەروەر لەنێو لیستەکەدا دادەنرێت، بەڵام دواتر بەهۆی سەرنەکەوتنی گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی عێراقدا، ئەو لیستە هەر لای یەکێتی نیشتمانیی کوردستان مایەوە. (دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولخالق مەعرووف، هەولێر، ١٧ی مایسی ٢٠١٩).

شایانی باسە عەبدولخالق مەعرووف پێوەندی و دۆستایەتی تەنیا لەگەڵ رووناکبیران و سیاسەتمەدارانی باشووری کوردستان نەبوو، بەڵکو لەگەڵ بەشەکانی دیکەی کوردستانیش پێوەندی و دۆستایەتی هەبوو، بۆ نموونە لەگەڵ دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو (١٩٣٠-١٩٨٩) سکرتێری حیزبی دیموکراتی کوردستان- ئێران دۆستایەتی هەبووە، سالآنی هەشتاکان کاتێک زانیویەتی قاسملو هاتۆتە هاوینەهەواری

پیرمـــام، لەگەڵ چەنـد هـاوڕێیەکی سـەردانیان کـردووە و باسـی هەرەسـهێنانی شۆڕشـی ئەیلـول (١٩٦١–١٩٧٥) و پیلانـی داگیرکەرانـی کوردسـتانیان لەگەڵ کـردووە، هەروەهـا عەبـدولخالق بە قاسـملوی گوتـووە، کە پەند لە هەڵەکانی بزووتنـەوەی رزگـاریخوازی باشـووری کوردسـتان وەربگـرن، هۆشداریشـی داوەتـێ کەوا کـارێکی وانەکەن حکومەتی عێراق شتیان لەسـەر بسـەپێنێ و بکەونە ژێر کاریگەرییان. (بۆتـانی، ٢٠٠٨، ل٦٣-٦٤). ئەمەش بەڵـگەی خەمخـۆریی عەبـدولخالق مەعرووف بووە بۆ نەتەوەکەی لە سەرانسـەری کوردسـتان، لە هەمان کاتیشـدا بـڕوا بەخۆبـوون و وریـایی نیشـان دەدات لەوەی کە رێ بەسـەرکردەیەک نیشـان دەدات و ئاگـاداری دەکـاتەوە لە هەڵەنەکردنـی گەورەی سیاسی کە بەقازانجی دوژمن بشکێتەوە.

**چوارەم: چالاکییەکانی لە بواری تەکنیک و دروستکردنی ئێزگەدا:**

عەبدولخالق مەعرووف تـا سـاڵی ١٩٥٦ کە لە بەغدا بووە ئیمام تابوور لە سوپای عێراقدا، هەر لەسەر رێڕەوی ئایینی دەڕۆیشت، بەڵام زۆری نەبرد بەرەو رێڕەوێکی دیکە هەنگاوی هاویشت ئەویش گەڕان بوو بەدوای زانست و فێربوون لە بوارەکانی تەکنیکدا. هۆکاری ئەو هەنگاوەشی هەروەک عەبدولخالق خۆی بۆ هاوڕێیانی گێڕاوەتەوە بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە: رۆژێکیـان لەکـاتی پشـووی کارکردنیـدا لە سـوپادا، لەکاتی نان خواردنیدا لەگەڵ ژمارەیەک لە ئەفسەران کە لەگەڵیدا بوونە، دەکەوێتە گفتوگۆ و چەند ئایەتێکی قورئان و فەرموودەیەکی پێغەمبەر دەخاتە ڕوو، لەوکاتەدا یەکێک لە ئەفسەرەکان گوتوویەتی: چییە هەموو رۆژێ ئـایەت و فەرموودەمـان بـۆ بـاس دەکەیـت، بـڕۆ بزانـە زانسـت بەکوێ گەیشـتووە، فـڕۆکە چـۆن دروسـت کـراوە، رادیـۆ و تەلەفزیـۆن چۆن دروست کراون؟. ئیدی ئەو قسـانەی ئەفسـەرەکە دەبێتە هۆکـار و هانـدەر بـۆ عەبـدولخالق تـا لەپاڵ رێڕەوە ئایینییەکەیدا بەرەو رێڕەوی زانسـت و تەکنیکـیش هەنگـاوبنێ. (دیـدار لەگەڵ ئەمـجەد عەبدولواحیـد، سـوید- بەڕێگەی تەلەفۆن، ٢٣ی مایسی ٢٠١٩).

دوای ئەوە عەبدولخالق پاش تەواوبوونی کاری فەرمیی، دەچووە لای وەستایانی رادیۆ، تا شارەزایی پەیدابکات لەسەر پێکهاتەکانی رادیۆ پاشان هەنگاوەکانی دەست پێبکات بۆ دروستکردنی ئێزگەی رادیۆیی. (دیدار لەگەڵ دکتۆر محەمەد شەریف ئەحمەد، هەولێر، ١٦ی شوباتی ٢٠١٩). ئیدی بەرە بەرە هەنگاوە پراکتیکییەکانی دەستپێکرد، کابرایەکی ئەرمەنی هەبوو لە بەغدا دووکانی فرۆشتنی کەرەستەی کارەبایی هەبوو، ئەویش دەچووە لای بۆ کڕینی کەرەستە سەرەتاییەکان، کابرای ئەرمەنییش دەیزانی عەبدولخالق تەنها بۆ وەرگرتنی ئەزموون پێویستی بەکەرەستەکانە، بۆیە پێیدەگوت: مەیانکرە، کەرەستە پێویستەکانت ببە، کە پێویستیت پێیان نەما بیانگێڕەوە (دیدار لەگەڵ هاشم کەریم سلێمان، هەولێر، ١٠ی نیسانی ٢٠١٩). هەر لەو ماوەیەشدا محەمەد شەریفی هاوڕێی، کە پێکەوە ئیمام تابوور بوون لە سوپادا و لە خانوویەکیشدا پێکەوە دەژیان، رادیۆیەکی بۆخۆی کڕیبوو، ئەویش لێی وەرگرتبوو و کردبوویەوە، بەڵام لەکاتی کارکردن لەسەری چەند کەلوپەلێکی لێ سووتاندبوو، بۆیە عەبدولخالق پێیگوتبوو: رادیۆکەت بەچەند کڕیوە؟ حەزدەکەم بۆ خۆمی هەڵبگرمەوە. ئەو هەڵوێستەشی بۆ ئەوەبوو کە بەرانبەر هاوڕێکەی شەرمەزار نەبێت. (دیدار لەگەڵ هاشم کەریم سلێمان، هەولێر، ١٠ی نیسانی ٢٠١٩).

بەم شێوەیە لە ساڵی ١٩٥٦دا دەستی داوەتە دروستکردنی جۆرێک لە ئێزگەی رادیۆیی و لەو کارەشیدا بەردەوام بوو، تا ساڵی ١٩٦٠ لە بەغدا بەنهێنی ئێزگەیەکی دروستکرد. (رۆژنامەی میدیا، ژمارە ١٦٩، ٢٠٠٤/٩/١)، محەمەد شەریفی هاوڕێیشی بەخۆی و رادیۆیەکی بچووکەوە بەئۆتۆمبیلی خۆی رۆژانە دەڕۆیشت، تامەودای گەیشتنی ئێزگەکە تاقی بکاتەوە کە چەند کیلۆمەترێک دەڕۆیشت. (دیدار لەگەڵ دکتۆر محەمەد شەریف ئەحمەد، هەولێر، ١٦ی شوباتی ٢٠١٩). هەندێ جاریش ئێزگەکەی لەماڵەوە کە لە گەڕەکی تۆپچی بوو، دەکردەوە، خۆیشی بەرادیۆیەکی بچووکەوە دەڕۆیشت، تامەوداکەی تاقی بکاتەوە. (رۆژنامەی خەبات، ژمارە ٢٤٦٠، ٢٠٠٧/٤/١٠).

ئێزگەکە گۆرانی و سروودی پەخش دەکرد، خەڵکیشی تووشی سەرسوڕمان کردبوو لەوەی نەیاندەزانی ئەو ئێزگەیە چییە و هی کێیە؟، دەزگای ئەمن و هەواڵگریی حکومەتی عێراقیش هەوڵێکی زۆریان داوە بۆ دۆزینەوەی، بەڵام نەیانتوانیوە بیدۆزنەوە. (رۆژنامەی باس، ژمارە ٢٨١، ٢٠١٦/٤/١٢).

هەندێ جاریش هەر بۆ خۆشیی، عەبدولخالق خۆی شتێکی ئامادە دەکرد و بەدەنگی خۆی لە ئێزگەکەدا دەیخوێندەوە، بۆ نموونە ساڵی ١٩٦١ رۆژێکیان بە ساڵح یوسفی (١٩١٨-١٩٨١) کە ئەوکات بەرپرسی رێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە لە بەغدا، دەڵێت: لە رۆژانی داهاتوودا لە رێگەی خوێندنەوەی بابەتێک لە ئێزگەدا ئەفسەرانی خۆمان لە سوپای عێراقدا دەترسێنم، ئەوەبوو رۆژێکیان تەنیا سروودی نیشتمانی لە ئێزگەکەدا پەخش دەکات و لەناکاو ئەو بابەتەی کە خۆی ئامادەی کردبوو دەیخوێنێتەوە، دەڵێت:"هنا بغداد... قرر مجلس الوزراء احالة كل من فلان وفلان...الخ الى التقاعد"، بەو هۆیەشەوە ئەو ئەفسەرانەی ناویان خوێندرابوویەوە پێوەندی بەیەکترەوە دەکەن و هەریەکەیان دەڵێت من خانەنشین کرام. ئیتر خۆیان کۆ دەکەنەوە و دەچنە لای ساڵح یوسفی و بابەتەکەی بۆ دەگێڕنەوە، بەڵام لە راستیدا ئەو پێشتر ئاگاداری بابەتێکی وەها بوو، بۆیە پێکەنی بوو و پێیگوتبوون: عەبدولخالق هەر بۆ خۆشیی ئەوەی پێکردوون. (دیدار لەگەڵ بارزان مەلا خالید، هەولێر، ٢٦ی شوباتی ٢٠١٩).

دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلول (١٩٦١–١٩٧٥) لە کوردستاندا، بەرپرسانی کورد لێهاتوویی و کارامەیی عەبدولخالق مەعرووف دەقۆزنەوە و داوایان لێکرد تواناکانی لە بواری تەکنیک لە خزمەت شۆڕشدا بەکاربهێنێ، هەرچەندە ئەوکات بڕیارێک لەلایەن سەرکردایەتی کوردەوە هەبوو فەرمانبەرانی دەوڵەت بمێننەوە و کارەکانیان جێنەهێڵن، بەڵام لەبەرئەوەی عەبدولخالق کەسێکی جیاواز بوو ئەویان لەو بڕیارە هەڵاوێرد، ئەویش لەساڵی ١٩٦٣دا پێوەندیی پێیانەوە کرد. (دیدار لەگەڵ دکتۆر محەمەد شەریف ئەحمەد، هەولێر، ١٦ی شوباتی ٢٠١٩).

هەر لە ســـاڵی ١٩٦٣دا، ســـەرکردایەتی شـــۆڕش بڕیاریـــان دا عەبدولخالق بنێرنە ئەڵمانیا، تا شارەزایی زیاتر پەیدا بکات، لە ڕێگەی بەشداریکردن لە خولی ئەلیکترۆنی، ئەوەبوو پاسەپۆرتێکی ساختەیان بۆ ئامادەکرد بەناوی (مەلا حەسەن) و ڕەوانەی ئەو وڵاتە کرا، لەوێش لەلایەن دکتـۆر کەمـاڵ فوئـاد (١٩٣٢-٢٠١٤)و ســەعدی دزەیـی کە هەردووکیان کاروباری شۆڕشیان لەو وڵاتەدا بەڕێوە دەبرد پێشوازی کرا و ڕێوشـوێنی بـۆ دابـین کـرا و مـاوەی (٣-٤) مانـگ بەشـداری لە خولێکی ئەلیکترۆنیدا کرد. (دیدار لەگەڵ سەعدی حەمەدەمین دزەیی، هەولێر، ٢ی مایسی ٢٠١٩).

شایانی باسە، هەر لەساڵی ١٩٦٣دا سەرکردایەتی شۆڕش نوری ئەحـمەد تەهـا (١٩٢١-١٩٩١)ی ئەنـدامی کـۆمیتەی ناوەنـدی پـارتی دیموکراتی کوردستانی ناردۆتە ئەڵمانیا، بەمەبەستی کڕینی ئێزگەیەکی رادیۆ، سەعدی دزەییش لە ئەڵمانیاوە چۆتە لوبنان کە جەلال تاڵەبانی (١٩٣٣-٢٠١٧) لەوێ بووە، تاکو رای وەربگرێت لەسەر کڕینی، ئەویش پێیگوتووە حیزبی بەعس جێی متمانە نییە و هەرکاتێک شەڕ لەدژمان هەڵبگیرسێنی، ئەوا دەبێ ئێمەش بۆ پارێزگاریکردن لەخۆمان شەڕ بکەیـن، بـۆیە پێویسـتە لەئێسـتاوە ئێـزگەیەک دابـین بکەیـن، سـەعدی دزەییش گەڕاوەتەوە ئەڵمانیا و لەگەڵ دکتۆر کەمال فوئاد ئێزگەیەکی رادیۆیـان کڕیـوە و ڕەوانەی کوردسـتانیان کـردۆتەوە، پاشـان دوو ئەندازیاری بواری تەکنیکیشیان ناردۆتە کوردستان، بۆ دامەزراندنی ئێـزگەکە، کە هەردووکیـان ئەڵمـانی بـوون، بەڵام دوای تەواوبـوونی کارەکانیان گەڕاونەتەوە وڵاتی خۆیان. (دیدار لەگەڵ سەعدی حەمەدەمین دزەیی، هەولێر، ٢ی ئایاری ٢٠١٩).

لە ٢٠ی ئـابی ١٩٦٣دا ئێـزگەکە دوای دامەزراندنی لە ئەشکەوتی گـردەڕەش لە نـاوچەی مـاوەت، بەنـاوی (دەنگـی کوردسـتانی عێـراق) کەوتە کار و دەستی بە پەخش کرد، ئەوەش کاریگەری زۆری لەسەر دەروونی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان هەبووە و بەپەرۆشەوە گوێیان

بۆ هەواڵ و دەنگوباسەکانی هەڵخستووە، هەر بەو هۆیەشەوە دواتر حکومەتی عێراق بڕە پارەیەکی زۆری تەرخان کردووە بۆ کڕینی ئامێری پێشکەوتوو، بۆئەوەی ژاوەژاو بخاتە سەر ئێزگەکە، ژاوە ژاوەکەش ئاوازی گۆرانییەکی ئینگلیزی بوو بەناوی ( Kissme Honey Honey)، ئەوە سەرەڕای تۆپبارانکردنی شوێنی ئێزگەکە لەلایەن فڕۆکە جەنگییەکانی عێراقەوە، هەربۆیەش شوێنی ئێزگەکە بەردەوام لەگواستنەوەدا بووە، ماوەیەک لە گردەڕەش بوو، پاشان گواستراوەتەوە بۆ سەردێمان کە کەوتۆتە نێوان پردی زەرد و قەسرێ، لەوێشەوە گواستراوەتەوە بۆ گۆڕی گاجووتان کە کەوتۆتە بەرانبەر گەلاڵە، دواتریش گواستراوەتەوە بۆ بێخۆلان لە ناوچەی چۆمان هەروەها بۆ چەند شوێنێکی دیکەش گواستراوەتەوە، لەکاتی گفتوگۆکانی نێوان شۆڕشی کوردستان و حکومەتی عیراقیشدا، لەسەر راسپاردەی حکومەت پەخشی ئێزگەکە رادەگیرا. (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ئیسماعیل، ٢٠٠١، ل١٤١-١٤٦؛ سالح، ٢٠٠٧، ل٩٦-١٠٣؛ عوسمان، ٢٠١٣، ل٦٧-١٢٢).

هەر لەگەڵ دامەزراندنی ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق، عەبدولخالق مەعرووف ئەرکی سەرپەرشتیاری تەکنیکی ئێزگەکەی گرتۆتە ئەستۆ، لەگەڵ ئەندازیاری کارەبایی ئەمجەد عەبدولواحید کاروباری تەکنیکییان بەڕێوەبردووە. (دیدار لەگەڵ عومەر حەمەدەمین دزەیی، هەولێر، ٦ی نیسانی ٢٠١٩)، کە لە رووی تیۆرییەوە ئەمجەد عەبدولواحید زانیاریی زیاتری هەبوو، بەڵام لە رووی پراکتیکییەوە عەبدولخالق زانیاریی زۆر زیاتر بوو لەو ئەندازیارە و سوودی زۆری پێگەیاندووە. (دیدار لەگەڵ ئەمجەد عەبدولواحید، سوید- بەرێگەی تەلەفۆن، ٢٣ی ئایاری ٢٠١٩).

سەرەڕای ئەو ئێزگەیەی کە لە ئەڵمانیاوە رەوانە کرابوو، عەبدولخالق مەعرووف خۆی ئێزگەیەکی دیکەی لە چەند کەلوپەلێکی سەرەتایی و بوتڵی خواردنەوەی وێسکی دروستکرد، لەبەرئەوەی بوتڵی شووشە نەگەیەنەرە تەلی تێدەئاڵاند و لەجیاتی کۆیل بەکاری دەهێنا، پەخشی ئەو ئێزگەیەش چەند کیلۆمەترێک دەڕۆیشت. (دیدار لەگەڵ ئەمجەد

عەبدولواحید، سوید- بەرێگەی تەلەفۆن، ٢٣ی ئایاری ٢٠١٩). دوای ئەوەی کە ساڵی ١٩٦٤ دابەشبوون لە شۆڕشی کوردستان روویدا و بەشێکیان جیابوونەوە و چوونە هەمەدان، عەبدولخالقیش یەکێک بوو لەوان و ئێزگەکەشی لەگەڵ خۆی بردبوو. (دیدار لەگەڵ عەبدولرەقیب یوسف، سلێمانی- بەرێگەی تەلەفۆن، ٨ی شوباتی ٢٠١٩)، لەوێش سروود و گۆرانی پەخش دەکرد، بەڵام ئێران بەمەی زانی و دەستی بەسەر ئێزگەکەدا گرت کە سەریان لە شێوە و پێکهاتەکانی سووڕمابوو. (دیدار لەگەڵ حەمید رەشاش، هەولێر، ٣٠ی مارتی ٢٠١٩)، بەڵام وەکو پێشووتر باسمان کرد، عەبدولخالق دوای ماوەیەک گەڕایەوە ناو شۆڕش. شایانی باسە دوای ئەو جیابوونەوەیە، مەلا مستەفا بارزانی داوای کردبوو کە عەبدولخالق بگەڕێتەوە ناو شۆڕش. (دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولخالق مەعرووف، هەولێر، ١٧ی ئایاری ٢٠١٩)، ئەوەش بەڵگەی ئەوەیە کە عەبدولخالق بایەخێکی زۆری هەبووە و شۆڕشی کوردستان پێویستی زۆری پێ هەبووە.

پایزی ساڵی ١٩٦٥ شۆڕشی کوردستان دووەمین ئێزگەی دامەزراند، کە دیاری یەکێتیی سۆڤیەت بوو بۆ مەلا مستەفا بارزانی، ئەوەیان ئێزگەیەکی پارتیزانی بوو بۆ هەموو لایەک دەگوێزرایەوە و عەبدولخالق مەعرووف رۆڵێکی گرنگی لە دامەزراندنیدا گێڕا. (رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٢٠٤٠، ١٩٩٤/٩/١١).

عەبدولخالق هێندە دڵسۆز بوو بۆ کارەکەی تەنانەت لەو پێناوەدا ئامادەی گیانفیداکردنیش بووە، هەر بۆیەش لە گەرمەی تۆپبارانی فڕۆکەکانی حکومەتی عێراق، دلێرانە بەرەو ئەنتێنەکانی رادیۆ غاری دەدا و کەموکوڕییەکانی چارەسەر دەکرد. (رۆژنامەی میدیا، ژمارە ١٦٩، ٢٠٠٤/٩/١). سەرەڕای ئەوە زۆر وریاش بوو بۆ پاراستنی ئێزگەکە، بۆ نموونە جارێکیان مووشەکی فڕۆکە چەند مەترێک لە دووری شوێنی ئێزگە کەوتە خوارەوە، دوای ئەوە رووداوەکە وەکو خۆی ئامادەکرا بۆ خوێندنەوەی لەئێزگە، بەڵام عەبدولخالق بەوریایی خۆی نەیهێشت هەواڵەکە بخوێنرێتەوە، لەبەرئەوەی پێیوابوو کە ئەوە دەبێتە

ڕێنیشاندەر بۆ فرۆکەکان تا لە داهاتوودا بەئاسانی بتوانن ئامانجەکەیان بپێکن. (دیدار لەگەڵ محەمەد ئیسماعیل، هەولێر، ٢٨ی تەموزی ٢٠١٦).

عەبدولخالق روحی رادیۆی دەنگی کوردستانی عێراق بوو، لەسەر دەستی ئەو ئێزگەکە رۆژ لەدوای رۆژ بەرەو پێشتر دەچوو و دەنگی بەرەو مەودای دوورتر دەچوو، لە کەلوپەلە سادەکانی کوردستان سوودی وەردەگرت. (گۆڤاری هەڵبوون، ژمارە ١٩، ٢٠٠٩/١١/٢٥)، هەر بەلێهاتوویی خۆی لە ماوەیەکی کەمدا توانی چەندین ئامێری ئێزگە دروست بکات و پەرە بەئێزگە بدات و توانی شەپۆلی کورت کە زۆر دەڕۆیشت و کەم دەبیسترا، بگۆڕێ بۆ شەپۆلی ناوەندی کە کەم دەڕۆیشت و باش دەبیسترا. (رۆژنامەی میدیا، ژمارە ١٦٩، ٢٠٠٤/٩/١).

دوای راگەیاندنی بەیاننامەی ١١ی مارتی١٩٧٠ بارودۆخێکی نوێ هاتەکایەوە، بەپێی خاڵی یازدەی بەیاننامەکەش دەبوو ئێزگە بۆ حکومەتی عێراق بگێڕنەوە. (بڕوانە: الجمهورية العراقية، ١٩٧٩، ص٢٨٣)، هەربۆیەش چەند پارچەیەکی بچووکی ئێزگەکە رادەستی حکومەتی عێراق کرایەوە و تا ساڵی ١٩٧٤ ئێزگە وەستێنرا. (رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٣٤٩٨، ٢٠٠١/٩/٢٧)، بەڵام عەبدولخالق نەوەستا و بەردەوام بوو، دوای وەستانی دەنگی کوردستانی عێراق، خۆی ئێزگەیەکی دیکەی دروست کرد و پەخشەکەی سنووری باڵەکایەتی دەگرتەوە، هەرچەندە فەرمی نەبوو، بەڵام رۆژانە سەعات ٤ی ئێوارە بە گۆرانی (تۆز دەکا)ی هونەرمەندی میللی رۆژهەڵاتی کوردستان (ئیبراهیم فەتاحی) دەستی بە پەخش دەکرد و پاشان چەند گۆرانییەکی رەسەنی کوردی بڵاودەکردەوە، دواتریش هەر بەگۆرانی (تۆز دەکا) کۆتایی بە پەخشەکەی دەهێنا. (دیدار لەگەڵ فاروق جەمیل، هەولێر، ٣٠ی مارتی ٢٠١٩؛ دیدار لەگەڵ هاشم کەریم سلێمان، هەولێر، ١٠ی نیسانی ٢٠١٩). لەمەوە دەردەکەوێ کە دروستکردنی ئێزگە و کارکردن تیایدا، لای عەبدولخالق بووبووە خولیا و هیچ هەلومەرجێک و کەسێک نەیدەتوانی بیوەستێنێ.

لە ١ی مایسی ١٩٧١- ٣١ی مارتی ١٩٧٢ بەڕەزامەندیی مەلا مستەفا بارزانی، بەمەبەستی زیاتر پێشخستنی تواناکانی، عەبدولخالق مەعرووف رەوانەی چیکۆسلۆفاکیا کرا بۆ بەشداریکردنی خولێک لە کۆمپانیای (تێسلا)ی ئەلیکترۆنی، دوای نزیکەی ساڵێک خوێندن لەبواری تیۆری و پراکتیکیدا، سەرکەوتووانە بڕوانامەی دبلۆمی. (وێنەی بڕوانامەکە لە پاشکۆی ژمارە (١) دا ببینە) بەدەستهێناوە. (رۆژنامەی خەبات، ژمارە ٢٤٦٠، ٢٠١٧/٤/١٠). شایانی باسە هەر لەوێدا پێیانگوتبوو تۆ لە ئەندازیارەکان لێهاتووتری و پێویستیت بە خول نییە، بەڵام لە کارخانە کار بکە و شتی تازە فێربە. (هەژار، ١٩٩٧، ل٤٧٥؛ دیدار لەگەڵ دکتۆر محەمەد شەریف ئەحمەد، هەولێر، ١٦ی شوباتی ٢٠١٩).

ساڵی ١٩٧٤ سەرکردایەتی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان گەیشتە ئەو بڕوایەی کە سەبارەت بەیاسای ئۆتۆنۆمی ناگەنە رێکەوتن لەگەڵ حکومەتی عێراقدا، ئەوان نیازیان وایە جارێکی دیکە پەلاماری کوردستان بدەن، بۆیە بڕیاریان دا ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق ئامادە بکەنەوە. (رۆژنامەی برایەتی، ژمارە ٣٤٩٨، ٢٠٠١/٩/٢٧). دیسان عەبدولخالق مەعرووف وەک تەکنیکارێکی لێهاتوو رۆڵێکی کاریگەری گێڕا و هەرچەندە لە ساڵانی پێشووتر خۆی چەند ئێزگەیەکی دروستکردبوو، بەڵام لەو ساڵەدا ئێزگەیەکی زۆر بەهێزتر و پێشکەوتووتری دروستکرد کە پەخشەکەی تەواوی کوردستان و تەنانەت زۆربەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیشی دەگرتەوە. (دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولخالق مەعرووف، هەولێر، ١٧ی مایسی ٢٠١٩) هەروەها عەبدولخالق بەدوای ئەو کەسانەشی ناردووە کە پێشتر وەکو ئەندازیار کاریان لە ئێزگەدا کردووە، بۆئەوەی پێکەوە هەموو تواناکانیان بەگەڕبخەن. (دیدار لەگەڵ ئەمجەد عەبدولواحید، سوید، بەڕێگەی تەلەفۆن، ٢٣ی مایسی ٢٠١٩)، نیازیشی وابوو کەلە ١ی مایسی ١٩٧٥دا ئێزگەکە لە چیای هەورێ دابنێن بێئەوەی ئامێری ژاوەژاوی حکومەتی عێراق کاری لێبکات. (سالح، ٢٠٠٧، ل٢٥٦). بەڵام دوای نسکۆی شۆڕش لە ساڵی ١٩٧٥دا،

عەبدولخالق ئەو ئێزگەیە و ئێزگەکانی دیکەش کە هەر خۆی دروستی کردبـوون لە بنـاری چیـای قەنـدیلی شـاردۆتەوە، بەو ئومێـدەی لە هەلومەرجێکی نوێدا بەگەڕیان بخاتەوە، کەچی دواتر حیزبی دیموکراتی کوردستان- ئێران سوودیان لە ئێزگەکە بینی و بۆخۆیان بەکاریان هێنا. (دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولخالق مەعرووف، هەولێر، ١٧ی مایسی ٢٠١٩).

بەم شـێوەیە دەبینـین لە سـەرەتای دامەزرانـدنی ئێـزگەی دەنگـی کوردسـتانی عێـراق لە سـاڵی ١٩٦٣دا تـا نسـکۆی شۆڕشـی ئەیلـول لە سـاڵی ١٩٧٥دا عەبـدولخالق مەعـرووف رۆڵێکـی گەورە و کـاریگەری گێڕاوە لە دامەزراندن و پێشخستنی، هەر ئەوەش وای کردووە هەژاری شاعیر (١٩٢١–١٩٩١) بڵێت:"بۆ شۆڕش لە لەشکرێکی دە هەزارکەسی بە بەهرەتر بوو". (هەژار، ١٩٩٧، ل٤٧٦).

دوای سـەرهەڵدانەوەی شۆڕشـیش لە سـاڵی ١٩٧٦دا، یەکێتـی نیشتمانیی کوردستان هەر لەو ساڵەدا ئێزگەیەکی پەیدا کرد و لە ٢١ی مارتی ١٩٧٩ بەناوی (دەنگی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) دەستی بە پەخش کرد، لە ٢٧ی حوزەیرانی هەمان ساڵیشـەوە ئێزگەکە بەنـاوی (دەنگی شۆڕشـی عێـراق) پەخش دەکراو لە سـاڵی ١٩٨٥یشـدا نـاوی ئێزگەکە گۆڕا بۆ (دەنگی گەلی کوردستان). (بڕوانە: ئینسکلۆپیدیای یەکێتیی نیشـتمانیی کوردسـتان، ٢٠١٣، ل١١٩-١٢٠). ئەو ئێـزگەیەش پێویسـتی بە عەبدولخالق مەعرووف هەبوو، ئەویش چاونەترسانە دەستی گەیاندێ، ئەوەبوو سـەرەتای بەهـاری ١٩٨٣ جەلال تالەبـانی بەدوایـدا نـارد بـۆ چاککردنەوەی ئێزگەکەیان کە لەکارکەوتبوو، عەبدولخالقیش لەگەڵ کاکە مەم بۆتانی و نوری ئیسماعیل نانەکەلی کە دوو هاوڕێی نزیکی خۆی بـوون چوونـە بالیسـان کە بارەگـای ئێـزگەکەی لێبـوو، تـوانی ئێـزگەکە بەگەڕبخـاتەوە. (بۆتانی، ٢٠٠٨، ل٦٦-٦٧). چەند جارێکی دیکەش بۆ هەمـان مەبەست بەنهێنی سەردانی ناوچە رزگارکراوەکانی کوردستانی کردووە و رێنماییەکانی کاریگەریی گەورەیان هەبووە لەسـەر بەردەوامبوون و بەهێزبوونی ئێزگەکە. (رۆڤار، ژمارە ١٧، ٢٠٠٥، ل٦٦).

شایانی باسە عەبدولخالق مەعرووف وەک تەکنیکارێکی شارەزا و لێهاتوو، تەنیا لە بواری دروستکردنی ئێزگەی رادیۆدا بلیمەت نەبوو، بەڵکو لە بواری تەلەفزیۆنیشدا شارەزاییەکی باشی هەبوو، بۆ نموونە لەساڵانی هەشتاکاندا کە لە هەولێر دووکانی هەبوو، کەسێک تەلەفزیۆنێکی نوێی کڕیبوو، بەڵام ئیشی نەکردبوو و چەند وەستایەکیشی پێکردبوو نەیانتوانیبوو کەموکوڕییەکەی بدۆزنەوە، بەڵام بردبوویە لای عەبدولخالق ئەویش هەر کە تەماشای کردبوو زانیبووی تەلەفزیۆنەکە شتێکی کەمە و لە کۆمپانیاکە لەبیریان چووبوو بۆی دابنێن، بەڵام ئەو شتەکەی بۆ دانابوو و تەلەفزیۆنەکەی بەئیش خستبۆوە، پاشانیش نامەیەکی بۆ ئەو کۆمپانیایە ناردبوو کە تەلەفزیۆنەکەی دروستکردبوو تێیدا باسی لە کەموکوڕییەکە کردبوو، کۆمپانیاکەش دانیان بەهەڵەکەیاندا نابوو و سوپاسی عەبدولخالقیشیان کردبوو. (دیدار لەگەڵ عەبدولرەقیب یوسف، سلێمانی- بەڕێگەی تەلەفۆن، ٨ی شوباتی ٢٠١٩).

**پێنجەم: بەرهەمەکانی و مەرگی لەپێناو نووسین و هزردا:**

عەبدولخالق مەعرووف لە دووکانەکەیدا کە لەپێش قەڵای هەولێر بوو، ئێواران هاوبیرانی و ئەو رۆشنبیرانەی کە دەیانناسی دەچوونە لای، ئەوەی نەوترابوو لەوێدا دەوترا، ئەویش چەندی پێبکرایە بە زار خەڵکی هۆشیار دەکردەوە، سەرەڕای ئەوەش بەباشی زانی ئەوەی پەی پێدەبات و پێوەندی بە هۆشیارکردنەوەی نەتەوەکەیەوە هەیە بینووسێتەوە و وەک کتێب بڵاویان بکاتەوە، هەر لە دووکانەکەیدا هەر کاتێک لای چۆڵ بووایە دەستی بەنووسینەوە دەکرد و لەماوەیەکی کەمدا چەند کتێبێکی ئامادە و بڵاوکردەوە. (هەورامی، ٢٠١٨، ل٢٧٢).

لێرەدا بەرهەمە چاپکراوەکانی و کورتەیەک لە ناوەڕۆکەکانیان دەخەینەڕوو، کە ئەمانەن:

1- ئەنتێنا: ئەم کتێبە ساڵی ١٩٧٧ لە چاپخانەی کوردستان لە

شاری هەولێر چاپکراوە و لە (٨٨) لاپەڕە پێکهاتووە و لەلایەن ئەندازیار ئەمــجەد عەبدولواحیــدی هــاوڕێی کە لە ســەرەتاوە یەکێـک بــووە لە ئەندازیارانی ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق، پێداچوونەوەی زانستی بــۆ کــراوە و لەلاپەڕە (٣)ی کتێبەکەشــدا بەناوونیشــانی (وشــەیێک) سەرنجەکانی خۆی نووسیوە، کە تیایدا نووسیویەتی: زۆر سوودبەخش و بەکەڵکە و لەگەڵ تازەترین زانستی سەردەمدا دەگونجێ و بێگومانم کە دانەر هەوڵ و تەقەلایەکی زۆری داوە، تاکو بەرهەمێکی وەها پڕ لە زانیــاری هێنــاوەتە کــایەوە. لە هەمــان کاتیشــدا ئەمــجەد عەبدولواحیـد هیواخوازە کە زانایانی دیکەی کوردیش چاو لە عەبدولخالق مەعرووف بکەن و بەم شێوە جوانە بەزمانی کوردی کتێبی زانستی بڵاوبکەنەوە. (بڕوانــە: معــروف، ١٩٧٧، ل٣). بەم ســەرنجانەش دەردەکەوێــت کە ئەمــجەد عەبدولواحیـد وەکـو زانــایەک ســەیری عەبـدولخالقی کـردووە، کاتێـک ناویشی هێناوە وشەی مامۆستای بۆ بەکارهێناوە.

لەپێشەکیدا عەبدولخالق نووسیویەتی:"منیش وەکو هەریەکێک لەم سەر زەمینەدا حەزدەکەم هەر نووسینێکم دەستدایە بەزمانێک بی کە بتوانم باش تێی بگەم، بۆیە ئەم نامیلکەیەی لەمەڕ (ئەنتێنا)وە بەزمانی کــــوردی دەخەمە بەرچــــاوی خوێنــــدکار و خــــوێنەرانی بەڕێــــز...". (معروف،١٩٧٧، ل٥).

ئەنتێنا وەک پێناسەی کردووە: "بە تووڵێک یا لوولەییێکی گەیێنەر (conductor)ی رووت دەگوترێ، کە بەپێی پێوانەییێکی تایبەتی ئەندازەی درێژی و بەرزی لە زەوی دیاری کرابێ". (مەعرووف،١٩٧٧، ل٧). ئەم کتێبە وەکو نامیلکەیەکی بەردەست وایە بۆ دروستکردنی ئەنتێنای رادیۆ و تەلەفزیۆن و دەزگاکانی تر بەشێوەیەکی زانستی و تەکنیکی، لە رێگەی (٧١) نمــوونەی وێــنەی هێڵکــاری و چەنـد خشــتەیەکەوە زانیارییەکــان روونکراونەتەوە. لە کۆتاییشدا لە دوو لاپەڕەدا هەندێ زاراوەی زانستی بەزمــانی ئینگلیــزی و لە بەرانبەریشــدا بەزمــانی کــوردی نووســیوە، بۆئامـادەکردنی ئەم کتێبەش سوودی لە (٩) سـەرچاوە وەرگرتووە کە

چواریان بەزمانی ئەڵمانی و پێنجیشیان بەزمانی ئینگلیزین و لە لاپەڕەی (٨٧) دا ناوی سەرچاوەکانی نووسیوە.

2- **اجهزة الأرسال:** ئەمە دووەمین کتێبی چاپکراوی عەبدولخالق مەعرووفە و ساڵی ١٩٧٩ لە چاپخانەی شارەوانیی هەولێر چاپکراوە. ئەم کتێبە بەزمانی عەرەبی نووسراوە و لە (٢٧٢) لاپەڕە پێکهاتووە. کتێبەکە لە چۆنیەتی دروستکردنی ئامێرە ئەلیکترۆنییەکان بە دەمەوانە یان ترانزیستۆر بۆ پەخشی ئێزگە و گەیاندنە بێتەلەکان بەڕێگای زانستی و پراکتیکی، دەکۆڵێتەوە. ئەم کتێبە لە پێشەکی و دە بەش پێکهاتووە و چەندین وێنەی هێڵکاری لەخۆگرتووە. لاپەڕە (٢٦١-٢٦٩)ی کتێبەکەش تایبەتە بە فەرهەنگی کتێب کە هەموو زاراوەکانی بەزمانی عەرەبی و لە بەرانبەریشدا بەئینگلیزی نووسیوە کە لە ناوەڕۆکەکەیدا بەکاری هێناون. لەلاپەڕەی (٢٧٠)شدا ناوی ئەو سەرچاوانەی نووسیوە کە بۆ دانانی کتێبەکە سوودی لێوەرگرتوون کە لە (١١) سەرچاوە بەزمانی ئینگلیزی و (٤) سەرچاوەش بەزمانی عەرەبی پێکهاتوون. (معروف، ١٩٧٩). شایانی باسە ئەو کتێبە لەلای وەستا هەرە باشەکانی چاککردنی رادیۆ و تەلەفزیۆن لە شاری مووسڵ بینراوە کە لەکاتی کارکردنیدا پشتی پێبەستووە. (دیدار لەگەڵ دکتۆر عەبدولفەتاح عەلی یەحیا بۆتانی، هەولێر، ٢٥ی مارتی ٢٠١٩).

3- **تەکنیکار:** ساڵی ١٩٨٠ لە چاپخانەی بابل لە بەغدا چاپکراوە و لە (٣٨٠) لاپەڕە پێکهاتووە و لەلایەن ئەندازیار ئەمجەد عەبدولواحید پێداچوونەوەی بۆ کراوە. کتێبەکە باس لە دەزگای ئەلیکترۆنی، لەمپا، ترانزیستۆر، رادیۆ، ریکۆردەر، گەورەکەری دەنگی و دەزگای نێرەر دەکات. ئەم کتێبە لە پێشەکی و یازدە بەش پێکهاتووە، لە پێشەکیدا نووسەر زیاتر جەخت لەسەر هەوڵدان و تێکۆشانی مرۆڤ دەکات بۆ گەیشتن بە ئامانج و پێیوایە ئایین هیچ گۆڕانێک دروست ناکات و دەڵێت: "کاتی خۆیشی هەر بۆیە هاتمە سەر ئەو بیرەی کە لە کارەبا بکۆڵمەوە و خەریکی بم چونکە پێم وابوو هەزار دوعا و ریوایەت و

ئیبن سیرین و شتی تر بەردێک لە جێگای خۆی لەق ناکا، تەنها هەوڵ و تەقەلا و تێکۆشان ڕێچکەیە بۆ هێلانەی دڵخواز و بنکەی مراز" (ل٨). بۆ ئامادەکردنی ئەم کتێبەش نووسەر پشتی بە (٧) سەرچاوەی عەرەبی، (٩) سەرچاوەی ئینگلیزی، (٥) سەرچاوەی ئەڵمانی بەستووە (ل٣٦١–٣٦٢). لە کۆتاییشدا هەندێ زاراوەی کوردی و لە بەرانبەریشیاندا بە ئینگلیزی نووسیوە، کە لەم کتێبەیدا ئاماژەی بۆ کردوون.(ل٣٦٣– ٣٧٠).

4-**دیوانی نالی و کێ ڕاستە؟**: ساڵی ١٩٨٤ لە بەغدا چاپکراوە و لە (١٧٠) لاپەڕە پێکهاتووە. ئامادەکردنی ئەم کتێبە دوای ئەوە هات کە ساڵی ١٩٧٦ مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و فاتح عەبدولکەریم و محەمەدی مەلا کەریم، دوای لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی، دیوانەکەی (نالی)یان بەچاپ گەیاند، دکتۆر مارف خەزنەداریش ساڵی ١٩٧٧ کتێبێکی بەناوونیشانی (دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی) بڵاوکردەوە، دوا بەدوای ئەوەش شەڕە قسە لەنێوان دکتۆر مارف خەزنەدار و محەمەدی مەلا کەریم بووە تیروتانەی لەیەکتری وەشاندنی نێو گۆڤار و ڕۆژنامەکان. عەبدولخالق مەعرووفیش لەنێوانیاندا ڕاست دەبێتەوە و خۆی دەکات بەدەمڕاست و پشتی دکتۆر مارف دەگرێت، بەمەش درزی نێوانیانی زیاتر کرد. (هەورامی، ٢٠١٨، ل٢٧٤). کتێبەکەی عەبدولخالق لە پێشەکی و سێ بەش، نرخاندن، دواپێهێنان و سەرچاوەکان پێکهاتووە. بەشی یەکەمی بەناوونیشانی (قسە و ڕەخنەکانی کاکە حەمە)یە. (ل٧–٢٤)، کاکە حەمە مەبەست لێی محەمەدی مەلا کەریمە (توێژەر)، بەشی دووەمیش بەناونیشانی (ناتەواوی و کەموکورتیە سێ قۆڵییەکەی دیوانی نالی)یە، کە تێیدا باسی ئەو کەموکوڕییانە دەکات کە لە دیوانی نالی‌دا هەیە و لەلایەن مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و کوڕەکانییەوە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی بۆکراوە. (ل٢٥– ٤٩)، بەشی سێیەمی کتێبەکەش بەناونیشانی (لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی دەقەکان و وشە ئارایی و بەلاغە و موحەسیناتی لەفزی و وێکچوونی وشەکان بەڕێنووسی کۆن و ئەمڕۆ)، کە تێیدا لێکۆڵینەوە و بەراوردی نێوان

دەقەکانی نێو کتێبەکەی مەلا عەبدولکەریم و کوڕەکانی و کتێبەکەی دکتۆر مارف خەزنەدار دەکات، وەک خۆیشی باسی دەکات هەوڵی داوە لایەنگیریی بێ هۆ نەکات. (ل٥٣) و بەدوورو درێژی بەراوردەکەی نێوانیان دەکات و لایەنگیریی دووەمیان دەکات. (ل٥٢-١٦٠). پاشان بەناوونیشانی (نرخاندن) ئەو راستییانە دەخاتەڕوو کە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و لە دیوانە سێ قۆڵییەکەی مەلا عەبدولکەریم و کوڕەکانی، بۆی دەرکەوتووە. (ل١٦١-١٦٤). بۆ ئامادەکردنی کتێبەکەشی، عەبدولخالق مەعرووف پشتی بە (٧) سەرچاوە بەستووە. (ل١٦٦). شایانی باسە عەبدولخالق هەرچەندە دۆستێکی نزیکی دکتۆر مارف خەزنەدار بووە، بەڵام ئەم کتێبەی بەرگریکردن نەبووە لێی، بەڵکو گەڕان بووە بەشوێنی راستی، تەنانەت تا لەچاپدانیشی مارف خەزنەداری لەوکارەی ئاگادار نەکردۆتەوە و بۆ لەچاپدانیشی هەر بە مارف خەنەداردا بۆ جەمال خەزنەداری برای ناردووە لە بەغدا، کەچی ئەوکاتەش هیچی لەگەڵدا باس نەکردووە و دوای لەچاپدانی دانەیەکی بەدیاری بۆ ناردووە. (خەزنەدار، ٢٠١١، ل١٨٧- ١٨٨؛ خەزنەدار، ٢٠١٤، ل٢٠٩). ئەم کتێبەش لەلایەکەوە بوێری و لێهاتوویی عەبدولخالق مەعرووف نیشان دەدات کە شارەزایانە بەراورد لەنێوان دوو بەرهەمدا دەکات، کە هەردووکیان نووسەرەکانیان ناسراو و ناودار بوون بەتایبەتی لە بواری ئەدەبدا، هەڵە و کەموکوڕییەکان دەستنیشان دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە بەم بەرهەمەی دەرکەوت کە لە بواری ئەدەبی کلاسیکی کوردییشدا دەستێکی باڵای هەبووە، کە پێشتر هەروەکو بلیمەتێکی بواری تەکنیک دەناسرا.

5- **ئادەمزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا:** ساڵی ١٩٨٥ لە چاپخانەی دار الجاحظ لە بەغدا چاپکراوە. ئەم کتێبەی عەبدولخالق سەرەتا بەناوونیشانی (لەبارەی ئافرەتی ئیسلام) بوو، رەوانەی دەزگای چاودێری و چاپەمەنی کرد لە بەغدا، بەڵام دەزگاکە رەتیکردەوە کە چاپ بکرێت (بۆتانی، ٢٠٠٨، ل٨٣)، تەنانەت لەسەر هەموو لاپەڕەکانی

نووسیبوویان (لا یسمح) واتە ڕێی پێنادرێ (دیدار لەگەڵ عەبدولغەنی عەلی یەحیا بۆتانی، هەولێر، ١٧ی شوباتی ٢٠١٩)، بەڵام پاشان جەمال خەزنەدار یەکێک بوو لە هاوڕێیانی پێشنیازی بۆ کرد ناونیشانی کتێبەکەی بگۆڕێت، ئەوکاتە لە ڕێگەی دۆستانی لەنێو دەزگاکە دەتوانێ ڕەزامەندیی چاپکردنی بۆ وەربگرێت. ئەوەبوو عەبدولخالق مەعرووفیش ناوونیشانی کتێبەکەی گۆڕی بۆ (ئادەمزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا)، دوای ماوەیەک بەڕەزامەندی بۆی گەڕایەوە. (بۆتانی، ٢٠٠٨، ل٨٣)، لەسەر هەموو لاپەڕەکانیشی نووسیبوویان (یسمح) واتە ڕێی پێدەدرێ (دیدار لەگەڵ عەبدولغەنی عەلی یەحیا بۆتانی، هەولێر، ١٧ی شوباتی ٢٠١٩).

لە ڕاستیدا ئەم کتێبە وەڵامێک بوو بۆ سەباحی غالب کە لە کتێبی (ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا)، ڕەخنە لە دکتۆر مارف خەزنەدار دەگرێت، کاتێک لە چیرۆکی (لەسایەی شەریعەت دا) تاوانکاری و تێنەگەیشتنی مەلای گوندێک لەمارەکردنی منداڵێکی ساوای نێو لانک دەخاتە ئەستۆی شەریعەت. (خەزنەدار، ١٩٦٩، ل٢٨-٣٦). غالب پێیوایە: خەزنەدار پەلەی کردووە یان مەبەستی بووە ئەو پرسە بکاتە دەسکەلا بۆ لێدانی شەریعەت، لەکاتێکدا شەریعەت وەک ڕێگایەکی ڕاستەقینەی ژیان و وەک تەواوترین ڕێباز و کاملترین یاسا بانگی بەتاڵکردنەوەی مارەبڕینی تەڵاق و نیکاحی بێ پرس و دوو ژن هێنان و هەرچی پێوەندی لەدوورەوە یا لەنزیکەوە بەچەوساندنەوەی مرۆڤەوە هەیە پووچەڵ دەکاتەوە، جا ئەگەر لەهەر شوێن و کاتێکدا بەهۆی هەندێ کۆلکە مەلا و دوژمنی شەریعەتەوە کاری وا کرابێ، ئەوا ئەو کەسانە تاوانبار دەکرێن و بەر نەفرەتی ڕۆژگار دەکەون نەک ڕێباز و بیر و فەلسەفەکە. (غالب، ١٩٧٩، ل٩٨).

عەبدولخالق مەعرووف کە ئەو کتێبەی سەباحی غالبی خوێندەوە، بڕیاریدا بەکتێبێک وەڵامی بۆچوون و تێڕوانینی غالب سەبارەت بە ئافرەت و شەریعەتی ئیسلام بداتەوە. (دیدار لەگەڵ عەبدولغەنی عەلی یەحیا بۆتانی، هەولێر، ١٧ی شوباتی ٢٠١٩). عەبدولخالق لەم کتێبەیدا ناوی هیچ

نووسراوێک ناهێنێ، بەڵام لە نامەیەکیدا کە بۆ دکتۆر مارف خەزنەداری ناردووە، دەردەکەوێت کە ئەم کتێبە وەڵامە بۆ سەباحی غالب. (بڕوانە: پاشکۆی ژمارە (٢)، نامەی عەبدولخالق مەعرووف بۆ دکتۆر مارف خەزنەدار، هەولێر، ١٩٨٣/١١/١٤). لە پێشەکی کتێبەکەشدا عەبدولخالق نووسیویەتی: "بەپێویستم زانی هەندێک دەربارەی پەیوەندیی ژن و پیاو لەبەر تیشکی ئایینی ئیسلام بدوێم و شەخسیەتی هەر لایە بەپێی قورئان و گوتەکانی پێغەمبەر (د.خ) و کردار و رەفتارەکانی و قسەی موجتەهیدەکان و ئیجماع روون بکەمەوە. چونکە هەندێک لە نووسەر و چیرۆکنووسەکان، ئەو جیاوازییەی نێوان ژن و پیاو لە رووی کۆمەڵایەتی و ئایینییەوە، دەخەنە ئەستۆی مەلا بەدبەختەکانی کوردستان". (مەعرووف، ١٩٨٥، ل٣-٤).

عەبدولخالق مەعرووف دەقاودەق تێڕوانینەکەی غالب کە لە پێشوودا خستمانە روو، بەبێ ناوهێنانی لەنێو دوو کەوانەدا دەخاتە روو. (مەعرووف، ١٩٨٥، ل٢٦-٢٧)، پاشان دەڵێت: "ئەمە قسەی نووسەرە لێرەدا بڵێم نووسەر هەر فڕی بەسەر زانینی ئاینەوە نیە و ئاگای لەهیچ نیە و نەقورئانی خوێندووتەوە و نە تێگەیشتووە، ئەگەر خوێندبیتییەوە، نەئاگای لە رەفتار و کرداری پێغەمبەر"د.خ" هەیە و نە لە بیروڕای موجتەهیدەکانی مەزهەبی ئاگادارە، بەتایبەتی مەزهەبی شافیعی کە مەزهەبی زۆربەی کوردانە. نووسەر لای وایە بەرەوانی لە شەریعەتی ئیسلامی کردووە بەڵام نازانێ ئەوەی ئەو بە کۆلکە مەلای دادەنێ و دژ بەئایین تاوانبار و بێ ویژدانی دەژمێرێ ئیمامی شافیعی "خ. ل" دەگرێتەوە". (مەعرووف، ١٩٨٥، ل٢٧). دوای ئەوە قسەکانی غالب بەبێ ناوهێنانی، لەگەڵ ئایین و رەفتاری پێغەمبەر "د.خ"، وەک خۆی دەڵێت بەراورد دەکات. (مەعرووف، ١٩٨٥، ل٢٧). دواتریش لە تەوەرەکانی قورئانی پیرۆز و تەفسیری لەبارەی تەڵاق، حەدیسەکان دەربارەی تەڵاق، اباحة الطلاق، مارەکردن و چەند ژنی، فیقهی ئیمامی شافعی دەربارەی مارەکردن، پلەی کۆمەڵایەتی ژن، لێدانی ژن، جل و بەرگی ژن خۆی "شەرمە" عەورەتە، تێڕوانینی ژن، عەبدولخالق مەعرووف تێڕوانینی

ئـاییـنی ئیسـلام روون دەکـاتەوە. (مەعـرووف، ١٩٨٥، ل٥٩-١٢٩) دووپـاتیش دەکاتەوە کە سـەرچاوەکانی بـۆ لێکـۆڵینەوەکەی لە مـاف و مـافخوازی، بـریتین لە: یەکەم/ قورئـانی پیرۆز. دووەم/ گوفتـار و ئاکـار و رەفتـار و کردارەکانی پێغەمبەر "د.خ"، هەروەها کردەوەکانی جێگرەکانی پێغەمبەر "د.خ". سێیەم/ بیروڕای ئیمامی شافعی "خ. ل". (مەعرووف، ١٩٨٥، ل٥٧– ٥٨). لە کۆتاییشـدا بەناوونیشـانی پاشـەکی ئەنجامەکـانی لێکـۆڵینەوەکەی دەخاتەڕوو و دەڵێت: "بەوەی لەپێشەوە باسمان کرد لە قورئان و کردار و رەفتـار و گوفتـاری پێغەمـبەر و هاواڵەکـانی پێغەمـبەر و "ڕا"و قسـەی مەزهەبی ئیمامی شافیعی بۆمان روون بۆوە کە ژن یەکسان نییە لەگەڵ پیاو لە مافدا و پیاو سـەرداری ژنە و لە ژن گەورەترە و خـوا ژنـی بـۆ هەوەس و ئارەزووی پیاو دروست کردووە و تەڵاق و مارەیی بەدەست پیاوە و باوک دەتوانێ کچی سەر لانکە بەشوو بدا و مارەی بکا و کچی خۆنـاس و عـازەبیش بەبێ پـرس بەمێرد بدا و مـارەی بکـا". (مەعرووف، ١٩٨٥،ل٣٠).

بەر لەچـاپکردنی کتێـبەکەی، عەبـدولخالق مەعـرووف لەلایەن ژمـارەیەک لەدۆستە نزیکەکانی لەوانەش مامۆستا محەمەد ئیسـماعیل، دکتـۆر محەمەد شـەریف و عەبـدولغەنی عەلـی یەحیـا بۆتـانی ئاگـادار کرابۆوە کە چاپی نەکات، چونکە مەلاکان رەتی دەکەنەوە و کێشـەی بـۆ دروسـت دەکەن، بەڵام ئەو لە هـیچ نەدەترسـا و سـووربوو لەسـەر چاپکردنی. (دیدار لەگەڵ محەمەد ئیسماعیل، هەولێر، ٢٨ی تەموزی ٢٠١٦؛ دیدار لەگەڵ دکتۆر محەمەد شەریف، هەولێر، ١٦ی شوباتی ٢٠١٩؛ دیدار لەگەڵ عەبدولغەنی عەلی یەحیا بۆتـانی، هەولێـر، ١٧ی نیسـانی ٢٠١٩)، هەرچەنـدە لە نووسـینی کتێـبەکەدا بەتەواوی پشتی بە ئایەت و فەرموودەکانی پێغەمبەر "د.خ" بەستووە و هـیچ شـتێکی لەخـۆوە نەگوتـووە. (دیدار لەگەڵ محەمەد ئیسماعیل، هەولێر، ٢٨ی تەمـوزی ٢٠١٦)، هەروەکـو پێشـتریش باسـمان کـرد خۆیشـی ئامـاژەی بەوەداوە کە سـەرچاوەکانی بـریتین لە ئـایەت و فەرمـوودە و بیـروڕای ئیمـامی شـافعی، بەڵام لەگەڵ بڵاوبـوونەوەی کتێبەکەدا دائیـرەی ئەمنـی

حکــومەتی عێــراق بەهاوکــاری لەگەڵ کۆمەڵێــک مەلای توونــدڕەو هەرچییان بۆ زڕاندنی ناوی نووسەرەکەی پێدەکرێت، درێغی ناکەن و ســەرەتاش فەرمــانی لەنێــوبردنی کتێــبەکە و کــۆکردنەوەی لە بــازاڕدا دەردەکەن. (روانــگە و رەخــنە- پاشــکۆی چــاودێر، ژمــارە ٥٤١، ٢٠١٧/٥/٨)، هەر بەوەنــدەش نەوەســتان، بەڵکــو لەهەردوو شــاری هەولێــر و ســلێمانی چەنــدین مەلا کە ژمارەیەکیــان ناســراو بــوون لێیــان کــرد بەهەڵــلا و هەریەکەیــان چەنــد وتــارێکی هەینییــان بــۆ نــاو زڕانــدنی عەبــدولخالق مەعــرووف تەرخــان کــرد. (رۆژنــامەی میــدیا، ژمــارە ١٦٩، ٢٠٠٤/٩/١). یەکێــک لەوانەش مەلا ئەحمەد مستەفا ئاغای هەڵشـۆیی لە مزگەوتـی خانەقـای مەولانــا لە شــاری ســلێمانی وتــارێکی تونــدی خوێنــدەوە و چەنــدین دەســــتەواژەی وەک"بەکرێگیــــراو، سەرلێشــــێواو، نــــۆکەری جــــوولەکە، جاسووس، تووتەڵە سەگ، جاهیل، بێ ئەخلاق، داوێن پیس، ئاشووب، فەوزەوی و تاوانبــار"ی بەرانــبەر عەبــدولخالق بەکارهێنــا، هەروەهــا گوتبــووی: "هەرکەسـێک بەرانـبەر نیزامـی خـوا وەسـتا، دەبـێ لـووتی بشـکێنرێ، ســەری بخـرێتە ژێـر قـاچ و قۆنـدەرەوە و پـان بکـرێتەوە و تەمبێ بکرێ". (کاسێتی تۆمارکراو بەدەنگی مەلا ئەحمەد مستەفا ئاغا هەڵشۆیی، وتاری هەینی، ١٩٨٥). جگە لەو وتارە، هەر ئەو مەلایە سێ وتاری دیکەی رۆژانی هەینی بۆ عەبدولخالق و کتێبەکەی تەرخان کردبوو، سەرەڕای چەندین وتــاری مەلای دیــکەش. (بەڵگەفــیلم، تەلەفزیــۆنی رووداو، ٢٠١٥). لە شــاری هەولێـریش، مەلا مـحەمەد لە مزگەوتـی گەورەی ئـازادی و (١١) مەلای دیکەش لە مزگەوتە جیاوازەکانی ئەم شـارەدا، وتـاری رۆژی هەینییـان تایبەت کردبوو بەقسەکردن لەدژی عەبدولخالق مەعرووف و کتێبەکەی. تەنـانەت ئەو مەلایەی مزگەوتـی گەورەی ئـازادی ئێسـتاش پێیـوایە کە عەبــدولخالق مەعــرووف شــتی هەڵە و نــاڕێکی زۆری نووســیوە لەو کتێبەیدا. (بەڵگە فیلم، تەلەفزیۆنی رووداو، ٢٠١٥)، بەڵام ژمارەیەک لە هاوڕێیانی عەبـدولخالق پێیانوایـە کە ئەو مەلایـانە لەوانەیە هەنـدێکیان کتێبەکەیـان هەر نەخوێنــدبێتەوە، ئەگەر خوێندبیشــیانەوە تێینەگەیشــتوون، چــونکە

عەبدولخالق لەخۆیەوە هیچی نەگوتووە و قسەکانی هەمووی لە ئایینەوە سەرچاوەی گرتووە. (دیدار لەگەڵ محەمەد ئیسماعیل، هەولێر، ٢٨ی تەموزی ٢٠١٦)، ژمارەیەکی دیکەش پێیانوایە کە هەندێ لەو مەلایانە ئەو کتێبەیان هەر نەدیبوو، کەچی وتاریان دژی دەخوێندەوە. (بۆتانی، ٢٠٠٨، ل٨٧). هەر لە کوردستان مەلاکان دژی ئەم کتێبە نەوەستانەوە، بەڵکو لە بەغداش مەلایەکی کورد راپۆرتێکی لەسەر عەبدولخالق بۆ دائیرەی ئەمنی حکومەتی عێراق نووسیبوو، داوای کوشتنی کردبوو بەو پێیەی سووکایەتی بە ئایینی ئیسلام کردووە. (بەڵگەفیلم، تەلەفزیۆنی رووداو، ٢٠١٥).

لە بەرانبەر ئەو تۆمەتانەشدا، عەبدولخالق مەعرووف بێ دەنگ و جووڵە نەبوو، بەڵکو سەردانی مەلا محەمەدی مزگەوتی ئازادی هەولێری کردبوو، پێیگوتبوو: ئێوە قسەی خراپتان لەسەر من کردووە. مەلاکەش گوتبووی: من جنێوم پێنەداوی مەلایەکەی سلێمانی جنێوی پێداوی، لە هەولێریش خۆ هەر من قسەم لەسەرت نەکردووە، بەڵکو (١١) مەلای دیکەش قسەیان لەسەرت کردووە. عەبدولخالقیش گوتبووی: هەموویان کۆبکەوە رۆژێک دادەنیشین گفتوگۆ دەکەین. بۆ ئەو مەبەستەش هەردووکیان ژمارەی تەلەفۆنیان ئاڵوگۆڕ کردبوو، بەڵام بەهۆی تیرۆرکردنی عەبدولخالق ئەو هەلە نەڕەخسا. (بەڵگەفیلم، تەلەفزیۆنی رووداو، ٢٠١٥). بۆ مەلا ئەحمەدی هەڵشۆییش وەڵامێکی دوورودرێژی ئامادەکردبوو کە بەنیاز بوو چاپی بکا، بەڵام بەهۆی تیرۆرکردنی بەوەش رانەگەیشت و چاپ نەکرا. (دیدار لەگەڵ مەحفوز عەبدولقادر مەعرووف، هەولێر، ٢٧ی نیسانی ٢٠١٩). لەو وەڵامەیدا کە هەمووی پشتبەست بوو بە ئایەت، دەڵێت: "زۆر روون و ئاشکرایە کە لەم رووەوە ئایینی ئیسلام چ حوکم و دەستوورێکی داناوە. منیش بەتەنها ئەو حوکمانەم بەکوردی نووسیوەتەوە و رای خۆمی تێدا نییە ئیدی ئەم هێرشە لەلایەن هەندێ بەناو مەلا و نەخوێندەوارەوە کە لە کتێبەکەم نەگەیشتوون". هەروەها لە وەڵامەکەیدا باسی ئەو حوکمانەشی کردووە کە بەبێ بەڵگە و شاهێد تۆمەت بۆ کەسێک دروست دەکرێت. لە

کۆتاییشدا دەڵێت "ئەم هەموو گوناحە دەدەیە پاڵ من دەبێ خۆت لەگەڵ مندا بووبی دەنا لەکوێ دەزانی من ئاوام". (رۆڤار، ژمارە ١٧، ٢٠٠٥، ل٧٣-٧٦).

رەخنە و هەڕەشەکان بەرانبەر عەبدولخالق تەنها لە مینبەری مزگەوتەکانەوە، بەڵکو زۆرجار چەند کەسێکی توندڕەو دەچوونە بەردەم دووکانەکەی و مۆڕەیان لێدەکرد و چاویان لێ سوور دەکردەوە. (دیدار لەگەڵ عومەر حەمەدەمین دزەیی، هەولێر، ٦ی نیسانی ٢٠١٩). هەر بەوەندەش نەوەستان، بەڵکو رۆژێکیان ژمارەیەک لەو توندڕەوانە دووکانەکەشیان بەردباران کرد. (دیدار لەگەڵ کاکە مەم بۆتانی، هەولێر، ١٧ی شوباتی ٢٠١٩).

دائیرەی ئەمنی حکومەتی عێراقیش هەر لە سەرەتای دەرچوونی کتێبەکەوە بەدواداچوونی عەبدولخالق مەعرووفیان کردووە، ژمارەیەک مەلاشیان راسپارد تا لە وتاری رۆژی هەینیدا هێرشی بکەنەسەر. (دیدار لەگەڵ محەمەد ئیسماعیل، هەولێر، ٢٨ی تەموزی ٢٠١٦). هەروەها دائیرەی ئەمن بەدوای عەبدولخالقیان ناردبوو و پێیانگوتبوو: ئێمە ئاگاداری جموجۆڵەکانتین. پاشانیش بەرێیان کردبوو. (دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولخالق مەعرووف، هەولێر، ١٧ی مایسی ٢٠١٩). لە کۆتاییدا کاتژمێر ٢:٣٠ی پاش نیوەڕۆی ١٠ی نیسانی ١٩٨٥ عەبدولخالق کە لە شەقامی سەرەکی گەڕەکی ئازادی چاوەڕوانی پاسی دەکرد تا بەرەو دووکان بگەڕێتەوە، ئۆتۆمبیلێکی جۆری تۆیۆتا کە دوای بەدواداچوونێکی نهێنی لەلایەن خزمەکانییەوە دەرکەوت بەناوی دائیرەی ئەمنی هەولێر لە بەڕێوەبەرایەتی هاتوچۆ تۆمارکرابوو، سێ چەکداری تێدابوو، رێی لێ دەگرن و داوای لێدەکەن کە سواری ئۆتۆمبیلەکەیان بێت، ئەویش رەتی کردبۆوە، بۆیە تەقەیان لێکرد و کوشتیان. (دیدار لەگەڵ هاشم کەریم سلێمان، هەولێر، ١٠ی نیسانی ٢٠١٩). رووداوەکە هێندە ترسناک بوو کە هەندێ مەلا لەترسان نەیانوێرا تەلقینی بدەن و لە سێ رۆژەی پرسەیدا قورئان بخوێنن، بەهەزار حاڵ نوری ئیسماعیل نانەکەلی هاوڕێی توانی چەند کەسێک بۆ ئەو مەبەستە پەیدا بکات، بەڵام رووناکبیرانی کوردستان بەگەرمی بەشداری پرسەکەیان کرد و چوونە

سەر گۆڕەکەی. یەکێتیی نووسەرانی کوردستانیش کە لە خەباتی نهێنیدا بوون، لە شاخەکانی کوردستان پرسەیان بۆ دانابوو. (بۆتانی، ٢٠٠٨، ل٨٨).

هەروەها بەو بۆنەیەشەوە یەکێتیی نووسەرانی کوردستان بەیاننامەیەکیشی دەرکرد کە تێیدا هاتبوو: " ئەی قەڵەم بەدەستە دلێرەکانی کوردستان هاورێیەکی نووسەرتان...ئەندامێکی کارامە و دڵسۆزی یەکێتیی نووسەرانی کوردستان- کاک عبدالخالق معروف- کە بەوپەڕی جوامێری، قەڵەمە رەسەنەکەی خۆی، تفەنگی پێشمەرگانە ئاسا، لە رووی کۆنەپەرستان و دوژمنانی گەلدا هەڵکێشابوو پێ بەپێی –حەلاج- ی حەق ویست، بەخوێن دەستنوێژی عەشقیان پێ هەڵگرت" هەروەها لە بەشێکی دیکەدا هاتبوو: "دەزگا ئەمنییە داپڵۆسێنەرەکانی رژێمی رەگەزپەرستی عێراق، بە فیتی چەند کۆنەپەرستێکی ناحەزی دەست و دەم و دڵ پیسی دوژمن بەکورد، لە شاری هەولێردا لە سەعات دوو و نیوی پاش نیوەڕۆی چوارشەممەی رێکەوتی ١٩٨٥/٤/١٠، بەوپەڕی نامەردی لە کاک عبدالخالق معروف هاتنە دەست و شەهیدیان کرد، چونکە پێیان ئەستەم بوو کوردێکی بیر رۆشن و چاونەترس و دڵسۆزی وەک شەهید عبدالخالق ببینن". سەبارەت بە کتێبەکەشی لە بەیاننامەکەدا هاتبوو: "دوا کتێبی شەهید عبدالخالق- ئادەمزاد لە کۆمەڵی کوردەواری‌دا- هەوڵدانێکی گەرم بوو بۆ ریسواکردن و ئاشکراکردنی زۆر لەو راستییانە کە کۆنەپەرستان لە کۆمەڵانی خەڵکی کوردیان دەشاردەوە". (شەهید رێبەری گەلە، ١٩٨٥، ل٨-١١).

هەروەها بەم بۆنەیەوە مەکتەبی سیاسی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش لە ١٥ی نیسانی ١٩٨٥دا بەیاننامەیەکی دەرکرد، لە سەرەتای بەیاننامەکەدا هاتبوو: "دوای نیوەڕۆی ١٩٨٥/٤/١٠، سێ نۆکەری حکومەتی داگیرکەری عەفلەقی، بە ئەمری راستەوخۆی دایەرەی ئەمنی هەولێر، رێگەیان بە مامۆستا عبدالخالق معروف گرت. داوایان لێ کرد لەگەڵیان سواری ئۆتۆمبیلەکەیان بێت کە ئەویش مل نادا، دەیدەنە بەر گولله و لەسەر جادەی گشتی گەڕەکی ئازادی،

شـەهیدی دەکەن. پێشـتریش دایەرەی ئەمنـی هەولێـر داوای لە ئەوقـاف کردبـوو کە ئەمـر بـدەن بەهەنـدێ کۆلکە مەلای چلکاوخۆر بۆئەوەی لە نوێژی جومعەدا هێرشی بکەنە سەر". لە بەشێکی دیکەی بەیاننامەکەشدا هـاتبوو: "ژیـانی مامۆسـتا عبـدالخالق معـروف ژیـانێکی شۆڕشـگێڕانە و تێکۆشەرانە بوو. هەمیشە دڵسۆزی کورد و کوردستان بـوو. ڕۆڵەیەکی پێشـــکەوتنخواز و ئـــازادیخواز و بەئەمەکـــی کـــۆمەڵانی خەڵـــک بـــوو. دۆســـتێکی زۆر نزیـــک و یاریـــدەدەرێکی هۆشـــیاری شۆڕشـــەکەمان و ی.ن.ک بـوو. لە کۆڕی ئەدیبـان و لە گەشـەپێدانی جـووڵانەوەی ئەدەبی شۆڕشـگێڕانەدا شـوێنێکی دیـاری هەبـوو. کوشـتنی ئەو ڕۆڵە دڵسـۆز و شۆڕشگێڕەی کوردستان زیانێکی گەورەیە بۆ جـووڵانەوەی ڕزگـاری و جووڵانەوەی ئەدەبی کوردستان". (شەهید ڕێبەری گەلە، ١٩٨٥، ل٥-٧).

جەلال تاڵەبانی سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانیش هەر بەو بـۆنەیەوە لە بابەتێکدا بەناوونیشـانی (بیـرەوەریەک دەربـارەی کـاک عبـدالخالق ی مامۆسـتاو لێـزان) نووسـیبووی: "پیـاوێکی پـاک و دڵسـۆزو بەپەرۆش بـوو، ڕۆڵەیەکی هۆشـیار بـوو، هەربـۆیەش خـاوەن ڕەئی و خاوەن هەڵوێست و بیروباوەڕیش بوو. مامۆستا عبدالخالق پتر لە ٣٠ ساڵ کوردایەتی و خەبـاتی کـردووە". (شەهید ڕێبەری گەلە، ١٩٨٥، ل١-٤). شـــایانی باســـە دوو ڕۆژ بەر لە تیرۆرکردنـــی، عەبـــدولخالق کە بەسەردانێکی نهێنی چووبووە لای جەلال تاڵەبانی، تاڵەبـانی پێیگوتبوو: پـێم باشـە بەیەکجـاری بمێنییەوە و جـارێکی دیکە نەگەڕێیەوە شـاری هەولێـــر، لەبەرئەوەی مەترســـی و هەڕەشـــەی زۆرت لەســـەرە، بەڵام عەبـدولخالق سـوور بـوو لەسـەر گەڕانەوەی و گوتبـووی: دەگەڕێمەوە پێداویسـتییەکانی خـۆم ئامـادە دەکەم، پاشـان بەیەکجـاری هەولێـر جـێ دەهێڵم، بەڵام فریانەکەوت و کوشتیان. (دیدار لەگەڵ مەلا بەختیار، هەولێر، ٢٤ی مایسی ٢٠١٦؛ دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولخالق مەعرووف، هەولێر، ١٧ی مایسی ٢٠١٩).

مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیمـوکراتی کوردسـتانیش داوای لە ئێـــزگەی دەنگـــی کوردســـتانی عێـــراق کردبـــوو کە بە بـــۆنەی

تیرۆرکردنییەوە، سێ ڕۆژ پرسەی بۆ دابنێن. (دیدار لەگەڵ بارزان مەلا خالید، هەولێر، ٢٦ی شوباتی ٢٠١٩).

شایانی باسە دوای ڕاپەڕینی مارتی ١٩٩١، دۆسییەی عەبدولخالق مەعرووف کە لە دائیرەی ئەمنی حکومەتی عێراق لە هەولێر بۆی کرابۆوە، کەوتە دەست هاوڕێیانی، بەڵام لەکاتی کۆڕەوەکەی ئەو ساڵەدا لەناوچوو. لە دۆسییەکەدا بەدواداچوونی وردیان بۆ کتێبی (ئادەمزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا) لەدوای بڵاوبوونەوەی و ڕاپۆرتێک دەربارەی کوژرانی، هەروەها وتاری مەلایەکیش کە دوای خوێندنەوەی لە ڕۆژی هەینی دابوویە دائیرەی ئەمن، تێدابوو. (دیدار لەگەڵ محەمەد ئیسماعیل، هەولێر، ٢٨ی تەموزی ٢٠١٦).

6-**دەستنووسەکان:** جگە لەم کتێبە چاپکراوانەی کە لە سەرەوەدا خستمانە ڕوو، عەبدولخالق مەعرووف دوو کتێبی دەستنووسیشی هەیە کە تائێستا چاپ نەکراون ئەوانیش یەکەمیان: دەربارەی ترانزیستۆر. دووەمیان: چەند حوکمێک لە مەزهەبی شافعیدا. (دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولخالق مەعرووف، هەولێر، ١٧ی مایسی ٢٠١٩)، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەگەر تیرۆر نەکرایە، هێشتا زۆری لە هەگبەدا مابوو بیخاتە بەرچاوی خوێنەران.

**ئەنجام**

لەکۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشتین:

1- عەبدولخالق مەعرووف لەنێو بنەماڵەیەکی ئایینیدا لەدایک بوو، زوو لە خوێندنی فەرمیی دابڕێنراوە و خراوەتە بەر خوێندن لە حوجرەدا، پاشان ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت و لە سوپای عێراقدا بووە ئیمام تابوور لە بەغدا، هەر لەوێشدا تێکەڵ بەژیانی سیاسی بووە، هاوکاتیش خۆی بەجیهانی تەکنیک سەرقاڵ کرد و تەواو تێیدا قووڵ بۆوە ئەنجامیش ئێزگەیەکی سەرەتایی رادیۆی دروستکرد، ئەوەش سەرەتای دوورکەوتنەوەی بوو لە ژیانی ئایینی، دوای ماوەیەکیش بەیەکجاری لە ئایین دوورکەوتەوە و بووە کەسێکی عەلمانی، زۆربەی کاتی خۆی لە گەڕان بەدوای زانست و فێربوونی زیاتری تەکنیک تەرخانکرد تا لەئەنجامدا بووە تەکنیکارێکی بلیمەت و ئەو بەهرەیەشی لە خزمەت کورد و جووڵانەوە رزگاریخوازەکەی خستەگەڕ، ئەوەبوو ساڵی ١٩٦٣ رۆڵێکی کاریگەر و سەرەکی گێڕا لە دامەزراندنی ئێزگەی دەنگی کوردستانی عێراق، بەردەوامیش کاری تێدا دەکرد و سەرکەوتوو بوو لە بەرفراوانکردنی مەودای پەخشی، خۆنەویستانە و بێ ماندووبوون تا نسکۆی شۆڕشی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٥دا کاری تێداکرد، لە ساڵانی هەشتاکانیشدا هاوکارێکی گرنگی ئێزگەی دەنگی گەلی کوردستان بوو و بۆ چاککردنەوەی ئێزگەکە چەند جارێک رێگای پڕ لە مەترسی بڕیوە.

2- عەبدولخالق مەعرووف نیشتمانپەروەرێکی راستەقینە و خاوەن باوەڕێکی پتەوی کوردایەتی بوو، زۆر دڵسۆز و جێی متمانە بوو، هەربۆیەش پێوەندییە سیاسییەکانی هەمیشە لە لووتکەدا بوو، لەماوەی شۆڕشی ئەیلولدا جێی متمانەی مستەفا بارزانی بووە و هەمیشە دەرگای بۆی کراوە بووە. لە شۆڕشی نوێیشدا بەشداربووە لە دامەزراندنی لقی ئەوروپای یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان، پاشانیش کە گەڕاوەتەوە هەولێر هەر بەدۆستێکی نزیکی جەلال تاڵەبانی و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان مایەوە، لە رۆژهەڵاتی کوردستانیشدا دۆستێکی

نزيكی دكتۆر عەبدولرەحمان قاسملووی سكرتێری حيزبی ديموكراتی كوردستان- ئێران بوو.

3- عەبدولخالق مەعرووف كەسێكی گەشبين و بەئومێد بووە لە ژياندا، بۆيە زۆربەی كات بەدەنگێكی بەرز پێدەكەنی و شێوە و دەنگی پێكەنينەكەی زۆر تايبەت بووە. كەسێكی جوانپەرست و هەژار دۆست بووە، هەميشە خاوەن هەڵوێست بووە و هەرگيز سەری دانەنواندووە، چاوتێر و سەربڵند بووە و بيری لە دەوڵەمەنديی ماددیی نەكردۆتەوە، هەميشە لەدوای پێشكەوتن و مەعريفەدا بووە، رووناكبيرێكی بێ هاوتا بوو لە كەس نەدەچوو، واتە خاوەن كەسايەتييەكی جياواز بوو.

4- بەوردبوونەوە لە چالاكی و بەرهەمەكانی دەردەكەوێت كە عەبدولخالق مەعرووف لە يەک كاتدا شارەزايەكی گەورەی بواری ئايين بوو كە بەپێی رێبازی مەلايەتی و شەريعەت هەموو مەلايەكی دەبەزاند، هەروەها تەكنيكارێكی بليمەت، شارەزايەكی بواری ئەدەبی كلاسيكی كوردی، داكۆكيكارێكی مافەكانی ژنان، رووناكبيرێكی مەزنيش بوو.

5- عەبدولخالق مەعرووف هێندە خۆشەويست بوو لای رووناكبيران بەجۆرێک دووكانەكەی لە هەولێر ببووە شوێنی كۆبوونەوەی رووناكبيران، لەگەڵ رووناكبيرانی هەموو شارەكانی كوردستان دۆستايەتی هەبوو، تەنانەت لەگەڵ رووناكبيران و شاعيرانی رۆژهەڵاتی كوردستانيش.

6- عەبدولخالق مەعرووف بەهۆی گوتنی راستييەكانەوە، بەفەرمانی دائيرەی ئەمنی حكومەتی عێراق لە مينبەری مزگەوتەكانەوە هێرشی كرايە سەری و تۆمەتی ناڕەوای درايە پاڵ، لە كۆتاييشدا هەر لەلايەن دائيرەی ئەمنی هەولێرەوە تيرۆركرا.

**پەراوێزەکان**

١- خوێندنی حوجرە لە چەند قۆناغێک پێکهاتبوو کە ئەوانیش: یەکەم/ قۆناغی قوتابی یان کوتابی. دووەم/ قۆناغی سوختەیی. سێیەم/ قۆناغی موستەعید. چوارەم/ قۆناغی دوا ماددەکان (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: بەرزنجی، ٢٠٠٧، ل ١٠-١٥).

٢- نوری نانەکەلی پارێزەر و ڕووناکبیر و کەسایەتییەکی شاری هەولێر و بەرپرسی کۆمیتەی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و سەرۆکی دادگای باڵای کوردستان بوو، لە ساڵی ١٩٩٤ لە شاری هەولێر تیرۆرکرا. ئەو کەسایەتییە دۆستێکی نزیکی عەبدولخالق مەعرووف بوو.

٣- ئەوانەی لە داوەتنامەکەی سووورداش ئامادە بوون، پێکهاتبوون لە: عەبدولخالق مەعرووف، کاکە مەم بۆتانی، نوری نانەکەلی، حەمە کەریم هەورامی، نەوزاد محەمەد عەلی موختار، موحسین ئاوارە، شێرکۆ بێکەس، محەمەد ساڵح دیلان، محەمەد نوری تۆفیق، مستەفا ساڵح کەریم، رەئووف بێگەرد، حسێن عارف، تایەر ساڵح سەعید، جیهاد دڵپاک، عەلی کەریم، محەمەد رەشید فەتاح، ئەکرەم قەرەداخی، عەبدوللا سەراج، سەلاحی موهتەدی، حەمەی حەمە باقی، محەمەد موکری، جەوهەر کرمانج، سامی شۆڕش، سەعدوڵا پەرۆش و جەمال ئاغا. هەروەها ژمارەیەک لە ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لەوێدا ئامادەبوون لەوانەش: فوئاد مەعسوم، کەمال فوئاد، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی...هتد (ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٤٥٤٢، ٢٠٠٨/٤/١٠).


**لیستی سەرچاوەکان:**

**یەکەم: بەڵگەنامەکان:**

**أ- بڵاونەکراوەکان:**

١. بڕوانامەی دبلۆمی عەبدولخالق مەعرووف کە لە کۆمپانیای (تێسلا)ی ئەلیکترۆنی لە چیکوسلۆفاکیا بەدەستیهێناوە.

٢. نامەی عەبدولخالق مەعرووف بۆ دکتۆر مارف خەزنەدار، هەولێر، ٢٠١٩/١١/١٤.

**ب- بڵاوکراوەکان:**

١. چلەی شەهید عبدالخالق معروف، شەهید ڕێبەری گەلە، بنکەی چاپەمەنی ئاسۆس، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، چاپخانەی شەهید جەعفەر، ١٩٨٥.

**دووەم: دیدارەکان:**

١. دیدار لەگەڵ ئەمجەد عەبدولواحید، سوید- بەڕێگەی تەلەفۆن،٢٣ی مایسی ٢٠١٩.
٢. دیدار لەگەڵ بارزان مەلا خالید، هەولێر، ٢٦ی شوباتی ٢٠١٩.
٣. دیدار لەگەڵ پشکۆ عەبدولخالق مەعرووف، هەولێر، ١٧ی مایسی ٢٠١٩.
٤. دیدار لەگەڵ حەمید رەشاش، هەولێر، ٣٠ی مارتی ٢٠١٩.
٥. دیدار لەگەڵ حەمەی حەمە باقی، هەولێر، ٢٨ی مارتی ٢٠١٩.
٦. دیدار لەگەڵ دکتۆر محەمەد شەریف ئەحمەد، هەولێر، ١٦ی شوباتی ٢٠١٩.
٧. دیدار لەگەڵ دکتۆر عەبدولفەتاح عەلی یەحیا بۆتانی، هەولێر، ٢٥ی مارتی ٢٠١٩.
٨. دیدار لەگەڵ سەعدی حەمەدەمین دزەیی، هەولێر، ٢ی مایسی ٢٠١٩.
٩. دیدار لەگەڵ عومەر حەمەدەمین دزەیی، هەولێر، ٦ی نیسانی ٢٠١٩.
١٠. دیدار لەگەڵ عەبدولرەقیب یوسف، سلێمانی- بەڕێگەی تەلەفۆن، ٨ی شوباتی ٢٠١٩.
١١. دیدار لەگەڵ عەبدولغەنی عەلی یەحیا بۆتانی، هەولێر، ١٧ی نیسانی ٢٠١٩.
١٢. دیدار لەگەڵ فاروق جەمیل، هەولێر، ٣٠ی مارتی ٢٠١٩.
١٣. دیدار لەگەڵ قەرەنی ئەسوەد، هەولێر، ٢١ی ئابی ٢٠١٧.
١٤. دیدار لەگەڵ کاکە مەم بۆتانی، هەولێر، ١٧ی شوباتی ٢٠١٩.
١٥. دیدار لەگەڵ محەمەد رەشید عەبدولرەحمان/ حەمەرەشید هەرەس، سلێمانی- بەڕێگەی تەلەفۆن، ٢٨ی مارتی ٢٠١٩.
١٦. دیدار لەگەڵ محەمەد ئیسماعیل، هەولێر، ٢٨ی تەموزی ٢٠١٦.
١٧. دیدار لەگەڵ مەحفوز عەبدولقادر مەعرووف، هەولێر، ٢٧ی نیسانی ٢٠١٩.
١٨. دیدار لەگەڵ مەلا بەختیار، هەولێر، ٢٤ی مایسی ٢٠١٦.
١٩. دیدار لەگەڵ مەلا محەمەد بەحرکەیی، هەولێر، ٣٠ی مارتی ٢٠١٩.
٢٠. دیدار لەگەڵ هاشم کەریم سلیمان، هەولێر، ١٠ی نیسانی ٢٠١٩.

**سێیەم : نامەی زانکۆیی:**

١. سمایل، سروە قادر، ئەزموونی کاری بەرەیی لە کوردستان- عێراق ١٩٨٠-١٩٩٠ توێژینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە، نامەی ماستەر (بڵاونەکراوە)، کۆلێژی زانستە کۆمەڵایەتییەکان- زانکۆی کۆیە، ٢٠١٠.

**چوارەم: کتێب:**

أ- بەزمانی کوردی:


١. ئیسماعیل، ئەرسەلان بایز، راگەیاندنی شۆڕش و بزووتنەوەی کوردی، ئۆفسێتی روون، (سلێمانی، ٢٠٠١).

٢. ئەحمەد، نەوزاد عەلی، پشکۆیەک لە خۆڵەمێشدا بەشێکی گرنگ لە ژیاننامەی هۆمەر شێخ مووس، چاپی یەکەم، (سوید، ٢٠١٠).

٣. بۆتانی، کاکە مەم، بەهارێزان بیرەوەری و بەسەرهات ساڵانی ١٩٧٥-١٩٩١، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و رووناکبیریی گەلاوێژ، (سلێمانی، ٢٠٠٨).

٤. بێکەس، شێرکۆ، نووسین بە ئاوی خۆڵەمێش ژیاننامە و بیرەوەری، بەرگی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی غەزەلنووس بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە، چاپخانەی کارۆ، (سلێمانی، ٢٠١٣).

٥. بەرزنجی، عمر شێخ لطیف، رەوشی حوجرە لە پێگەیاندنی زانا ئایینییەکانی شاری هەولێر، چاپخانەی منارە، (هەولێر، ٢٠٠٧).

٦. خەزنەدار، دکتۆر مارف، ئەڵەمان کوردی و چەند چیرۆکێکی تری کوردی، چاپخانەی ئەسعەد، (بەغدا، ١٩٦٩).

٧. خەزنەدار، دوکتۆر مارف، رۆژگاری من، مەڵبەندێکی دیکەی ژیانم و گەڕانەوە بۆ نیشتمان ١٩٨٣-١٩٩١، بەرگی حەفتەم (دوا بەرگ)، چاپخانەی رۆژهەڵات، (هەولێر، ٢٠١٤).

٨. خەزنەدار، دوکتۆر مارف، رۆژگاری من، هەڕەشەی سیاسی گەشەی رۆشنبیری ١٩٧٥-١٩٨٣، بەرگی شەشەم، چاپخانەی رۆژهەڵات، (هەولێر، ٢٠١١).

٩. زەڵمی، موستەفا ئیبراهیم، کاروانی ژیانم، چاپی دووەم، نووسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن، (هەولێر، ٢٠١٦).

١٠. ساڵح، ئازاد عوبێد، کاریگەریی شۆڕشی ئەیلوول لەسەر پێشخستنی رۆژنامەوانیی کوردی، چاپخانەی رۆشنبیری، (هەولێر، ٢٠٠٧).

١١. عوسمان، سالار، دەنگی کوردستان نیو سەدە بەخشش، چاپخانەی رۆشنبیری، (هەولێر، ٢٠١٣).

١٢. غالب، صەباحی، ئافرەت لە چیرۆکی کوردیدا ١٩٢٥-١٩٧٠، دار الحریة للطباعة، (بەغدا، ١٩٧٩).

١٣. کوێستانی، هەڤاڵ، ئەو رۆژانەی نیشتمان هی هەمووان بوو، چاپخانەی کارۆ، (سلێمانی، ٢٠١٧).

١٤. معروف، عبدالخالق، تەکنیکار، چاپخانەی بابل، (بەغدا،١٩٨٠).
١٥. معروف، عبدالخالق، ئەنتێنا، چاپخانەی کوردستان، ( هەولێر، ١٩٧٧).
١٦. مەعرووف، عەبدولخالیق، ئادەمزاد لە کۆمەڵی کوردەواریدا، چاپخانەی دار الجاحظ، (بەغدا، ١٩٨٥).
١٧. معروف، عبدالخالق، دیوانی نالی و کێ راستە؟، بێ ناوی چاپخانە، (بەغدا، ١٩٨٤).
١٨. هەژار، چێشتی مجێور، چاپی یەکەم، (پاریس، ١٩٩٧).
١٩. هەورامی، حەمە کەریم، چیرۆکی من و گوندەکەم، بەرگی سێیەم، چاپخانەی رۆشنبیری، (هەولێر، ٢٠١٨).

**ب- بەزمانی عەرەبی:**

١. احمد، الدكتور محمد شريف، رحلة الايام والقدر المقدور، الطبعة الاولى، مطبعة آراس،(اربيل، ٢٠١١).
٢. البارزاني، مسعود، البارزاني والحركة التحررية الكردية (ثورة ايلول ١٩٦١–١٩٧٥) مع ملحق وثائقي، الجزء الثالث، مطبعة وزارة التربية، (اربيل، ٢٠٠٢).
٣. البوتاني، الدكتور عبدالفتاح علي يحيى، وثائق عن الحركة القومية الكوردية التحررية، مطبعة وزارة التربية، (اربيل، ٢٠٠١).
٤. الخرسان، صلاح، التيارات السياسية في كوردستان العراق قراءة في ملفات الحركات والاحزاب الكوردية في العراق ١٩٤٦- ٢٠٠١، مؤسسة البلاغ، (بيروت، ٢٠٠١).
٥. معروف، عبدالخالق، اجهزة الارسال، مطبعة بلدية اربيل، (اربيل،١٩٧٩).

**پێنجەم: ئینسکلۆپیدیا:**

١. ئینسکلۆپیدیای یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، فەرید ئەسەسەرد، سەرپەشتیاری گشتی و سەرۆکی دەستەی کارا، کەیوان سەعید سکرتێری نووسین، چاپی یەکەم، دەزگای چاپ و پەخشی حەمدی، (سلێمانی، ٢٠١٣).

**شەشەم: چاپکراوە حکومییەکان:**

١. الجمهورية العراقية، القرارات العامة لمجلس قيادة الثورة ١٩٦٨- ١٩٧٧، المجلد الاول، مطبعة العاني، (بغداد، ١٩٧٩).

**حەوتەم: گۆڤارەکان:**

١. رۆڤار (بڵاوکراوەیەکی رۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێک دەزگای

چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوو مانگ جارێک دەری دەکات)، ژمارە (١٧)، ٢٠٠٥.

٢. گەیاندن، ژمارە (١)، کانونی دووەم ٢٠٠٧، هۆشەنگ کەریم، سەرەقەڵەمێک و وەفایەک بۆ تەکنیکاری شەهید "عەبدولخالق مەعرووف".

٣-هەڵبوون، ژمارە (١٩)، ٢٠٠٩/١١/٢٥، دیداری محمد گۆران لەگەڵ بارزان مەلا خالید.

**هەشتەم: رۆژنامە:**

١-ئیسماعیل بەرزنجی، کە عەبدولخالق تیرۆر کرا، باس، ژمارە (٢٣٢)، ٢٠١٥/٤/٧.

٢-بەڕێز سامی عەبدولڕەحمان، پێویستیمان بە ورەیەکە بەرز بەرز وەک گیانی بارزانی نەمر، برایەتی، ژمارە (٢٠٤٠) ١٩٩٤/٩/١١.

٣-حەمە سەعید حەسەن، کتێبێکی بەخوێن نووسراو، روانگە و رەخنە پاشکۆیەکە (چاودێر) لەسەر ئیسلامی سیاسی. ئایینناسی. هزر، ژمارە (٥٤١)، ٢٠١٧/٥/٨.

٤-دەوری شەهید عەبدولخالق مەعرووف لە بواری هزردا، جەمال گردەسۆری، بەشی یەکەم، خەبات، ژمارە (٢٤٦٠)، ٢٠٠٧/٤/١٠.

٥-دەوری شەهید عەبدولخالق مەعرووف لە بواری هزردا، جەمال گردەسۆری، بەشی دووەم، خەبات، ژمارە (٢٤٦١)، ٢٠٠٧/٤/١١.

٦-دەوری شەهید عەبدولخالق مەعرووف لە بواری هزردا، جەمال گردەسۆری، بەشی سێیەم و کۆتایی، خەبات، ژمارە (٢٤٦٢)، ٢٠٠٧/٤/١٢.

٧-ریپۆرتاژی: محەمەد گۆران، کێ (عەبدولخالق مەعرووف)ی کوشت مەلایەکانی کورد یان دەزگاکانی رژێمی بەعس؟!، میدیا، ژمارە (١٦٩) ساڵی نۆیەم، ٢٠٠٤/٩/١.

٨-کاکە مەم بۆتانی، لە یادی ساڵرۆژی شەهیدکردنی عبدالخالق معروف-ی بلیمەتدا، کوردستانی نوێ، ژمارە (١٢٦١)، ١٩٩٦/٤/١٢.

٩-کامەران سوبحان، عەبدولخالق مەعرووف، دەستنووسەکانی ون دەبن!، باس، ژمارە (٢٤٤)، ٢٠١٥/٦/٣٠.

١٠- کەریم شارەزا، وتەیەک لە یادی نووسەری خەباتگێڕ و رەخنەگر و تەکنیکاری لێهاتووی کورد شەهید عەبدولخالق مەعرووف، خەبات، ژمارە (٢٤٦٠)، ٢٠٠٧/٤/١٠.

١١- لە ٣٨مین ساڵوەگەڕیدا دەنگی کوردستانی عێراق دەنگی راستەقینەی شۆڕشی کوردە، برایەتی، ژمارە (٣٤٩٨)، ٢٠٠١/٩/٢٧.

١٢- موحسین ئاوارە، شەهید عەبدولخالق مەعرووف قەڵەمێکی بوێری گڕنووس، باس، ژمارە (٢٤٤)، ٢٠١٥/٦/٣٠.

١٣- موحسین ئاوارە، شەهید عەبدولخالق مەعرووف، ئەو هەڵوێستانەی پیر نابن، کوردستانی نوێ، ژمارە (٤٥٤٢)، ٢٠٠٨/٤/١٠.

**نۆیەم: کاسێتی تۆمارکراو:**

١. کاسێتی تۆمارکراو بەدەنگی مەلا ئەحمەد مستەفا ئاغا هەڵشۆیی، وتاری هەینی، ١٩٨٥.

**دەیەم: بەرنامەی تەلەفزیۆنی:**

١. بەڵگە فیلم، تەلەفزیۆنی رووداو، دەرهێنانی هەردی قادر، بەڕێوەبەری بەرهەم: کوردۆ محەمەد، ٢٠١٥




پاشکۆی ژمارە ١

CZECHOSLOVAK SOCIALIST REPUBLIC

**Polytechna**
Foreign Trade Corporation
Technical Cooperation Agency
PRAHA

# DIPLOMA

Name: Abdul Khalik Maieruf M. A m i n

Date and place of birth: 1935, Iraq

The above mentioned has undergone his training in ČSSR
from 1st May 1971 to 9th April 1972
in TESLA Works, Praha - Kloubětín
Television transmitter, Zbraslav u Prahy
Broadcast transmitter, Poděbrady

This Diploma certifies his special training in the branch of
production and running of broadcast transmitters

PRAHA, 31st March 1972

POLYTECHNA

CERTIFICATE

of Expert Training in Production Works

The expert training of Mr. Abdul Khalik Maieruf M. Amin in the TESLA Works, Poděbradská str. 186, Prague 9 is being evaluated for the period from 3 May 1971 till 17 March 1972.

The training was divided as follows:

- Getting acquainted with the basic organization of the Works and practical training in workshops ... 3 months
- Practical training in transmitter assembly - mechanical part ... 2 months
- Practical training in transmitter assembly - electrical part ... 2 months
- Alignment, electrifying and checking ......... 2 months
- Study of construction, projects and antenna systems ... 1 month

Results of evaluation

1. The industry, diligence and exemplary attitude of Mr. Amin to the fulfilling of given tasks were highly appreciated
2. The theoretical as well as practical training was somewhat impeded by the trainee's lack of knowledge of technical terminology
3. The profound interest, shown for the electronic branch, exemplary behaviour and attendance at the training and the great endeavour to gain as wide as possible theoretical knowledge permitted fulfilling of the education plan within its full scope
4. The trainee has mastered, in compliance with the education plan and the required extent of study, the questions of production of broadcast transmitters.

Prague, 30 March 1972

TESLA HLOUBĚTÍN PRAHA 9

Head of the Technical Education Dpt.:

**پاشكۆی ژمارە ٢**

عنوانی [illegible]
شارع سوران ـ [illegible]
١٤/١١/٩٧٤

بەڕێز و گەورەم مامۆستا دوكتۆر مارف

سڵاو و ئیحترامی بێبنی پێشكەش دەكەم

ئومێد دەكەم هەر لە خۆشیدا بژین و سەركەوتوو بن بە درێژایی ژیانتان

ئێمە باشین و لە [illegible] سەرتان دەوێ، هەمیشە برادەرانی نادی

ئازادی یادتان دەكەن و ئەحواڵتان دەپرسن و زۆر سڵاویان هەیە

نامەكەتانم دەست گەیشت زۆر سوپاستان دەكەم و هیوادارم

نادە نادە گەر دەست بدا نامەمان بۆ بنووسی

دەربارەی كتێبەكەم ئەوەی لای كاك جەمال. تەلەفونم بۆ كرد گوتی من وەڵامم

بۆ نووسیوە لەم بارەیەوە» و دەربارەی ئەوەی سەرنووسینەكەی كاك

عەباسی غایب موافەقەت نەكرا و بۆیان گێڕانەوە.

ئێستا خەریكی كارێكم دەربارەی «ترانزیستۆر» ، گەر بۆم لوا

چاپی دەكەم و ئەگەر هەر لەوێ چاپبوو بۆتان دەنێرم

ئەوی برادەران بە گەرمی ئیحترامیان هەیە و یادتان دەكەن

ئیتر خۆشیتان و هەر خۆش بن

برای بچووكتان
[illegible]

## عبدالخالق معروف ( ١٩٣٥ – ١٩٨٥ )
## حياته و دوره السياسي والثقافي

ولد عبدالخالق معروف من اسرة وطنية دينية، حصل على الاجازة العلمية من المدارس الدينية، عين امام طابور في الجيش العراقي، دخل السياسة وعالم التقنيات ويعد من مؤسسي اذاعات الثورة الكوردية خلال المدة ١٩٦٣-١٩٨٥، فضلا عن ابداعه في هذا المجال، كان كاتبا مقتدرا ومدافعا عن حقوق المرأة، ادت مواقفه الجريئة واتصالاته بالثورة الكوردية الى اغتياله في ١٠ نيسان ١٩٨٥ من قبل مديرية أمن اربيل، التي مهدت لاغتياله بتحريض عدد من رجال الدين في مهاجمته على المنابر واتهامه بالكفر بسبب كتابه "الانسان في المجتمع الكوردي" الذي صدر في شباط ١٩٨٥. واثار اغتياله استياء واحتجاج الكتاب والادباء والقيادات السياسية الكوردية.

ترك عبدالخالق معروف العديد من المخطوطات والمؤلفات الخاصة باجهزة الارسال وبالادب الكوردي، طبع معظمها خلال المدة ١٩٧٧-١٩٨٥، كان انسانا عصاميا عرف بمواقفه القومية والوطنية وبنكران الذات، وقد شهد له بذلك معاصروه من الادباء والكتاب.

**Abstract**

**Abdul Khaliq Maruf(1935-1985)**

**His life and political and cultural role**

Abdul Khaliq Maruf was born from a religious national family. He obtained a world license from religious schools. He was appointed as a columnist in the Iraqi army. He entered politics and the world of technology. He was one of the founders of the Kurdish Revolution Radio during the period 1963-1985. On the rights of women, his daring attitudes and contacts with the Kurdish revolution led to his assassination on April 10, 1985 by the Directorate of Security of Erbil, who was interested in his assassination. The Directorate of Security of Erbil of incited a number of clerics to attack him on the platforms. Abdul Khaliq was accused of disbelief because of his book "Man in Kurdish Society which was issued in February 1985. His assassination provoked resentment and protest by Kurdish writers, writers and political leaders.

Abdul Khaliq Maruf left many of the manuscripts and writings of the transmitters and Kurdish literature, most of which were printed during the period 1977-1985.He was a nominal man known for his national and patriotic attitudes and selflessness, witnessed by his contemporaries of writers and writers".

# کاریگەریی تەکنەلۆژیا
# لە گەشەکردنی دیزاینی رۆژنامەدا
## رۆژنامەی خەبات بەنموونە

د. دلێر ئەحمەد حەمە
بەشی تەکنیکی میدیا- کۆلیژی تەکنیکی
کارگێڕی هەولێر- زانکۆی پۆلیتەکنیکی
هەولێر

**پێشەکی**

دیزاینی رۆژنامە وەک هەنگاوێکی تەواوکەری نووسینی رۆژنامەوانی قۆناغێکی زۆری بڕیوە تا بە ئەمڕۆ گەیشتووە، لە قۆناغی سەرەتادا تەنها شێوەیەکی زۆر سادە بووە، بەڵام لەگەڵ زۆربوونی ژمارەی رۆژنامە و گەشەکردنی تەکنەلۆژیا و هاتنە ئارای کۆمپیوتەر، دیزاینی رۆژنامە بەتەواوەتی سیماکانی چەسپان. لە سایەی کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی دیزاینەوە بەشێوەیەکی زانستییانە رەگەزەکانی تایپۆگرافیا رێکخران و سیمایەکی جوانیان بە لاپەڕەکانی رۆژنامە بەخشی.

رۆژنامەی خەبات یەکێکە لەو رۆژنامە سیاسییە رۆژانەی کە بە دوو قۆناغی جیاوازی دیزایندا ڕەت بووە، قۆناغی دیزاین بەدەستی و قۆناغی سوود وەرگرتنی لە کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی دیزاین کە رۆڵێکی گەورەیان گێڕا لە ئاسانکردنی کاری دیزاینەرانی رۆژنامەکە، چونکە پێشتر بە دەست نەخشەسازیی لاپەڕەکان دەکێشران، شوێنی وێنەکان بە دەست چوارچێوەیان بۆ دیاری دەکرا، بەڵام کۆمپیوتەر و بەرنامەکان ئەم کارەیان تەواو ئاسان کرد و بواری جووڵە و داهێنانی بۆ دیزاینەری رۆژنامەکە رۆژ بە رۆژ ئاوەڵا کرد تا گەیشتە قۆناغی ئەمڕۆی.

## بەشی یەکەم
## چوارچێوەی میتۆدی توێژینەوەکە

**یەکەم/ بابەتی توێژینەوەکە:** لەم توێژینەوەیەدا هەوڵی ساغکردنەوەی ئەوە دەدەین کە چۆن تەکنەلۆژیای کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی کاریگەرییان هەبووە لە گەشەکردنی دیزاینی رۆژنامەی خەباتدا.

**دووەم/ گرنگی و بایەخی توێژینەوەکە:** گرنگیی ئەم توێژینەوەیە لەوەدایە کە تیشک دەخاتە سەر ئەو کاریگەرییەی کە تەکنەلۆژیا بەتایبەتی کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی دیزاین لە دیزاینی رۆژنامەدا گێراویانە.

**سێیەم/ ئامانجی توێژینەوەکە:** لە ئەنجامدانی ئەم توێژینەوەیەدا مەبەستمانە بەو راستییە بگەین تا چەند تەکنەلۆژیا کاریگەری لەسەر گەشەکردنی دیزاین هەبووە ؟ لە هەمان کاتیشدا تا چەند رۆژنامەی خەبات بۆ کاری دیزاین سوودی لێ وەرگرتووە.

**چوارەم/ پرسیاری توێژینەوەکە:** لەم توێژینەوەیەدا هەوڵی ئەوەمان داوە وەڵامی ئەم پرسیارانەمان دەست کەوێت: سەرەتاکانی کاری دیزاین چۆن بووە؟ کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی دیزاین چ رۆڵێکیان هەبووە لە گەشەکردنی دیزایندا؟ لە سەرەتادا چۆن دیزاینی رۆژنامەی خەبات کراوە؟ چۆن لە کۆمپیوتەر و بەرنامەکان سوودمەند بوون بۆ گەشەکردنی دیزاینی رۆژنامەکە؟

**پێنجەم/ رێبازی توێژینەوەکە:** لەم توێژینەوەیەدا هەردوو رێبازی وەسفی و شیکاری بەکارهاتووە.

**شەشەم/ کۆمەڵگەی توێژینەوەکە:** کۆمەڵگەی توێژینەوەکەمان بریتییە لە رۆژنامەی خەبات .

**حەوتەم/ نموونەی توێژینەوەکە:** نموونەی توێژینەوەکەمان بریتییە لە ژمارەکانی رۆژنامەی خەبات لەساڵی (١٩٩٣) تا (٢٠١٧) کە

بەشێوەیەکی هەڕەمەکیی نارێکخراو لە هەر ساڵێک ژمارەیەک وەرگیراوە کە سەرجەمیان (٢٤) ژمارەیە.

**هەشتەم/ پەیکەری توێژینەوەکە:** ئەم توێژینەوەیە لە سێ بەش پێکدێت بەشی یەکەم تەرخانە بۆ چوارچێوەی میتۆدی توێژینەوەکە، بەشی دووەمیش تەرخانە بۆ باسکردنی تەکنەلۆژیا و دیزاین و دوا بەشیش کە بەشی سێیەمە تەرخانە بۆ باسکردنی تەکنەلۆژیا و هەنگاوەکانی گەشەی دیزاینی رۆژنامەی خەبات.

## بەشی دووەم

### یەکەم: سەرەتاکانی دیزاینی رۆژنامە:

هەمیشە کە باسی دیزاینی رۆژنامە دەکەین یەکسەر بیرمان بۆلای دیوی دەرەوەی لاپەڕەکانی رۆژنامە دەچێت، ئەمەش راستە چونکە دیزاین بایەخ بە دیوی دەرەوە یاخود بە روخساری رۆژنامە دەدات. کاری دیزاین دابەشکردنی یەکەکانی تایپۆگرافیایە بەسەر لاپەڕەکانی رۆژنامەدا، هەندێک وای پێناسە دەکەن کە دیزاینی رۆژنامە زانست و هونەرە، چونکە دیزاین ( هەڵبژاردن و دابەشکردنی شوێن و قەبارە و شێوە و رەنگ و رەگەزەکانی تایپۆگرافیایە لەسەر پانتایی لاپەڕەی رۆژنامە یان گۆڤار و دەرخستنیانە بەشێوەیەکی پلان بۆ دانراو کە سەرنجی خوێنەر ڕاکێشێت ، یاخود دەتوانین بڵێین خستنە ڕووی بابەتە نووسراوەکانە بەڕەچاوکردنی بنەمای رۆژنامەوانی و هونەری و دەروونی و فسیۆلۆژی کە ئاسانیی خوێندنەوە و ڕوونیی ناوەرۆک بۆ خوێنەر دەستەبەر دەکات) . [خوخه . ٢٠٨ .١٦]

ئەوەی کە ئەمڕۆ لە دیزاینی لاپەڕەی رۆژنامەکاندا دەبینرێت وەکو دیزاینی ئەو رۆژنامانە نییە کە لە قۆناغەکانی پێشووتردا پەیڕەو کراون. ((بۆ نموونە لە سەدەی ١٤ دا باس لە جۆرە رۆژنامەیەک دەکرێت کە بە دەست نووسراوە لە هەریەک لە ئیتالیا و ئینگلترا و ئەڵمانیا. ئەم رۆژنامانە زیاتر لەلایەن کەسانێکەوە ئامادە دەکرا کە بە

(بازرگانی هەواڵ) دەناسران و زیاتر خەڵکانی دەست رۆیشتووی ئەو سەردەمە و بازرگان و رۆشنبیران لێی سوودمەند دەبوون)). [حجاب . ٢٠٠٨ . ٦٤]

سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە رۆژنامە لە قۆناغی سەرەتای تەمەنیدا وەکو رۆژنامەکانی ئەمڕۆ نەبووە، بەڵکو (زیاتر شێوەیان لە نامیلکەیەک یاخود هەواڵ نامەیەک دەچوو کە لەسەر کاغەزێک کە ڕووبەرەکەی هەروەک پەرتووکێکی ئاساییانەی بچووک بوو، چاپدەکرا) [بەدیعی . ٢٠١٠. ٤٠٨]

واتە ئەوەی کە پێی دەڵێین دابەشکردنی یەکەکانی تایپۆگرافیا و بابەتەکان و ستوونەکان بەم شێوەیەی ئەمڕۆ بوونی نەبووە، ئەوەی کە هەبووە لە لاپەڕەکاندا بڵاوکراوەتەوە کە زۆرترینی هەواڵ و دەنگوباسەکانی وڵات بووە و زۆرترین خوێنەریشی سیاسی و بازرگان و خوێندەوارەکانی ئەو سەردەمانە بوون.

داهێنانی ئامێری چاپ لە سەدەی (١٥)دا لەلایەن (گۆتێنبێرگ)ەوە شۆڕشێکی گەورەبوو لە بواری پیشەسازی و چاپکردندا، چونکە ئەو بۆ یەکەم جار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا (پیتی چاپ)ی داهێنا . ئەو توانی پیت لە کانزا دروست بکات و بۆ دروستکردنی وشە و ڕستەکان بەکاری بهێنێت. هەربۆیە هەندێک لایان وایە ئەوەی گۆتێنبێرگ کردی (یەکەم شۆڕشی راستەقینە بوو لە بواری پەیوەندیی جەماوەری و هەر لە رێی داهێنانەکەی ئەمەوە رۆژنامە بەواتاکەی خۆی سەری هەڵدا). [حجاب . ٢٠٠٨ . ٦٤]

بەهاتنە ئارای نیوەی دووەمی سەدەی (١٩) ژمارەی خوێنەران زیادی کرد، بەمەش رۆژنامەکان متمانەیان کردە سەر ریکلام و زیادکردنی ژمارەی لاپەڕەکان ، هەمەجۆریی بابەتی لاپەڕەکان و دابەشکردنی بەسەر لاپەڕەکاندا و زیادبوونی ژمارەی ستوونەکان و بوونی لاپەڕەی یەکەم بە روخسار و دەروازەی سەرجەم لاپەڕەکانی ناوەوە ئەرکێکی تر پەیدابوو کە نەخشەسازیی لاپەڕەی یەکەمە کە

دواتر خۆی لە سێ قوتابخانەدا بینییەوە کە ئەوانیش قوتابخانەکانی "کلاسیک و میانڕەو و نوێ بوون" هەریەک لەمانیش چەند ڕێبازێکیان هەیە .

گۆڕانێکی گەورە لە بواری دیزاینی رۆژنامەدا بۆ ساڵی (١٨٩٠) دەگەڕێتەوە ، ئەمەش (بەهۆی دەرکردنی رۆژنامەی (ۆرد جۆرنال) بوو، گۆڕانەکەش بریتی بوو لە دەرکەوتنی مانشێتی گەورە بەپانتایی چەند ستوونێک و بڵاوکردنەوەی وێنە بە هەموو جۆرەکانیەوە، زیادەڕەوی لە بڵاوکردنەوەی هەواڵی وروورژێنەر کە دواتر ئەم رۆژنامانە ناویان لێنرا رۆژنامەی زەرد). [ئەحمەد . ٢٠١٣. ١٢]

ئەو گۆڕانکاریانەی کە سەدەی بووژانەوە لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لە ئەوروپا هێنایە ئارا رۆژنامەشی گرتەوە و دۆخێکی گونجاوی بۆ گەشەکردنی رەخساند، (لەو سەردەمە بەدواوە ژمارەی خوێنەران زیادیان کرد و چینی بۆرژوا دروست بوو، وردە وردە چاپخانە پەیدابوو کە بەهەڵم کاری دەکرد، پەیدابوونی کاغەز و مەرەکەب بەشێوەیەکی فراوان و لە دوای ساڵی ١٩٠٠ەوە شۆڕشی پیشەسازی چاپخانەی کارەبایی بۆ رۆژنامە فەراهەم کرد، دواتر ئاژانسەکانی هەواڵیش دامەزران کە ئەمانە کاریگەرییان لەسەر هونەرەکانی نووسینی رۆژنامە هەبوو، هەر لەو سەردەمەدا بوو کە رۆژنامەی تابلۆید واتە نیوەیی پەیدابوو) [حجاب . ٢٠٠٨ . ٦٩]

وەرچەرخانی لاپەڕەبەندی ( لەدوادوای دەیەی (١٩٦٠) فۆرمەلە بوو، میتۆدەکانی کاری ئێستای دیزاینیش هەر لەو ساڵانەدا پراکتیزە کران. بۆ نموونە سوود وەرگرتن لە وێنەی زۆر و گەورە و مانشێت و دانانی بۆشایی سپی لە نێوانی ستوونەکاندا لەجیاتی هێڵ. لەگەڵ پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای چاپدا پێشکەوتنی چاپەمەنیش درێژەی کێشا ، لە سەرەتاکانی دەیەی (١٩٨٠) سوود وەرگرتن لە وێنەی رەنگاوڕەنگ بووە کارێکی ئاسایی و بەم شێوەیە قۆناغێکی نوێ لە دیزاینی رۆژنامەکان دەستی پێکرد). [بەدیعی . ٢٠١٠. ٤٠٩]

ئیتر لێرەوە بابەخ بە دیزاینی رۆژنامە درا، دیزاینی رۆژنامە خەڵکانی تایبەتمەند کاری تیایدا دەکرد کە پێشتر کەسێک ئەم کارەی دەکرد پێیاندەوت (کرێکاری چاپخانە)، چونکە ئەو رێکخستنی پیتەکانی لە ئەستۆ بوو تا لە شوێنی خۆیدا دایانبنێ و دێڕەکان دروست بکات، بەڵام لەگەڵ بایەخدان بە دیزاینی رۆژنامە کەسێکی تر پەیدا بوو بەناوی (دیزاینەر – نەخشەسازی رۆژنامە) کە ئەم تەواوی کارە هونەرییەکانی لاپەڕەکانی رۆژنامەی لە ئەستۆ بوو لە رێکخستن و دابەشکردنی یەکەکانی تایپۆگرافیا لەسەر لاپەڕەکانی رۆژنامە .

**دووەم: تەکنەلۆژیا و گەشەکردنی دیزاین:**

**یەکەم/ پەیدابوونی کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی دیزاین:**

سەرەتا دەبێ بزانین مەبەستمان چییە لە (تەکنەلۆژیا)؟ ئەم زاراوەیە لە دوو بەش پێکهاتووە((تەکنۆ) واتە کاری پیشەیی و (لۆژی) واتە زانست بەهەردووکیان بە واتای زانستی کاری پیشەیی دێت). [الامی، ٢٠٠٦ ، ٢٢]

لەم توێژینەوەیەدا مەبەست لە تەکنەلۆژیا یەکێک لە ئامرازەکانیەتی کە ئەویش (کۆمپیوتەرە)، چونکە کۆمپیوتەر وەک ئامرازێکی تەکنەلۆژی رۆڵی گرنگی هەیە نەک بەتەنیا لە گەشەکردنی دیزاینی رۆژنامەدا بەڵکو لەسەر نووسینی رۆژنامە و هەموو هەنگاوەکانی بەرهەمهێنانی رۆژنامەش کاریگەری هەبووە.

پەیدابوونی کۆمپیوتەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە کاری رۆژنامەنووسی بەگشتی و دیزاینی بەتایبەتی ئاسان کرد. پێشتر بە ئامێری تایپ رایتەر بابەتەکان دەنووسران هێڵکاری لاپەڕەکان بە دەست دەکران، بەڵام سەرهەڵدان و گەشەکردنی کۆمپیوتەر تا بە ئەمڕۆ دەگات چ دیسک تۆپ یان لاپتۆپ کارئاسانییەکی ئێجگار زۆری بۆ گەشەکردنی دیزاین کردووە بەتایبەتی ئەو بەرنامانەی کە راستەوخۆ پەیوەندییان بە دیزاینەوە هەیە.

دەتوانین بڵێین سەرهەڵدانی کۆمپیوتەر و بەکارهێنانی وەک ئامرازێکی تەکنەلۆژی لەبواری رۆژنامەگەری و دیزاینیدا لە دوو ڕووەوە کاریگەریی خۆی کرد کە ئەوانیش:

أ : کاریگەری لە ئاست و شێوازی کارکردن لە ناو لاپەڕەکانی رۆژنامەدا.

ب: کاریگەریی لە ئاستی پەخشی ئەلیکترۆنی و هەڵگرتن و بەکارهێنانی دەق و وێنە [الحسن . ٢٠١٢ . ٢٢٠]

ئەو بەرنامانەی کە راستەوخۆ کاریگەرییان لەسەر بەرەوپێشچوون و گەشەکردنی دیزاینی رۆژنامە هەبووە و هەیە بریتین لەمانە:

یەکەم/ Microsoft Publisher

دووەم/ Adobe InDesign

سێیەم/ Adobe Photoshop

چوارەم/ Quark Xpress

پێنجەم/ Adobe Page maker

**یەکەم/ Microsoft Publisher :**

ئەم بەرنامەیە یەکێکە لە بەرنامەکانی ناو (مایکرۆسۆفت ئۆفیس) وەک ۆرد و پاوەرپۆینت و ئیکسل،، ئەوەی ئەم بەرنامەیە لە بەرنامەکانی تری ئۆفیس جیادەکاتەوە تەنها تایبەتە بە دیزاینکردنی (لاپەڕەکانی رۆژنامە، ماڵپەر، کارت، مینیۆ، پۆستەر...هتد.) ئاسانکاریی ئەم بەرنامەیە بەڕادەیەکە کە خۆی دیزاینی لاپەڕەکانی رۆژنامەیەکی ئامادەکردووە و ئەوەی لەسەر دیزاینەر پێویستە نووسین و مانشێت و وێنەی بۆ دابنێ. ئەم بەرنامەیە لەگەڵ هەر ڤێرژنێکی ئۆفیسەکاندا نوێ کراوەتەوە و شێوەکەی گۆڕانکاری تێدا کراوە (ئۆفیسی ٢٠٠٣،٢٠٠٧،٢٠١٠،٢٠١٣،٢٠١٨)

لەم بەرنامەیەدا سەرباری ئەو چەند لاپەڕەیەی کە دیزاینەکەی ئامادەکراوە لە هەمان کاتیشدا سایزی لاپەڕەی بەتاڵی ئامادەکراوی تێدایە، واتە لاپەڕەی رۆژنامەکە چ قەبارەیەک بێت دەتوانرێت هەڵبژێریت و دیزاینەر خۆی بەپێی ئەو قوتابخانەیەی کە دەیەوێت لاپەڕەکان دیزاین بکات.

ئەم بەرنامەیە هیچ کێشەیەکی لەگەڵ جۆری ئەو فۆنتانەدا نییە کە دەقی لە (ۆرد) پێ تایپ کراوە، بەهەر شێوە پیتێک بێت لەگەڵ هێنانی بۆ ناو لاپەڕەکە نووسینەکەمان تێکناچێت و گرفتمان لەو بارەیەوە بۆ دروست ناکات، لەهەمان کاتیشدا دەتوانین ئەو وێنەیەی کە تایبەتە بە بابەتەکانەوە لەڕێی بەرنامەکەوە بیهێنین بۆ ناو لاپەڕەکە. ئەوە سەرباری ئەوەی کە دەتوانین هێڵ و چوارچێوە و ڕەنگ لەلاپەڕەکەدا بەکار بهێنین. ئەم بەرنامەیە بۆ ئەوانەی کە سەرەتای کاری دیزاینیانە بەرنامەیەکی گونجاو و باشە.

**دووەم/ Adobe InDesign:**

ئەدۆبی پێکدێت لە کۆمەڵێک بەرنامە لەوانە فۆتۆ شۆپ ، ئیندیزاین، ...هتد لەناو ئەوانەدا بەرنامەی ئەدۆبی ئیندیزاین تایبەتە بە دیزاینکردنی لاپەڕەکانی رۆژنامە. (ئەم بەرنامەیە کاریگەرییەکی زۆری لەسەر دیزاینی رۆژنامە دانا بە گوێرەی ڤێرژنەکانی هەنگاوی خێرای لەو بوارەدا هاویشت، بەجۆرێک نەک بە تەنها بۆ بواری دیزاینی رۆژنامە و گۆڤار بەڵکو لە بواری دیزاینی ریکلامیشدا شوێن پەنجەی خۆی داناوە) [البهنسي . ٢٠٠٦ . ٩]

بەگوێرەی ڤێرژنەکانی ئەم بەرنامەیە وا دانراوە کە هەرچیمان بوێت بۆ دیزاینکردنی لاپەڕەکانی رۆژنامە لێمان گیر نەبێت ، ئەم بەرنامەیە ئێستا رۆژنامەکانی پێ دیزاین دەکرێت و تازەترین ڤێرژنی (CC 2018) زۆر جوانکاری و ئاسانکاری بۆ دیزاینەر تێدایە. جیاوازیی ئەم بەرنامەیە لەگەڵ پابلیشەر ئەوەیە لێرەدا لاپەڕەی ئامادەکرداو نییە، دەبێت دیزاینەر بەگوێرەی ئەوەی کە دەیەوێت لاپەڕەکان ئامادەبکات.

بۆ نموونە گەر رۆژنامەکە بەقەبارەی(A3) بوو ئەوا دەبێت بچین ئەم لاپەڕەیە هەڵبژێرین و لەناو ئەم لاپەڕەیەدا ستوونەکان دیاری بکەین.

جیاوازییەکی تریشی ئەوەیە لەم بەرنامەیەدا کاتێک دەمانەوێت نووسین بهێنین بۆ لاپەڕەکەمان گەر (یونی کورد) نەبێت وەری ناگرێت و نووسینەکەمان تێکدەچێت.

**سێیەم / Adobe Photoshop:**

ئەم بەرنامەیە تایبەتە بە وێنە، ئەو وێنانەی کە بۆ بابەتەکان دادەنرێن زۆرجار وا پێویست دەکات بە فۆتۆشۆپدا تێپەڕن . چونکە لەم بەرنامەیەدا دەتوانین دەستکاریی وێنەکان بکەین و کۆمەڵێک فلتەری تیادایە کە دەتوانین چۆنمان بوێت وێنەکە وا لێبکەین  و بیخەینە خزمەت بابەتەکەمانەوە وەک رووناککردن و تاریککردنی وێنە، بڕینی وێنە ، تێکەڵکردنی دوو وێنە ، ...هتد.

**چوارەم/ Quark Xpress :**

بەرنامەی کوارک اکسبریس یەکێکە لە بەرنامە بەهێزەکان کە کاری دیزاینی پێدەکرێت بەتایبەتی دوای ئەوەی دواین ڤێرژنی پیتە عەرەبییەکانی تیادا داخڵ کراوە و دەتوانین بۆ نووسینەکان بەکاری بهێنین ، لەگەڵ زۆرباشیەکەیدا بەڵام بەهۆی گرانیی نرخەکەیەوە زۆر کاری پێناکرێت و زیاتر ئەدۆبی ئیندیزاین بەکار دەهێنرێت .

**پێنجەم/ Adobe Page maker:**

ئەم بەرنامەیە یەکێکە لە بەرنامەکانی ئەدۆبی ، بەرنامەیەکی گونجاوە بۆ کاری دیزاینی رۆژنامە بەڵام هەر زوو نەیتوانی رەواجێکی باش بۆخۆی پەیدابکات ئەویش بەهۆی هەندێک کەموکورتی بەتایبەتی لەڕووی بەکارهێنانی ڕەنگەکانەوە.

**دووەم/ کاریگەریی کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی لەسەر گەشەکردنی دیزاینی رۆژنامە:**

ئەوەی کە ڕابورد خستنەرووویەکی خێرای سەرهەڵدانی کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی بوو، لێرەوە دێینە سەرئەوەی چۆن دیزاینی رۆژنامە سوودی لەم ئامرازانە بینیوە بۆ گەشەکردنی خۆی؟ چۆن رەگەزەکانی تایپۆگرافیا (پیت، رەنگ، وێنە) لە ڕێی ئەم بەرنامانەوە مامەڵەیان لەگەڵداکراوە؟ هەروەها لاپەڕەبەندی و سایزی لاپەڕە و پێکاتەکانی تری لاپەڕەی رۆژنامە چۆن کراون؟

**یەکەم/ پیت :**

گەر لە پێشتردا پیتەکان کانزایی بوون و بەئامێرێک لە قاڵبێکدا رێکدەخران ، ئەوا لە سایەی کۆمپیوتەرەوە ئەم کارە زۆر ئاسان کرا، ئەویش بەوەی چەندین شێوە پیت داخڵی کۆمپیوتەرەکان کراون و رۆژنامەکان دەتوانن پیتی گونجاو بۆ نووسینی ناونیشانەکان و ناواخنی بابەتەکان هەڵبژێرن. پیت کە یەکێکە لە رەگەزە تایپۆگرافییەکان خاڵی یەکەمی سوود بینینی دیزاین بوو لە کۆمپیوتەر، هەڵبژاردنی شێوەی گونجاو، دیاریکردنی قەبارەی پیتەکە، رەنگکردنی پیتەکان. ئەمانە ئەو ئاسانکاریانە بوون کە کۆمپیوتەر بۆ کاری دیزاین فەراهەمی کردن بەجۆرێک ئێستا هەر رۆژنامەیەک پیتی تایبەت بەخۆی هەیە بۆ نووسینی ناونیشان و ناواخنی بابەتەکان کە جیای دەکاتەوە لە رۆژنامەیەکی تر و کەسایەتییەکی سەربەخۆی پێبەخشیوە .

**دووەم/ قەبارەی لاپەڕە:**

بەشێوەیەکی گشتی رۆژنامەکان دوو قەبارەیان هەیە (ستاندەر) و (تابلۆید) ئەم دوو قەبارە جیاوازە کەوتۆتە سەر رۆژنامەکە خۆی کە کامیان هەڵدەبژێرێت؟ کاتێک دەمانەوێت دەست بە کارێک بکەین لەناو لاپەڕەیەکی نوێدا بەرنامەکە ئەو بژاردەیەت دەداتێ کە دیزاینەر دەیەوێت قەبارەی لاپەڕەی رۆژنامەکەی چەند بێت؟ ئەمەش

ئاسانكارییەكی گەورەیە كە یارمەتی دیزاینەر دەدات بەخێرایی كارەكانی راپەڕێنێت.

**سێیەم/ ستوونەكان:**

بەگوێرەی ئەو لاپەڕەیەی كە دیزاینەر دەیەوێت كاری تیادابكات لە رێی بژاردەی ستوونەكانەوە دەتوانێت لاپەڕەكە بۆ (٥) یان(٦) یا(٨) ستوون دیاری بكات، ئەمەش دەوەستێتە سەر قەبارەی لاپەڕەكە گەر ستاندەر بوو ئەوا (٨-٩) ستوون لەخۆ دەگرێت، گەر تابلۆید بوو ئەوا (٥-٦) ستوون لە خۆ دەگرێت.

**چوارەم / رەنگ:**

یەكێك لەو سوودانەی تەكنەلۆژیا گەیاندنی بە بواری میدیا بەگشتی هێنانە ناوەوەی رەنگ بوو (فیلمی ڕەنگاو ڕەنگ، تەلەفزیۆنی ڕەنگا و رەنگ، چاپخانەی ڕەنگاو ڕەنگ)، رەنگەكان كاریگەریی سایكۆلۆجی لەسەر خوێنەر هەیە هەر رەنگێك و ئاماژەی خۆی هەیە بۆیە لە رێی بەرنامەكانەوە توانرا سوود لە رەنگ وەربگیرێت بۆ (نووسینی بابەتەكان بەتایبەتی رەنگی رەش  بۆ مانشێتەكان و كرۆكی بابەتەكان، ئەنجا رەنگەكانی تر وەك سوور شین سپی بەتایبەتی لەسەر پانتاییەكان، هەروەها بۆ چوارچێوەكان و وێنە رەنگاو رەنگەكانیش. كە ئەمانە كاریگەریی خۆیان لەسەر خوێندنەوەی بابەتەكان دەبێت.

**پێنجەم/ وێنە :**

وێنە رەگەزێكی تایپۆگرافیی گرنگە  و لەگەڵ گەشەكردنی تەكنەلۆژیا و پەیدابوونی كامێرادا ئیتر نەدەتوانرا بابەت بەبێ وێنە لەلاپەڕەدا دابنرێت، بەجۆرێك هەندێك رۆژنامە ئەوەندە وێنەیان بڵاودەكردنەوە بە رۆژنامەی وێنە دەناسران.

بەهۆی بەرنامەی فۆتۆشۆپەوە، وێنە لە رۆژنامەدا بازێكی گەورەی دا، چونكە لە رێی ئەم بەرنامەیەوە دەتوانرێت دەستكاریی

وێنەکان بکرێت و چەندین فلتەری تێدایە بەمەبەستی جوانکاری و شێواندنی وێنە و لێکدانی دوو وێنە و هێنانە ئارای وێنەیەکی نوێ .

**شەشەم/ سەیڤکردنی بابەتەکان:**

ئەو لاپەڕانەی کە رۆژانە دیزاینەر خەریکیان دەبێت و کاریان تێدا دەکات، زۆر بەئاسانی دەتوانرێت ناوی لێ بنێت و لە فۆلدەری تایبەتیدا هەڵبگیرێن تا هەرکاتێک بیەوێت بتوانێت بچێتەوە سەری و کاریان تیادا بکات .

**سێیەم: رەنگدانەوەی کاریگەریی تەکنەلۆژیا لەسەر رۆژنامە و دیزاین:**

١- زیادبوونی ژمارەی لاپەڕە و تیراژی رۆژنامەکان.

٢- بەرەو پێشترچوونی بەرهەمهێنانی رۆژنامە چاپەمەنییەکان و لە روخسار و ناوەرۆک و سایزی رۆژنامەکاندا.

٣- کێبڕکێی رۆژنامە لەگەڵ هۆکارەکانی تری میدیادا (رادیۆ و تەلەفزیۆن) کارێکی وای کرد رۆژنامە بەگشتی و دیزاینی رۆژنامە نەتوانێت سوود لە داهێنانەکانی تەکنەلۆژیا وەرنەگرن و لە کاری بەرهەمهێنانی رۆژانەی رۆژنامەدا بەکاری نەهێنن.

٤- تێرکردنی ئارەزووی خوێنەران بەتایبەتی دوای زۆربوونی ژمارەی خوێنەران و جۆراوجۆریی ئارەزووەکانیان ئیتر نەدەکرا بە شێوە تەقلیدییەکە رۆژنامە بەرهەمبهێنرێت. [الحمداني . ٢٠١١ . نيت]

**چوارەم : دیزانەر و گەشەی تەکنەلۆژیا:**

کاتێک باسی دیزاین دەکەین ناکرێت باس لە کەسێک نەکەین کە دیزاینی رۆژنامەکەی لە ئەستۆیە و پێیدەوترێت (دیزاینەری رۆژنامە) یان (نەخشەسازی رۆژنامە). ئەم کەسە بەرپرسە لە کاری نەخشەسازیی لاپەڕەکانی رۆژنامە و هەماهەنگی تەواوی لەگەڵ سەرنووسەری رۆژنامەکەدا هەیە .

دیزاینەر بەرپرسە لە نەخشەسازیی لاپەڕەکانی رۆژنامەکە، بەم پێیەش دەبێت شارەزاییەکی باشی لە بواری بەرنامەکانی دیزاین و چاپ و نەخشەسازی و نووسینی رۆژنامەوانیدا هەبێت، چونکە لە رێی شارەزایی و لێهاتوویی ئەمەوە بابەت و رەگەزەکانی تایپۆگرافیا بە گوێرەی سیاسەتی رۆژنامەکە بە ڕەچاوکردنی بنەماکانی دیزاینی رۆژنامە لاپەڕەکانی رۆژنامەکە ڕێکدەخات. [ئەحمەد، ٢٠١٣ . ٩]

بەرنامەکانی کۆمپیوتەر بەتایبەتی ئەوانەی لە بواری دیزایندا سوودیان لێ وەردەگیرێت خزمەتێکی زۆریان بە دیزاینەری رۆژنامە کردووە و کاریان بۆ ئاسان کردووە. لەسایەی کۆمپیوتەرەوە دیزاینەر دەتوانێت چ جۆرە پیتێکی بوێت بۆ نووسینی ناونیشان و بابەتەکان هەڵبیبژێرێت و سایزی گونجاویان بداتێ . بەگوێرەی سروشتی بابەتەکان دەتوانێت رەنگ بۆ نووسین و باکگراوندی بابەتەکان زیاد بکات ، ئەو وێنانەی کە لەگەڵ بابەتەکاندان گەر کێشەیەکیان هەبێت دەتوانێت چارەسەریان بکات، گەورەیان بکات، بچووکیان بکاتەوە یان بیانبڕێت یان جوانکارییەکیان تێدا بکات. هەروەها دانانی راستەهێڵ و چوارچێوەکان کە زیاتر مەبەست لێی دەرخستنی بابەتەکانە دیزاینەر توانیویەتی لە رێی بەرنامەی تایبەت بە دیزاینەوە نەهێڵێت هەندێک لەو بابەتانەی کە دەکەونە بەشی خوارەوەی لاپەڕە لە پەراوێزبوون رزگاریان بکات و وایان لێبکات دیار بن.

## بەشی سێیەم
## کاریگەریی تەکنەلۆژیا لە دیزاینی رۆژنامەی خەباتدا

**یەکەم/ رۆژنامەی خەبات:**

رۆژنامەی خەبات رۆژنامەیەکی سیاسیی گشتیی رۆژانەیە، ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانە و (عەلی عەبدوڵڵا) خاوەنی ئیمتیازێتی و تا ئێستا چەند سەرنووسەرێکی هەبووە وەک (فەرهاد عەونی)، (نەژاد عەزیز سورمێ) (زاهیر رۆژبەیانی) (ئاریان فەرەج) دووبارە (نەژاد عەزیز سورمێ)، ئێستاش (سەلام عەبدوڵڵا) سەرنووسەری رۆژنامەکەیە. یەکەم ژمارەی لە ساڵی (١٩٦٧)دا دەرچووە. سەرەتای دەرچوونی بەناوی (برایەتی) بووە، تا نەوەدەکانی سەدەی رابردووش هەر بەناوی (برایەتی) دەردەچوو لەپاڵ ئەودا رۆژنامەی (خەبات) بەزمانی عەرەبی دەردەچوو، دواتر لە ساڵی (٢٠٠٣) رۆژنامەی (خەبات) بەزمانی کوردی بووە جێگرەوەی رۆژنامەی (برایەتی) و (خەبات)یش گۆڕدرا بۆ (التآخي) و بەزمانی عەرەبی دەردەچوو. لەوکاتەوە تا ساتی ئامادەکردنی ئەم توێژینەوەیە هەر بەناوی رۆژنامەی (خەبات)ەوە لە دەرچوون بەردەوامە گەیشتۆتە ژمارە (٥٦٦٢).

**دووەم/ سەرەتای کاری دیزاین لە رۆژنامەی خەباتدا:**

وەک هەر رۆژنامەیەکی تر رۆژنامەی خەبات هۆبەی هونەریی هەیە و تیایدا چەند دیزاینەرێک کاری دیزاینی لاپەڕەکانی رۆژنامەکە دەکەن، لە نەوەدەکانی سەدەی رابردوو کاری دیزاینی لاپەڕەکانی رۆژنامەکە بەدەست کراوە وەک لە زاری دیزاینەرانی رۆژنامەکەوە باس دەکرێت (لە ساڵی ١٩٩٣ دەرچوونی رۆژنامەی خەبات (برایەتی) ئەوسا وەک رۆژنامە و گۆڤارەکانی تر نەخشەسازییەکەی بەدەستی بوو، دوای چەند قۆناغ بەچەند بەش و هۆبەی جیاوازدا تێدەپەڕی تادەگەیشتە قۆناغی چاپ، بەم شێوەیەی لای خوارەوە:

أ: تایپکردنی بابەت و هەواڵەکان لەسەر ستوونی (٤،٥،٩سم) بەئامێری تایپ کە لەو کاتەدا ئەم کارانە هۆبەیەکی تایبەتی هەبوو.

ب: هەڵەچنینی بابەت و هەواڵەکان بەهەمان ئامێری تایپ کە ئەمەش دووبارە هۆبەی تایبەت بەخۆی هەبوو.

دوای هێنانی بابەتەکانی هەر لاپەڕەیەک، واتە ئەوانەی کە تایپکراون وێنەکانی تایبەت بەو بابەتە لەسەر ئەو ستوونانەی کە ئاماژەیان پێدرابوو بەشی نەخشەسازی و دیزاینکردنی لەسەر ماکێت. ئیتر لێرەوە پێویستی بەوە دەکرد ناونیشان و مانشێتەکان بە فۆنتێکی گەورە بنووسرێت بۆ ئەمەش دەبوو خۆشنووسێک لەشوێنی بەجێهێڵراو ناونیشانەکان بەقەبارەیەکی گەورەتر بنووسێت. هەروەها ئەو شوێنانەی پێویستی بە باکگراوندی شەبەک یان نێگەتیڤ بوو لەگەڵ رەنگ، نەخشەساز بۆی دیاری دەکرد کە لەوکاتدا تەنها دوو رەنگی (رەش و سپی) بەکار دەهاتن.

ئەم قۆناغانەی کە باسکران لەناو رۆژنامەدا جێبەجێدەکران و ماکێتە ئامادەکراوەکان و وێنە و مۆتیڤ و نەخشەکان بەجیا دادەنران و شوێنیان بە بەتاڵی بۆ دیاری دەکرا و هاوپێچ دەکران لەگەڵ ماکێتەکاندا و رەوانەی چاپخانە دەکران، کەلەوێش بەچەند قۆناغێک تێپەڕ دەبوو). [چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێوەبەری هونەریی رۆژنامەی خەبات – شکار نەقشبەندی]

**سێیەم : بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و بەرنامەکانی دیزاین:**

رۆژنامەی خەبات بۆ یەکەم جار کاری دیزاینی بە کۆمپیوتەر کردبێت لە ساڵی (١٩٩٤) دا بووە بەکۆمپیوتەری (ئەپڵ ماکەنتوش) و بەرنامەی (الناشر الصحفي) بۆ یەکەم جار بەکارهێنا. گەرچی کارمەندانی بەشی دیزاین سەرەتا شارەزاییان لەو بەرنامە کۆمپیتەرییە نەبوو بۆیە راهێنانیان پێکراوە. بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و بەرنامەی دیزاین لە رۆژنامەکەدا رۆژنامەکەی بردە قۆناغێکی نوێ کە لەو دەمەدا پێش رۆژنامەکانی تریش کەوت، چونکە کارەکانی تایپی ئاسان و

خێراکرد بەهەمان شێوەش هەڵەچنین ئاسانتر و ستوونەکانی کە تایپی لەسەر دەکرا تێک نەدەچوون. لەمانە گرنگتر تاپیکردنی ناونیشان و مانشێتەکان بوو کە پێشتر بەدەست دەنووسران بەڵام لەسایەی کۆمپیوتەرەوە بەخواستی رۆژنامەکە فۆنت و سایزی گەورە و بچووک هەڵدەبژێردرا.

بەم شێوەیە هەر لە نەوەدەکانەوە تا بەئێستا دەگات رۆژنامەی خەبات دیزاینی لاپەڕەکانی بەکۆمپیتەر بوو بەرنامەی الناشر الصحفي ئەنجام دەدات و وەک دیزاینەری رۆژنامەکە دەڵێت سەرباری ناهەمواریی بارودۆخی کوردستان لە نەوەدەکاندا بەتایبەتی رۆژانی رەشی شەڕی ناوخۆ، بەڵام یەکەم رۆژنامە بووە کە بەکۆمپیوتەر دیزاینی لاپەڕەکانیان کردووە.

**چوارەم/ هەنگاوەکانی سوود وەرگرتنی دیزاینی رۆژنامەکە لە کۆمپیوتەر و بەرنامەی دیزاین:**

لە روانگەی ئەو زانیارییانەی سەرەوە کە لە زاری دیزاینەری سەرەکیی رۆژنامەی خەباتەوە بیستوومانە دەتوانین بڵێین کە رۆژنامەکە لە نەوەدەکانەوە تائێستا بە دوو قۆناغدا ڕەت بووە، قۆناغێکیان کاری دیزاینەکە بەدەستی بووە و قۆناغی دووەمیشیان هاتنە ئارای بەرنامەی دیزاینی بووە کە تائێستا بەردەوامە.

لە ساڵی (١٩٩٣)دا ئەو کات رۆژنامەکە بەناوی (برایەتی) دەرچووە، ژمارەکانی ئەودەم ئەو راستییەمان بۆ دەردەخەن کە کاری دیزاینی رۆژنامەکە هەمووی بەدەستی بووە بەم شێوەیە ناوی رۆژنامەکە لە لایەن خۆشنووسەوە نووسراوە ، مانشێتەکان و ناونیشانەکان پێشتر شوێنیان بۆ بەجێ دەهێڵرا و دواتر لەلایەن خۆشنووسێکەوە نووسراون، هێڵکارییەکان بەقەڵەم کراون، شوێنی وێنەکان بە قەڵەم دیاری کراون دواتر لە چاپخانە وێنەکان لەو شوێنانە دانراون ، تەنانەت هەندێک جار چوارچێوەی وێنەکە بە ڕوونی دیارە و نەشاردراوەتەوە، ستوونەکان پارچە پارچە دانراون ، ئەوەی نووسینی

بابەتەکانە بە ئامێری تایپ رایت نووسراوە، لەم قۆناغەدا ناتوانین بڵێین نووسینەکان بە چ فۆنتێکە ، چونکە تایپ رایتەکە هەر ئەو جۆرە فۆنتەی هەبووە تەنها ئەوەندە نەبێت کە توانراوە بۆڵد بکرێت.

سەبارەت بە بەکارهێنانی ڕەنگیش ئەوا ڕەنگی رەش بۆ نووسینی بابەت و ناونیشانەکان بەکارهاتوون و ، بەڵام هەندێک جار رەنگی تریش بەکار هێنراوە بەتایبەتی بۆ پانتایی وەک رەنگی زەرد کە ئەوەش لە چاپخانە بە گوێرەی داواکاری بۆ باکگراوندی ناونیشان بەکارهاتووە. **وەک نموونەی ژمارە (١).**

لە ساڵی (١٩٩٤) بۆ دیزاینی رۆژنامەکە ساڵێکی جیاواز بووە، چونکە لەم ساڵەدا (کۆمپیوتەر) وەک ئامرازێکی تەکنەلۆژی هاتە ناو رۆژنامەکەوە، بەڵام هاتنە ئارای ئەم ئامرازە گرنگەی تەکنەلۆژی یەک هەنگاو دیزاینی رۆژنامەکەی بردە پێشەوە ئەویش بریتی بوو لە داخڵکردنی نووسینەکان ، واتە لەجیاتی تایپ رایت بابەتەکان بە کۆمپیوتەر نووسراون، بەڵام دیزاینی لاپەڕەکان هەر وەک پێشتر بە دەست بووە تەنانەت شێوەی پیتی ناوی رۆژنامەکەش کە گۆڕاوە لەلایەن خۆشنووسەوە هەر بەدەستی بووە. **وەک نموووونەی ژمارە (٢).**

ساڵی (١٩٩٥) ڕووداوەکانی شەڕی ناوخۆ کاریگەری لەسەر نەخشەسازیی رۆژنامەکە هەبووە، چونکە ئۆفیسی رۆژنامەکە لەشوێنی خۆی کە هەولێر بووە نەماوە و گواستراوەتەوە بۆ پیرمام . لەوێش دووبارە دیزاین هەر کاری دەستی بووە و بابەتەکان بە کۆمپیوتەر تایپ کراون و لاپەڕەکان پرینت کراون دواتر لاپەڕەکان بە ئامێری فۆتۆکۆپی کۆپی کراون، سەرباری ئەو بارودۆخە نالەبارە بەڵام دیزاینەری رۆژنامەکە هەر لە هەوڵدابووە بۆیە لە هەندێک ژمارەی ئەو ساڵەدا هەندێک هەوڵی نوێی نووسینی مانشێت و دانانی وێنە دەبینین .

هەر لە کۆتایی ئەو ساڵەدا رۆژنامەکە گەیشتۆتە قۆناغی (ترێس) واتە دوای دیزاینکردنی لاپەڕەکان سەرجەم لاپەڕەکان کراون بە ترێس و ئەنجا نێردراون بۆ چاپخانە. **وەک نموونەی ژمارە (٣)**

لە ژمارەکانی ساڵی (١٩٩٦) بەدواوە هەنگاوێکی تر دیزاینی ڕۆژنامەکە لە ڕووەکانی فۆنت و ڕەنگ و هێڵ چۆتە پێشەوە ، چونکە لێرەوە قەبارەی فۆنت جێگیر بوو، ڕەنگ بۆ مانشێت و ناونیشانەکان بەکارهات. هەر لەم ساڵەدا جۆری کاغەزی ڕۆژنامەکەش گۆڕاوە، شوێنی چاپخانەکەش گۆڕدراوە بۆ چاپخانەی پەروەردە لە هەولێر. **وەک نموونەی ژمارە (٤)**

ساڵی (١٩٩٧) بە ساڵێکی گرنگ بۆ ڕۆژنامەکە دادەنرێت، چونکە لەم ساڵەدا بۆ دیزاینی ڕۆژنامەکە بەرنامەی (الناشر الصحفي) بەکارهات و شێوەی فۆنتی ناوی ڕۆژنامەکە گۆڕدرا، دانان و ڕێکخستنی هەموو بابەتەکان بە وێنەکانیشەوە لەڕێی کۆمپیوتەرەوە بوو، ڕەنگی سوور و ڕەش بۆ نووسینی مانشێتەکان بەکار هاتن، لەهەمان کاتیشدا ڕەنگ بۆ باکگراوندی بابەتەکان بەکارهات وەک ئەوەی گەر پرسەنامەیەک هەبووبێت باکگراوندێکی ڕەشی بۆ بەکارهاتووە کە پێشتر ئەوە نەبووە. **وەک نموونەی ژمارە (٥ و ٦)**

ژمارەکانی ساڵی (١٩٩٨ و ١٩٩٩) درێژە پێدەری ساڵانی پێشترن و لەو ماوەیەدا شتێک کە نوێ بوو بۆ کاری دیزاین دانانی باکگراوندی کاڵ بوو بۆ بابەتەکان کە پێشتر ئەمە نەبووە. **وەک نموونەی ژمارە (٧ و ٨)**

کۆتایی سەدەی بیستەم و دەستپێکی سەدەی بیست و یەک واتە ساڵی (٢٠٠٠) خاڵی وەرچەرخانە لە دیزاینی ڕۆژنامەکەدا. لەم ساڵە بەدواوە تا دەگاتە ساڵی (٢٠٠٣) سیما سەرەکییەکانی دیزاینی ڕۆژنامەکە چەسپا و دەتوانین بڵێین بەتەواوەتی سوود لە کۆمپیوتەر و بەرنامە کۆمپیوتەرییەکانی دیزاین وەرگیراوە کە خۆی لەم خاڵانەدا بینیوەتەوە:

١-دیاریکردنی شێوە فۆنتێکی جێگیر بۆ نووسینی بابەتەکان کە ئەویش (فۆنتی هەڵەبجە)یە.

٢-دیاریکردنی شێوە فۆنتێکی جێگیر بۆ نووسینی مانشێت و ناونیشانەکان کە ئەویش (فۆنتی دیاربەکر)ە و قەبارەی جیاوازیان بۆ

بەکارهێنراون کە لە پێشتردا دوو شێوە فۆنت بۆ نووسینیان بەکاردەهێنران.

٣-لەو ساڵە بەدواوە هەوڵ دراوە وێنەکان زیاتر دەربخرێن بەتایبەتی لە خستنە ڕووی وێنەی گەورە لە لاپەڕەی یەکەم و چاککردنی هەر کێشەیەک کە لە وێنەکاندا هەبووبن لە ڕێی بەرنامەی فۆتۆشۆپەوە.

٤-لەلاپەڕەکانی ناوەوە بۆ یەکەم جار لاتەنیشتی بابەتەکان بۆ ناونیشانی لاوەکی بەکارهێنران.

٥-لێرە بەدواوە لەلاپەڕەی یەکەمدا (پێڕست) بۆ ئەو بابەتانە دانراوە کە دەکەونە لاپەڕەکانی ناوەوە.

٦-لێرە بەدواوە بایەخ بەشوێنی گوێچکەکان دراوە و چ بۆ تۆمارکردنی زانیارییەکانی سەر ڕۆژنامەکە وەک ژمارە و ساڵی دەرچوون کە لەپێشتردا لە گەردنی ڕۆژنامەکە دەنووسران چ بۆ هەواڵێک یان بابەتێکی کورت و گرنگ.

٧-ناوی ڕۆژنامەکە بە بەرنامەی (فۆتۆشۆپ) کاری جوانکاری لەسەرکراو لەڕووی ڕەنگ و شێوە و سایزەوە جوانتر و گونجاوتر کرا.

٨-هەر لەو ساڵانەدا سوود لە ئینتەرنێت وەرگیرا و نوسخەی ئەلیکترۆنیشی بۆ زیادکرا.

٩-دوو مانگ دوای پرۆسەی ئازادیی عێراق لە ڕێکەوتی(٢٠٠٣/٥/٤)دا گۆڕانێکی گەورە لە ڕۆژنامەکەدا ڕوویدا ئەویش گۆڕینی ناوی ڕۆژنامەکە بوو بۆ (خەبات) و(برایەتی) ناوەکەی گۆڕدرا بۆ (التآخي) کە پێشتر بەزمانی عەرەبی بە ناوی (خەبات) دەردەچوو. **وەک نموونەی ژمارە (٩ و ١٠ و ١١ و ١٢ )**

لەو ساڵە بەدواوە واتە ساڵانی (٢٠٠٤ و ٢٠٠٥ و٢٠٠٦ و ٢٠٠٧ و ٢٠٠٨ و تا ٢٠١٧) بە وێنە و بە وشە دروشمی بۆ دانرا . هەروەها هەندێک شتی نوێ بۆ سیمای ڕۆژنامەکە دەرکەوتن وەکو:

١-بەکارهێنانی لاپەڕەی ڕەنگاو ڕەنگ.

٢-تەرخانکردنی بەشێک یان هەموو لاپەڕە بۆ ریکلام.

٣-بایەخدان بە لاپەڕەی کۆتایی لە ڕووی نووسین و دیزاینەوە و کردنی بە لاپەڕەیەکی هەمەڕەنگی سەرنجڕاکێش تا خوێنەر لە کۆتاییدا پشوویەک بدات.

٤-تەرخانکردنی بەشی خوارەوەی لاپەڕەی یەکەم بۆ هەواڵی جۆراوجۆر و وێنەی دەرپەڕیو لە چوارچێوەی بابەتی خۆی.

٥-لەپاڵ بەرنامەی (الناشر الصحفي) بەکارهێنانی بەرنامەی (ئەدۆبی ئیندیزاین) کە تا ئێستاش بەردەوامە.

٦-بەکارهێنانی وێنەی گەورە بۆ بابەتەکان.

٧-بەکارهێنانی رەنگی سوور بۆ نووسینی مانشێتەکان و ڕەنگی سەوز بۆ لاپەڕەی وەرزش و باکگراوندی رەنگدار بۆ بابەتەکان.

٨-لە ساڵی( ٢٠٠٩ )وە قەبارەی رۆژنامەکە لە تابلۆید نزیک بۆتەوە و دوای دیزاینکردنی لاپەڕەکان کراون بە (پی دی ئێف) لەجیاتی ترێس ئینجا نێردراونەتە چاپخانە.

٩-لە ساڵی (٢٠١٦ ) دا هەست بەوە دەکەین کە دیزاینی رۆژنامەکە لە قوتابخانەی میانڕەو نزیک دەبێتەوە بەتایبەتی ڕێبازی چواربەشی، ئەمەش بەشێوەیەکە لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامە دابەشی سەر چوار بەش دەکرێت.

١٠- خاڵێکی سەرنجڕاکێش لەو ساڵانەدا دیزاینەر توانیویەتی خۆی لە تەوقی ئەو تەقلیدە رزگاربکات کە نەدەبوو لە سەروو ناوی رۆژنامەکەوە بابەت بڵاوبکاتەوە بۆیە لەم ساڵانە بەدواوە و تا بە ٢٠١٧ دەگات لە هەوڵی ئەوەدان سیماکانی قوتابخانەی نوێ بە دیزاینی لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەکە بدەن کە خۆی لە وێنەی گەورە و ناونیشانی زۆر و رەنگدا دەبینێتەوە. **وەک نموونەکانی ژمارە (١٣ و ١٤و ١٥ و ١٦وتا ٢٤)**

## سەرچاوەکان

**کتێبە کوردییەکان:**

- ئەحمەد ؛ دلێر (٢٠١٣). لایەنە تیۆرییەکانی نەخشەسازیی رۆژنامە. چاپی یەکەم. هەولێر. دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان.
- بەدیعی ؛ نەعیم و حسین قەندی(٢٠١٠). رۆژنامەوانی مۆدێرن ، و: کارزان محمد. چاپی یەکەم. سلێمانی . خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا.

**کتێبە عەرەبییەکان:**

- **البهنسي ؛ محمد صديق (٢٠٠٦).** تصميم واخراج صفحات الجرائد والمجلات. الطبعة الاولى. مكتبة عمان. الاردن. المجتمع العربي للنشر والتوزيع.
- ابو عرجة؛ تيسير احمد (٢٠١٤). الاخراج الصحفي الحديث الاسس العلمية والعملية. الطبعة الاولى. عمان. دار المسيرة للنشر والتوزيع والطباعة.
- الحسن؛ غسان عبدالوهاب (٢٠١٢) ايديولوجيا الاخراج الصحفي. الطبعة الاولى. دار الاسامة للنشر والتوزيع. عمان. الاردن.
- حجاب؛ محمد منير(٢٠٠٨) وسائل الاتصال نشأتها وتطورها. الطبعة الاولى. دار الفجر للنشر والتوزيع. القاهرة.
- خوخة؛ اشرف (٢٠٠٨) مدخل الى الاخراج الصحفي والطباعة، الاطر النظرية والنماذج التطبيقية، دار المعرفة الجامعية. الاسكندرية.
- اللامي؛ غسان قاسم (٢٠٠٦) إدارة التكنولوجيا (مفاهيم ومداخيل، تقنيات، تطبيقات علمية). الطبعة الأولى. دار المناهج. عمان.

**چاوپێکەوتن:**

چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێوەبەری هونەریی رۆژنامەی خەبات بەڕێز (شکار نەقشبەندی).

**ماڵپەڕ**

الحمداني ؛ بشرى (٢٠١١) اثر التقنيات الحديثة على الصحافة المكتوبة. مؤسسة النور للثقافة والاعلام www.alnoor.se

## نموونەکان



نموونەی ژمارە (1) ژمارە (1758) لە (1/10/1993)

نموونەی (2) ژمارە (2087) لە(15/11/1994)

نموونەی (3) ژمارە(2126 و2127) لە (28/5/1995)

نموونەی (4) ژمارە (2178) لە (3/7/1996)



(نموونەی 5) (1/5/1997) لە (2322) ژمارە

(نموونەی 6) (13/10/1997) لە (2437) ژمارە ٧

(نموونەی 7) ژمارە (2685) لە (5/10/1998)

(نموونەی 8) ژمارە (2941) لە (8/10/1999)


بەشار ئەسەد سەردانی میسر دەکات

برایەتی

سەرۆک بارزانی پێشوازی لە شاندێکی ڕۆشنبیری و هونەریی کوردستانی ئێران و سەرۆک و جێگری سەرۆکی کۆمەڵەی ماڵی ئێزدیان لە ئەڵمانیا دەکات

شەڕو پێکدادان لە فەلەستین بەردەوامە و ژمارەی کوژراو و بریندارانیش لەزیادبووندایە

نموونەی (9) ژمارە (3197) لە (2/10.2000)

برایەتی

سەرۆک بارزانی پێشوازی لە سەرۆکی ئەسقیفەی کلدانەکانی هەولێر دەکات

نموونەی (10) ژمارە (3501) لە (1/10/2001)

نموونەی (11) ژمارە (3542) لە (18/12/2001)

BIRAYETI

Daily newspaper

36

یەکەم ڕۆژنامەی کوردییە

کە پێش چاپکردنی لە ئەنتەرنێتدا بخوێنرێتەوە

نموونەی (12) ژمارە (3678) لە (6/5/2002)



نمونەی (13) ژمارە (1129) لە (4/5/2003)

نمونەی (14) ژمارە (1621) لە (13/9/2004)

نمونەی (15) ژمارە (1822) لە (3/12/2005)

نمونەی (16) ژمارە (2426) لە (3/3/2007)



خەبات

وێستگەی 500 مێگەواتی هەولێر کرایەوە

سەرۆک تاڵەبانی لەگەڵ فەرماندەیی و هێزەکانی پێشمەرگە کۆبووە

سەرۆکی کوردستان پێشوازی لە د. موفەق ئەلروبەیعی دەکات

نموونەی (17) ژمارە (2807) لە (3/4/2008)

نموونەی (18) ژمارە (3221) لە (10/7/2009)

نموونەی (19) ژمارە (3614) لە (1/11/2010)

نموونەی (20) ژمارە (3663) لە (2/1/2011)



ئەحمەد ئالتان: دەما سەدام رۆخیا دەوڵەتا کوردی ناڤا بوو

نموونەی (21) ژمارە (4130) لە (2/8/2012)



مالیکی لە کوردستانە..

ژمارە (4338) لە ( 10/6/2013 ) نموونەی (22)



جاودێرانی سیاسی: پێشمەرگە پێگەومۆڵگەی داعشی هەژاند

نموونەی (23) ژمارە (4617) لە (7/8/2014)



نموونەی (22) ژمارە (4813) لە (1/6/2015)

## ئەنجام

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەدا بەم ئەنجامانە گەیشتین:

١- دیزاینی رۆژنامە لە سەرەتادا بەشێوەیەکی سادە دەستی پێکردووە و وردە وردە لەگەڵ گەشەی تەکنەلۆژیا و هاتنەئارای کۆمپیوتەر گەشەی کرد.

٢- هاتنەئارای بەرنامەکانی دیزاین رۆڵێکی گەورەیان بینی لە گەشەسەندن و ئاسانکردنی دیزاینی لاپەڕەکانی رۆژنامەدا.

٣- لە قۆناغی ساڵی (١٩٩٣) کاری دیزاینی رۆژنامەی خەبات بە دەستی بووە و هەموو کارەکانی دانانی ستوونەکان و وێنە و ناونیشانەکان بە دەست شوێنی بۆ کراوەتەوە.

٤- لە ساڵی(١٩٩٤) رۆژنامەی خەبات بۆ کاری دیزاینی سوودی لە کۆمپیوتەر وەرگرت بەتایبەتی کۆمپیوتەری (ئەپڵ ماکەنتوش) و بەرنامەی (الناشر الصحفي) بۆ یەکەم جار بەکارهێنا. لێرە بەدواوە هەنگاو هەنگاو لەگەڵی رۆشت تا بەئەمرۆ دەگات.

٥- ساڵی (٢٠٠٠) بە خاڵی وەرچەرخان لە دیزاینی رۆژنامەکەدا دادەنرێت، چونکە لەم ساڵە بەدواوە تا دەگاتە ساڵی(٢٠٠٣) سیما سەرەکییەکانی دیزاینی رۆژنامەکە لە (فۆنتی نووسینی بابەتەکان و فۆنتی نووسینی مانشێت و ناونیشانەکان، دەرخستنی وێنەکان، بەکارهێنانی لاتەنیشتی لاپەڕەکان بۆ ناونیشانی لاوەکی و ...هتد) چەسپا و دەتوانین بڵێین بەتەواوەتی سوود لە کۆمپیوتەر و بەرنامە کۆمپیوتەرییەکانی دیزاین بینرا.

٦- دوای پرۆسەی ئازادیی عێراق و دروست لە ساڵی (٢٠٠٤ تا ٢٠١٧) سیمای هەمیشەیی چەسپان لەوانە لاپەڕەی رەنگاو رەنگ لەجیاتی رەش و سپی ، بایەخدان بە ریکلام ، بایەخدان بە دیزاینی لاپەڕەی کۆتایی، و خۆ رزگارکردن لە تەوقی دیزاینی کلاسیکی کە نەدەبوو ناوی رۆژنامە تەنها لە سەرەوەی لاپەڕە بێت .... هتد.

## ملخص البحث

## تاثير التكنلوجيا في تطوير التصميم الصحفي، صحيفة خبات أنموذجاً

**د. دلير احمد حمه**
مدرس – قسم تقنيات الاعلام – كلية
التقنية الادارية – جامعة بوليتكنيك/اربيل)

هذا البحث محاولة لإظهار دور التكنلوجيا؛ سيّما الحاسوب وبرامج التصميم في النهوض بالتصميم الصحفي وسبل تطويره . وقد تمّ إنجاز هذا البحث حسب المنهج الوصفي التحليلي، ويتألف من ثلاثة فصول. تطرّق الفصل الأوّل إلى اطار المنهج العلمي للبحث، أما الفصل الثاني، فقد تناول مراحل التصميم الصحفي من نشأته مع تلك التطورات التي شهدها جرّاء ظهور و تطوّر الحاسوب. أما الفصل الثالث فقد تناول التصميم الصحفي في جريدة خبات، إذ أخذ الباحث أعدادا من الصحيفة بطريقة عشوائيّة غير منظمة من سنة ١٩٩٣ إلى سنة ٢٠١٧، وتمّ تسليط الضوء خلالها على مظاهر التصميم فيها من خلال أمثلة حية، مبيّناً خلالها تلك التغييرات التي حصلت عليها في التصميم الصحفي حسب ظروف إصدارها، وتلك الآليات التي استفادت منها الصحيفة في الحاسوب وبرامج التصميم الصحفي.

## Abstract

### The Effect of Technology in the Development of Journalistic Design-Khabat news paper as a sample



**Dr. Dler Ahmad Hama**

Lecturer – Erbil Polytechnic University – College of Technical Management – Media Department Techniques



This paper, titled "The effect of Technology in the Development of Journalistic Design-Khabat news paper as a sample" is an attempt to demonstrate the role of technology, especially computer and design programs, in promoting journalistic design and ways of developing it. This research has been completed according to the analytical descriptive approach, and consists of three chapters. The first chapter deals with the framework of the scientific approach to research. The second chapter deals with the stages of the journalistic design from its inception with those of the development of the computer. The third chapter dealt with the design of the newspaper in the newspaper Khabat, where the researcher took the paper randomly from 1993 to 2017, was highlighted through the design aspects through live examples, showing the changes in the design of the press according to the conditions of issuance , And those mechanisms that benefited the newspaper in the computer, through the journalistic design program.

# کاریگەریی بەکارهێنانی سۆشیاڵ میدیا (Social Media) لەسەر زمانی کوردی، فەیسبووک بەنموونە

### توێژینەوەیەکی وەسفی ڕاپێویە بۆ سامپڵێک لە قوتابیانی کۆلێژی ئەدەبیات

**م. هەردەوان مەحموود کاکەشێخ**　　　　**م. ی. شیلان یاسین خضر**
بەشی ڕاگەیاندن
- کولیژی ئەدەبیات - زانکۆی سەلاحەددین - هەولێر

**پێشەکی**

سۆشیاڵ میدیا لەگەڵ میدیای باو یان کلاسیک جیاوازیی زۆری هەیە، ڕاستە لە ڕواڵەتدا ئەم جۆرە میدیایە، وەک ئامرازێکی مەڵتی میدیایی (نووسراو، بینراو و بیستراو) بەهۆی ئاسانی و سادەیی لەبەکارهێنانیدا بواری ئەوەیداوە بە هەموو کەسێک بەجیاوازیی ئاستی خوێندەوارییەوە هەژمار "ئەکاونت" بکەنەوە و بەشداری بکەن لە: قسەکردن و ئاڵوگۆڕکردنی بیرو بۆچوون و تێچێن "کۆمێنت" نووسین لەسەر بابەتەکان و پۆستکردنی وێنە و بابەتی جیاواز، بەڵام ئەم چالاکییە جەماوەرییانە هیچ مەرج نییە، بەرهەمی رۆژنامەنووسی بن، بەڵکو کار و بەرهەمی رۆژنامەنووسانی پسپۆر، تەنها لە ئامرازە تراديشناڵەکانی راگەیاندندا دەمێنێتەوە.

نووسین و بڵاوکردنەوە لە ئامرازەکانی سۆشیاڵ میدیادا، یان وەک ئەوەیە: هەر کەسێک بیەوێت و لەبەر دەرگای ماڵی خۆی، رۆژانە لافیتەیەک هەڵواسێت و جۆرە دەربڕین و بۆچوونێک یان سەرنجێکی لێ بنووسێت یانیش وێنەیەکی پێوە هەڵواسێت. بەشداریکردن لە میدیای نوێ زیاتر کۆشش و کارێکی کەسیی تایبەتە، دەکرێت لەسەر بابەتێکی گشتی بێت. جێبەجێکردنی ئەم کارە، تەنها لەڕێی "کۆمپیوتەرێکی

کەسیی"یەوە ئەنجام دەدرێت و لەکاتێکدا ئامرازەکانی میدیایی باو وەک: چاپ و پەخش و بیستراو دامەزراوەی کارکردن و بەرهەمهێنانی بەکۆمەڵن و ناونیشانێکی یاسایی و مەعنەویشیان هەیە. ئەوان لەو بابەتانەی بڵاویان دەکەنەوە خۆیان لێی بەرپرسن. جگە لەوە کەسانی پسپۆر و شارەزا لە کاری میدیا بەڕێوەی دەبەن، لە ئامانجیشدا کۆمەڵێک ئامانج و ئەرکی بنەڕەتییان لەئەستۆدایە و هەوڵدەدەن بەپێی پلانێک بەجێیان بهێنن، لەبەرامبەردا ئەگەر سەیری سۆشیاڵ میدیا بکەین هەموو شتێک جیاوازە، کاسبکارێکی ناو بازاڕ ئەکاونتی هەیە و قسەی خۆی هەیە، دووکاندارێک، سەوزە فرۆشێک یان هەر کەسێکی دیکە. هەموویان لە سۆشیاڵ میدیادا بەشدارن، بەڵام هیچیان بەشدارنین لەبەرهەمهێنانی میدیاییدا، بەکورتی لەناو سۆشیاڵ میدیادا بەهایەکی ئەوتۆ نەماوەتەوە بۆ پسپۆری و پرۆفیشناڵییەت ئەگەر کاری رۆژنامەنووس و نووسەرە شارەزاکانی لێدەرکەین، ئەگینا ئەوی دیکە نەپرۆفیشناڵن و نەجێی متمانەن، نەک هەر ئەوەندە، بەڵکو هەندێک پێیان وایە سۆشیاڵ میدیا فەوزایەکی گەورەی دروستکردووە، هەموو کەسێک خۆی لێ بووە بە شاعیر، بە قسەزان و زمانزان و رۆژنامەنووس و نووسەر و بلیمەت، لەکاتێکدا ئەگەر لێی بکۆڵیتەوە زۆرێک لەوانە بناغەکەی لەسەر بنەمایەکی هیچەوە سەرچاوەی گرتووە. جا بۆیە توێژەران وای بەباش دەزانن توێژینەوەیەک لەسەر زمانی بەکارهاتووی نێو سۆشیاڵ میدیادا بکەن و کاریگەرییە ئەرێنی و نەرێنییەکانی زمانی بەکارهاتوو بخەنەڕوو. ئەم توێژینەوەیە لە سێ بەش پێکهاتووە و بەشی یەکەمی ناساندنی توێژینەوەکەی لە خۆ گرتووە، بەشی دووەم تایبەتە بە زمان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا لەڕووی بنەما و پێکهاتە و بەکارهێنانییەوە و کاریگەریی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەسەر زمانی کوردییەوە. بەشی سێیەم کە دوا بەشە لایەنی مەیدانی توێژینەوەکەی لەخۆگرتووە و خستنەڕووی خشتە و پێنوێنەکانە. لە کۆتاییدا ئەنجام و راسپاردە خراونەتە ڕوو.

## بەشی یەکەم: چوارچێوەی توێژینەوەکە:

### یەکەم: ناساندنی توێژینەوە:

**١-١ کێشەی توێژینەوە:** کێشەی ئەم توێژینەوەیە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە تا چ ڕادەیەک بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان پابەندن بە ڕەچاوکردنی ڕێنووسی کوردی و ڕێزمان لە بڵاوکردنەوەی پۆست و بابەت و نووسینی کۆمێنتەکاندا.

**١-٢ گرنگیی توێژینەوە:** ئەم توێژینەوەیە چەندین گرنگی لەخۆ دەگرێت ئەوانیش:

١- لایەنی مرۆیی: توێژینەوەکە دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ بەکاربەران تاوەکو ئاگادار بن لە گرنگی و لایەنی باشی و خراپی زمانی بەکارهێنراوی فەیسبووک لەسەر بەکارهێنەران.

٢- زانستی: دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگ بۆ توێژەران و میدیاکاران تاوەکو بەشێوەیەکی زانستی لەکاریگەری زمانی بەکارهێنراوی بیانی تێبگەن لە سوشیاڵ میدیادا بە گشتی و فەیسبووک بەتایبەتی.

بەگەیشتن بەو دوو خاڵەی پێشتر، دەکرێ چەند ڕێگە چارەیەک پێشنیاز بکەین بۆ چارەسەری کێشە و گرفتەکانی زمانی کوردی لەنێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا.

**١-٣ ئامانجەکانی توێژینەوە:** ئامانجی سەرەکی ئەم باسە خۆی لەچەند خاڵێکدا دەبینێتەوە:

١. ئاشنابوون بە شێوازی زمانی بەکارهاتوو لەنێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا لە ڕووی بنەما و پێکهاتە و بەکارهێنانییەوە.

٢. دەستنیشانکردنی خاڵە بەهێز و لاوازەکانی کاریگەریی سۆشیاڵ میدیا بەسەر زمانی کوردییەوە.

**١-٤ پرسیارەکانی توێژینەوە:**

١- نەبوونی ڕێنووسێکی یەکگرتوو و سەربەخۆ بۆ زمانی کوردی، بۆتە هۆکاری ئەوەی، کە داتایەکی ورد و تەواو لەبارەی واقیعی زمانی

کوردییەوە لەنێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بەردەست نەبێت؟
٢. خاڵە بەهێز و لاوازەکانی کاریگەریی سۆشیاڵ میدیا لەسەر بەکارهێنەران دەربارەی زمانی کوردییەوە چین؟

**دووەم: ناساندنی چەمکەکان:**

١. تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان – Social Media: زاراوەیەکە بۆ کۆمەڵە ویبسایتێکی نێو تۆڕی ئینتەرنێت بەکاردێت، ئەم ویبسایتانە دەرفەتی بەیەکگەیشتن و ئاڵوگۆڕی بیروڕا و زانیاری بۆ ئەندامان یان بەشداربووانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دەڕەخسێنێ، کە یەکتر ناسین و بەیەکگەیشتن لەسەر بنەمای بایەخ یا خولیا و ئارەزوو دەبێت (مەحمود، ٢٠١٥).

٢. هاووڵاتی ڕۆژنامەنووس – Citizen journalis: زاراوەیەکە بۆ ئەو کەسانە بەکاردەبرێت، کە لە نێو کۆمەڵگەدا هاوشێوەی ڕۆژنامەنووس ڕۆڵی کارا لە کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاری و شرۆڤەکردنی بابەتەکاندا دەگێڕن، بەبێ ئەوەی ئەم کەسانە پاداشت یان مووچە لەبەرامبەر کارەکانیاندا وەربگرن یان کار بۆ دامەزراوەیەکی میدیایی بکەن یاخود شارەزایی و ئەزموونی کاری میدیاییان هەبێت (رضوان، ٢٠٠٠).

٣. زمان لەنێو سۆشیاڵ میدیادا: مەبەست لەو شێوە زمانە باوەیە، کە لەلایەن بەکارهێنەری کوردەوە لە ڕووی توانای گەیاندن و شێواز و ڕێنووس و ڕێزمانەوە بەکار دەبردرێت. بەڵام لێرە بایەخ بە لایەنی جواننووسی و ڕێزمان و خاڵبەندی نادرێت بەڵکو، تەنها باس لە شێوازی بەکارهێنانی لەنێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا دەکرێت.

٤. نووسینی کوردی بەشێوازی (FRANCO-ARABIC): مەبەست لەم شێوە نووسینە بریتییە لە نووسینی کوردی بەپیتی ئینگلیزی لەبری بەکارهێنانی ئەلفوبێی ئارامی (خۆمانەی کوردی)، لە نووسیندا سوود لە ئەلفوبێی عەرەبی و (FRANCO-ARABIC) وەرگیراوە(خضر، ٢٠١٤).

## بەشی دووەم: زمان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا و کاریگەریی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەسەر زمانەوە:

### یەکەم: زمان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا لە ڕووی بنەما و پێکهاتە و بەکارهێنانییەوە:

نەبوونی ڕێنووسێکی یەکگرتوو و سەربەخۆ بۆ زمانی کوردی، بۆتە هۆکاری ئەوەی، کە داتایەکی ورد و تەواو لەبارەی واقیعی زمانی کوردییەوە لەنێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا بەردەست نەبێت، چونکە زۆربەی ئامارەکان بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەڕووی زمانەوە لەسەر بنەمای زمانی بەکارهاتووی بەکارهێنەرانەوە ئەنجام دەدرێت. بۆیە لەم ئامارانەدا بەردەوام زمانی کوردی لەگەڵ ئامارەکانی زمانی عەرەبی یان ئینگلیزی هەژمار دەکرێت. بەڵام بەپشتبەستن بە میتۆدی تێبینیکردن و سەرنجدان دەکرێت بە چەند ئەنجامێک بگەین سەبارەت بەواقیعی زمانی کوردی لەڕووی بنەما و شێوازی بەکارهێنانەوە لەنێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا:

١. ڕێژەیەکی بەرچاو لە بەکارهێنەری کوردزمان ڕووپەڕی (Interface) تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەزمانێکی دیکەی وەک: (ئینگلیزی، عەرەبی یان زمانی دیکە) بەکاردەهێنن.

٢. هاوکات لەگەڵ ئەلفوبێی ئارامی (خۆمانەی کوردی)، لە نووسیندا سوود لە ئەلف و بێی زمانەکانی ئینگلیزی و عەرەبی و «Franco-Arabic»ش وەردەگیرێت و تێکەڵکردنی وشەی بیانی لەیەک نووسین، دیسان بۆ بەکارهێنەران زۆر باوە.

٣. ئەو زمانەی لە نووسینی دەقەکاندا بەکاردێت، زیاتر زمانێکی سادەی ئاخاوتنی گشتییە، نەک زمانێکی پاراوی نووسین. چونکە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ڕەنگدانەوەی دەربڕینی خودیی هاووڵاتی ڕۆژنامەنووسە ئاساییەکانە (Herring, 2007).

٤. لە نووسینی سەرنج و بابەتە ڕەخنەییەکاندا، زمانی بەکارهاتوو زیاتر بە شێوازێکی هەڵچوون و زبر و توند دەردەکەوێت، کەمتر نەرمی و هێمنی پێوە دیارە.

**دووەم: کاریگەریی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەسەر زمانی کوردییەوە:**

هەموو دەسکەوتێکی زانستی و تەکنەلۆژی گوزارشت لەگۆڕانێکی کۆمەڵایەتی دەکات لە ژیانی گشتیدا، پێش شۆڕشی پەیوەندییەکان، بەتایبەتی تەلەفزیۆن و سەتەلایت و ئینتەرنێت و ئای پاد و مۆبایلە زیرەکەکان ژیان جۆرێکی تر بوو، دوای ئەم داهێنانانە پەیوەندیی مرۆڤ بەیەکتری و بەکۆمەڵگەوە، بەدەزگاکانەوە، شێوازی هەڵسوکەوتمان لەگەڵ زانیارییەکان و تەنانەت فەزای ڕۆژنامەوانی و شێوازی پێکەوە گرێدانی بەدونیا و بەناوەندەکانی هەواڵ و زانیارییەوە گۆڕانی ریشەیی بەسەردا هاتووە، لەلایەک دەتوانین بەلێشاو، بێسنوور دەستمان بەزانیارییەکان بگات، بەڵام لەلایەکی ترەوە ئەگەری زانیاریی ساختە و خۆ ونکردن لە ناوەندەکانی تۆڕی ئینتەرنێت و ناوەندەکانی پەیوەندیکردنی ئەم سەردەمە ئەگەرێکی زۆر بەهێزە، بەتایبەتی بۆ ئەو کۆمەڵگەیەی کە هۆشیاریی گشتی نزمە و هاوکات هێشتا نۆرم و بەها کۆمەڵایەتییەکان مرۆڤی لە پاشکۆی خۆیدا بەستۆتەوە بەگشتەوە.

تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان وەکو ناوەکەی گوزارشتی لێدەکات ناوەندێکی ئێجگار کراوەی ئاوەڵایە بەڕووی دەرەوەدا، ناوەندێکە، کە بێسنوور پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەتوانن یەکتری ببڕن و پەیامەکان بە بەرچاوانەوە بن و تەنانەت ببێتە ناوەندێک بۆ گێڕانی ململانێی سیاسی و تەنانەت تەنگ پێهەڵچنین و جنێودانیش، بۆیە زۆرجار دەبیستین لەکاتی ناوهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان وەک خزمەتگوزارییەکی بواری ئینتەرنێتی، باس لەکاریگەرییە نەرێنییەکانیشی دەکرێت و وەک نەخۆشییەکی مەترسیداریش باسی لێوە دەکرێت، هەندێ توێژینەوەش ئاماژە بەوە دەکەن کە لەئێستادا نەخۆشی ئالوودەبوونی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان وەک نەخۆشییەکی تازەی کۆمەڵایەتی لەجیهاندا

ســـەری هەڵــداوە، ئەم زیانـــانەش بــۆ خــراپ بەکارهێنـــانی تــۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەن بەشداربووانەوە دەگەڕێنەوە بەجۆرێک تۆڕە کۆمەڵایەتییەکــان دابڕانــی کــۆمەڵایەتی دروســتکردووە، پــێچەوانەی زیانەکــانی تــۆڕە کۆمەڵایەتییەکــان پســپۆڕانی بــواری کۆمەنیکەیشــن پێیــانوایە کە تــۆڕە کۆمەڵایەتییەکــان توانیــویەتی کــاریگەریی ئەرێنــی دروست بکات و ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە لەنێوان گەل و نەتەوە و کەلتــوور و ئــایینە جیاوازەکانــدا پتەوتــر بکــات و ببێــتە پردێکــی لێکتێگەیشـتن بـۆ ڕەخسـاندنی کەشـێکی تەندروسـت بـۆ دروسـتبوونی دیالۆگ و حاڵیبوون لەنێوان نەتەوە زۆر و زەبەندەکانی دنیادا.

ئەوەی تـا ئێسـتا هەسـتی پێکـراوە، بەپێـی میتـۆدی سـەرنجدان و تێبینیکـردن سۆشـیاڵ میـدیا کـاریگەریی ڕاسـتەوخۆ و ناڕاسـتەوخۆیان لەسەر زمانیش کردووە، کە دەکرێت لە چەند خاڵێکدا پۆلێنیان بکەین:

١. بایەخ نەدان بە ڕێنووس و ڕێزمان و خاڵبەندی لەکاتی نووسیندا، ئاسـتی وشـیاری یـان زمـانزانینی بەکـاربەر پیشـان دەدات، کە هەسـت دەکرێـت زۆربەی کـات لە نەزانینێتـی نەک لە پشتگوێخسـتن، بـۆیەش زۆرجـــار دەقەکـــان لە ڕووی زمـــانەوانی و ڕێنـــووس و ڕێزمـــان و خاڵبەندییەوە لە ئاستێکی زۆر لاوازدا دەردەکەون (Afraoui, 2014).

٢. بە ئاسایی وەرگرتنی بەکارهێنانی ئەلف و بێی ئینگلیزی و لاتینی لە نووسینی کوردیدا لەبری ئەلف و بێی ئارامی (خۆمانەی کوردی).

٣. تـۆڕە کۆمەڵایەتییەکـان بەرەو گـۆڕینی ئاراسـتەی ڕۆشـنبیریی مرۆیی هەنگاو دەنێت، لە ڕۆشنبیریی وشە و نووسینەوە بۆ ڕۆشنبیریی وێنە.

٤. بایەخــدان بە کــورتبڕی لە نووســین و دەربڕینــدا، ئەمەش لە ئەنجـــامی کـــاریگەریی ئەو جـــۆرە خـــوێنەرەوەیە، کە شـــێوازی خوێندنەوەیان لە سەردێڕ و پەرەگرافێک تێناپەڕێت.

٥. تۆڕە کۆمەڵایەتییەکـان بـووەتە ئـامرازێکی کـاریگەر بـۆ دەربـڕین، بەدەر لە نـاوەرۆک و قـووڵیی زمـانەوانی و هـزری. واتە ئاشـنابوون

لەبەکارهێنــانی زمــانێکی زبــری نەشــیاو لەکــاتی گوزارشــتکردن و ڕەخنەگرتندا(Al-Fawaz, 2014).

٦. سۆشیاڵ بووەتە هۆکارێک، کە هەموو کەس بتوانێت بە ئاسانی ڕای خۆی دەربڕێت واتە ڕەخساندنی فەزایەک بۆ بەکارهێنەرەکان بەجۆرێک کە هەموو کەس پێیوایە توانای نووسینی هەیە «وەهمی نووسیاری».

٧. ڕەنگە یان بەدوور نازانرێت، لەداهاتوودا تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ببێتە خاڵی وەرچەرخان بۆ شێوازی نووسین ودەربڕین بەجۆرێک، کە ئەم شێواز و مۆدێلە لە نووسیندا ببێتە ستانداریک لە هەموو بوارەکانی نووسیندا.

**بەشی سێیەم: لایەنی مەیدانیی توێژینەوەکە:**

**یەکەم: جۆری توێژینەوە و سامپڵی توێژینەوەکە:**

**٣-١-١ جۆری توێژینەوەکە:** توێژینەوەیەکی وەسفی میتۆدی ڕاپێوی کۆمەڵایەتییە، (بەشێوەیەکی گشتی دوو جۆر ڕاپێوی کۆمەڵایەتی هەیە) ئەوانیش: ڕاپێوی کۆمەڵایەتیی گشتگیری، ڕاپێوی کۆمەڵایەتی بەڕێگەی وەرگرتنی نموونە سروشتی ئەم توێژینەوەیە وای خواست کە ڕێگەی ڕاپێوی وەرگرتنی نموونە بەکاربهێنرێت. بۆ گەیشتنە ئەنجامێکی گونجاوی باوەڕپێکراو.

**٣-١-٢ کۆمەڵگە و سامپڵی توێژینەوەکە:** کۆمەڵگەی توێژینەوەکە شاری هەولێرە و سامپڵی توێژینەوەکە قوتابیانی زانکۆی سەلاحەدین کۆلێژی ئەدەبیات، توێژەران نموونەی هەرەمەکی بەئەنقەستیان وەرگرتووە و بۆ دەستنیشانکردنی قەبارەی نموونەی توێژینەوەش پێویستە قەبارەی کۆمەڵگەی توێژینەوە زانراو بێت، کە سەرەتا ئاماری سەرجەم قوتابیانی کۆلێژی ئەدەبیات وەرگیراوە، پاشان ڕێژەی کوڕ و کچ لەیەک جیا کراونەتەوە، ئینجا بەشێوەی هەڕەمەکی لە هەربەشێکی

کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدیندا دە قوتابی پێنجی ڕەگەزی نێر و پێنجی ڕەگەزی مێ وەرگیراوە.

**٣-١-٣ بوارەکانی توێژینەوە:** بۆ هەر توێژینەوەیەکی زانستی، بوارەکانی توێژینەوە لە سێ خاڵدا کورت دەبێتەوە، کە پێویستییەکی گرنگی لێکۆڵینەوەیە، ئەوانیش:

أ – بواری شوێن: مەبەست لە بواری شوێن ناوچە جوگرافییەکەیە کە توێژینەوەکەی تێدا کراوە (زانکۆی سەلاحەدین - کۆلێژی ئەدەبیات) وەرگیراوە.

ب- بواری مرۆیی: قوتابیانی زانکۆی سەلاحەدین، کۆلێژی ئەدەبیات بەهەردوو ڕەگەز بەشێوەیەکی هەڕەمەکی وەرگیراوە. لە هەر بەشێکی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین دە قوتابی وەرگیراوە، پێنجی ڕەگەزی نێر و پێنجی ڕەگەزی مێ. هەشتا فۆرم دابەشکراوە.

ج- بواری کات: بریتییە لەو ماوە زەمەنییەی کە کارە مەیدانییەکانی تێدا ئەنجامدراوە، کارە مەیدانییەکانی ئەم توێژینەوەیە لەساڵی ٢٠١٨دا ئەنجام دراون.

**٣-١-٤ ئامرازی توێژینەوە:**

١- سەرچاوەی کتێب:

٢- ئامرازی کۆکردنەوەی زانیاری و فۆرمی ڕاپرسی: توێژەران هەڵساون بە دابەشکردنی فۆرمی ڕاپرسی بەمەبەستی دەستکەوتنی زانیاری کە سەرەکیترین ئامرازە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لە زانستە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکاندا، لێرەدا کۆمەڵێک پرسیاری تایبەت بە توێژینەوەکە لەلایەن توێژەرانەوە خراونەتەڕوو، وەڵامدەدرێتەوە بەمەبەستی گەیشتن بە ئامانجی توێژینەوەکە، لەپێناو بونیاتنانی پرسیارەکانی فۆرمی ڕاپرسی توێژینەوەکە توێژەران هەڵساون بە ئەنجامدانی چەند هەنگاوێکی سەرەکی لەوانەش خوێندنەوە و پێداچوونەوەی سەرچاوەی زانستی پەیوەست بەبابەتی توێژینەوە و پێداچوونەوەی توێژینەوەکانی پێشوو، پرسیارکردن لەچەند کەسێکی

شارەزا لەم بوارە و پاشان توێژەران هەستاون بە ئامادەکردنی پێوەری توێژینەوەکە کە لە دوولایەن پێکهاتووە: لایەنی یەکەم: روونکارییە پێویستییەکانە و لایەنی دووەم: پرسیارەکانی پەیوەست بە توێژینەوەکەیە. لەم فۆرمەدا توێژەران نۆزدە پرسیار دەکەن کە سەرجەمیان داخراون تەنها سێ پرسیاری کراوەن، پرسیارەکانی فۆرمەکەش بەمەبەستی کۆکردنەوەی زانیاری و دەستکەوتنی وەڵامە لەلایەن قوتابیانەوە. لەپاشکۆی توێژینەوەکەدا فۆرمەکە خراوەتەڕوو.

٣- کەرەستەی ئامارییەکان: سیستەمی کۆمپیوتەر بەرەو پێشچوونێکی خێراو گرنگی لەخۆگرتووە، لەچوارچێوەی ئەو پێشکەوتنە، زانستە کۆمەڵایەتییەکان سوودیان وەرگرتووە بۆ کۆکردنەوەی زانیاری و گۆڕینیان بۆ شێوەی داتا، پێویستییان بەوە هەیە کەرەستەی ئاماری بەکاربهێنن بۆ تێگەیشتن لە راستی و حەقیقەتی ئەنجامەکان و داتای ژمارەکان، لەبەر ئەوەی لە وەڵامی فۆرمێکی ڕاپرسی ناگەین ئەگەر نەیگۆڕینە سەرشێوەی داتا. بۆیە لەکاتی شیکردنەوەی فۆرمی پرسیارەکان ئاوێتەی ڕێژەی سەدی بەکارهاتووە بۆ وەڵامی سەرجەم پرسیارەکان بەم شێوەیەی خوارەوە.

ڕێژەی سەدی = دووبارە بوونەوە / ژمارەی فۆرمەکان × ١٠٠

**دووەم: خستنەڕووی خشتە و پێنوێنەکان و ڕێژەی سەدییان:**

لە پێناو گەیشتن بە ئامانجی توێژینەوەکە، توێژەران لە ڕێگەی چاوپێکەوتن لەگەڵ قوتابیانی سەرجەم بەشەکانی کۆلێژی ئاداب/ زانکۆی سەڵاحەدین؛ ئامادەکردنی فۆرمی ڕاپرسی کە (١٩) پرسیاری لەخۆگرتبوو، پاش دابەشکردنی فۆرمەکان بەسەر سامپڵی لێتوێژراودا و کۆکردنەوەی داتاکان و شەنوکەوکردنی داتاکان، توێژەران بەم ئەنجامانە گەیشتن:

یەکەم/ ڕوونکارییە پێویستەکان:

**خشتەی (١)**

**دابەشبوونی نموونەی توێژینەوە بەپێی بەشەکانی کۆلێژی ئاداب**

| بەش | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% |
|---|---|---|
| مێژوو | ١٠ | %١٢.٥ |
| جوگرافیا | ١٠ | %١٢.٥ |
| کۆمەڵناسی | ١٠ | %١٢.٥ |
| کاری کۆمەڵایەتی | ١٠ | %١٢.٥ |
| فەلسەفە | ١٠ | %١٢.٥ |
| دەروونزانی | ١٠ | %١٢.٥ |
| ڕاگەیاندن | ١٠ | %١٢.٥ |
| شوێنەوار | ١٠ | %١٢.٥ |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ |

**خشتەی (٢)**

**دابەشبوونی نموونەی توێژینەوە بەپێی ڕەگەز**

| **ڕەگەز** | **دووبارەبوونەوە** | **ڕێژەی سەدی%** |
|---|---|---|
| نێر | ٤٠ | %٥٠ |
| مێ | ٤٠ | %٥٠ |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ |

**خشتەی (٣)**

**دابەشبوونی نموونەی توێژینەوە بەپێی تەمەن**

| **تەمەن** | **دووبارەبوونەوە** | **ڕێژەی سەدی%** | **پلەبەندی** |
|---|---|---|---|
| ١٨-٢٢ | ٥١ | %٦٣.٧ | یەکەم |
| ٢٣-٢٧ | ٢٤ | %٣٠ | دووەم |
| ٢٨ و بەرەوژوور | ٥ | %٦.٢ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (٤)**

**دابەشبوونی نموونەی توێژینەوە بەپێی ڕادەی سەرنجڕاکێشی فەیسبووک**

| ڕادەی سەرنجڕاکێشان | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ١٢ | %١٥ | سێیەم |
| زۆر | ٢٨ | %٣٥ | یەکەم |
| نازانم | ٢٧ | %٣٣.٧ | دووەم |
| کەم | ٩ | %١١.٢ | چوارەم |
| ئێجگار کەم | ٤ | %٥ | پێنجەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (٥)**

**دابەشبوونی نموونەی توێژینەوە بەپێی ژمارەی کاتژمێرەکانی بەکارهێنانی فەیسبووک**

| کاتژمێری بەکارهێنانی فەیسبووک | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ١-٣ | ٢٠ | %٢٥ | دووەم |
| ٤-٦ | ٤٨ | %٦٠ | یەکەم |
| زیاتر لە ٦کاتژمێر | ١٢ | %١٥ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (٦)**

**کاریگەری فەیسبووک کە هەموو کەس بتوانێ بەئاسانی ڕای خۆی دەرببڕێت و سەرنج لەسەر ڕای ئەوانیتر بدات؟**

| ئاستی دەربڕینی بیروڕاکان | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ٣٦ | %٤٥ | یەکەم |
| زۆر | ١٢ | %١٥ | سێیەم |
| نازانم | ٤ | %٥ | چوارەم |
| کەم | ٢٥ | %٣١.٢ | دووەم |
| ئێجگار کەم | ٣ | %٣.٧ | پێنجەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (٧)**

**راگەیاندنی کۆمەڵایەتی ڕەنگدانەوەی دەربڕینی خودی هاوولاتییە**

| ئاستی دەربڕینی خودی هاوڵاتی | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ٣٩ | %٤٨.٧ | یەکەم |
| زۆر | ٣٠ | %٣٧.٥ | دووەم |
| نازانم | ٣ | %٣.٧ | چوارەم |
| کەم | ٧ | %٨.٧ | سێیەم |
| ئێجگار کەم | ١ | %١.٢ | پێنجەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**دووەم/ پرسیارەکانی پەیوەست بە بابەتەکەوە:**

**خشتەی (٨)**

**کاریگەری راگەیاندنی کۆمەڵایەتی بەسەر زمانی کوردییەوە**

| ئاستی کاریگەری بەسەر زمانی کوردی | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ١٢ | %١٥ | سێیەم |
| زۆر | ٢٨ | %٣٥ | دووەم |
| نازانم | ٣٢ | %٤٠ | یەکەم |
| کەم | ٦ | %٧.٥ | چوارەم |
| ئێجگار کەم | ٢ | %٢.٥ | پێنجەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (٩)**

**بەکارنەهێنانی زمانی کوردی لەلایەن هەندێ بەکارهێنەری کوردەوە لە فەیسبووک نیشانەی خۆ بەکەمزانینە و بەکەمزانینی زمانی کوردییە**

| ئاستی بەکارنەهێنانی زمانی کوردی و رەنگدانەوەی نەرێنی | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ١٨ | %٢٢.٥ | دووەم |
| زۆر | ١٢ | %١٥ | چوارەم |

| نازانم | ١٧ | ٢١.٢% | سێیەم |
|---|---|---|---|
| کەم | ٣٠ | ٣٧.٥% | یەکەم |
| ئێجگار کەم | ٣ | ٣.٧% | پێنجەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | ١٠٠% | |

**خشتەی (١٠)**

**شێوازی زمانی بەکارهاتوو لە نێو میدیای کۆمەڵایەتیدا**

**لە رووی بنەما و پێکهاتە و بەکارهێنانییەوە**

| ئاستی ئاشنابوون بەزمانی بەکارهاتوو | دووبارەبوونەوە | رێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ٢٧ | ٣٣.٧% | دووەم |
| زۆر | ٣٩ | ٤٨.٧% | یەکەم |
| نازانم | ١ | ١.٢% | پێنجەم |
| کەم | ٣ | ٣.٧% | چوارەم |
| ئێجگار کەم | ١٠ | ١٢.٥% | سێیەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | ١٠٠% | |

**خشتەی (١١)**

**رووپەڕی (Interface) میدیای کۆمەڵایەتی لەلایەن بەکارهێنەری کوردزمان**

| رووپەڕی (Interface) میدیای کۆمەڵایەتی | دووبارەبوونەوە | رێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| زمانی ئینگلیزی | ٢٤ | ٣٠% | دووەم |
| زمانی عەرەبی | ٢٩ | ٣٦.٢% | یەکەم |
| زمانی تورکی(لاتینی) | ١٥ | ١٨.٧% | سێیەم |
| زمانی دیکە | ٥ | ٦.٢% | پێنجەم |
| زمانی کوردی ناوەڕاست | ٧ | ٨.٧% | چوارەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | ١٠٠% | |

**خشتەی (١٢)**

**لەگەڵ بەکارهێنانی ئەلف و بێی ئارامی (خۆمانەی کوردی). لە نووسیندا سوود لە ئەلف و بێی زمانەکانی عەرەبی و «Franco-Arabic» وەرگیراوە**

| ئاستی سوودمەندبوون لە ئەلف و بێی زمانەکانی عەرەبی | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ٣٥ | %٤٣.٧ | یەکەم |
| زۆر | ٢٧ | %٣٣.٧ | دووەم |
| نازانم | ١ | %١.٢ | پێنجەم |
| کەم | ١٢ | %١٥ | سێیەم |
| ئێجگار کەم | ٥ | %٦.٢ | چوارەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (١٣)**

**لەگەڵ بەکارهێنانی ئەلف و بێی ئارامی (خۆمانەی کوردی). لە نووسیندا سوود لە ئەلفوبێی لاتینی وەرگیراوە**

| ئاستی سوودمەندبوون لە ئەلفوبێی لاتینی | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ٤١ | %٥١.٢ | یەکەم |
| زۆر | ٢٥ | %٣١.٢ | دووەم |
| نازانم | ٢ | %٢.٥ | چوارەم |
| کەم | ١١ | %١٣.٧ | سێیەم |
| ئێجگار کەم | ١ | %١.٢ | پێنجەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (١٤)**

**ئەلفابێتای بەکارهێنراو لەکاتی نووسینی پۆست و کۆمێنت**

| جۆری بەکارهێنانی ئەلفابێتا | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئەلفابێتای کوردی ئارامی | ١٩ | %٢٣.٧ | سێیەم |
| ئەلفابێتای عەرەبی | ٢١ | %٢٦.٢ | دووەم |
| ئەلفابێتای(فرانکۆ-ئەرەبیک) | ٣٧ | %٤٦.٢ | یەکەم |
| هی دیکە | ٣ | %٣.٧ | چوارەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (١٥)**

**تێکەڵکردنی وشەی بیانی لەیەک نووسین لەناو بەکارهێنەراندا**

| ڕادەی بەکارهێنانی وشەی بیانی لەناو نووسین | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ٣١ | %٣٨.٧ | یەکەم |
| زۆر | ٢٧ | %٣٣.٧ | دووەم |
| نازانم | 6 | %٧.٥ | چوارەم |
| کەم | 3 | %٣.٧ | پێنجەم |
| ئێجگار کەم | ١٣ | %١٦.٢ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (١٦)**

**زمانی نووسینی دەقەکان، زمانێکی سادەی ئاخاوتنی گشتییە**

| ئاستی سادەیی زمان | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ٢٠ | %٢٥ | سێیەم |
| زۆر | ٢٤ | %٣٠ | یەکەم |
| نازانم | ٥ | %٦.٢ | پێنجەم |
| کەم | ٢٢ | %٢٧.٥ | دووەم |
| ئێجگار کەم | ٩ | %١١.٢ | چوارەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (١٧)**

**زمانی نووسینی دەقەکان، وەک زمانێکی پاراوی نووسین**

| ئاستی پاراوی نووسین | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ٩ | %١١.٢ | چوارەم |
| زۆر | ٢٠ | %٢٥ | دووەم |
| نازانم | ٧ | %٨.٧ | پێنجەم |
| کەم | ٣٣ | %٤١.٢ | یەکەم |
| ئێجگار کەم | ١١ | %١٣.٧ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (١٨)**

**بایەخدان بە ڕێنووس و ڕێزمان و خاڵبەندی لەکاتی نووسیندا، ئاستی هۆشیاری یان زمانزانینی بەکارهێنەر پیشاندەدات**

| ئاستی هۆشیاری بەکارهێنەر لە بایەخدان بەڕێنووس | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ٨ | %١٠ | پێنجەم |
| زۆر | ١٠ | %١٢.٥ | چوارەم |
| نازانم | ٢٠ | %٢٥ | دووەم |
| کەم | ٢٧ | %٣٣.٧ | یەکەم |
| ئێجگار کەم | ١٥ | %١٨.٧ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**خشتەی (١٩)**

**تا چەند راگەیاندنی کۆمەڵایەتی بووەتە ئامرازێکی کاریگەر بۆ دەربڕین، بەدەر لە ناوەڕۆک و قووڵیی زمانەوانی و هزری؟**

| ئاستی کاریگەری راگەیاندنی کۆمەڵایەتی | دووبارەبوونەوە | ڕێژەی سەدی% | پلەبەندی |
|---|---|---|---|
| ئێجگار زۆر | ٤٨ | %٦٠ | یەکەم |
| زۆر | ٢٧ | %٣٣.٧ | دووەم |
| نازانم | ٠ | %٠ | پێنجەم |
| کەم | ١ | %١.٢ | چوارەم |
| ئێجگار کەم | ٤ | %٥ | سێیەم |
| کۆی گشتی | ٨٠ | %١٠٠ | |

**ئەنجام**

لەکۆتایی توێژینەوەکە توێژەران بەم ئەنجامانەی خوارەوە گەیشتن:

١- ڕێژەیەکی بەرچاو لە بەکارهێنەری کوردزمان ڕووپەڕی (Interface) تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان بەزمانێکی دیکەی وەک: (ئینگلیزی، عەرەبی یان زمانی دیکە) بەکاردەهێنن.

٢- ڕێژەیەکی بەرچاو لە بەکارهێنەری کوردزمان هاوکات لەگەڵ ئەلفوبێی ئارامی (خۆمانەی کوردی)، لە نووسیندا سوود لە ئەلف و بێی زمانەکانی ئینگلیزی و عەرەبی و «Franco-Arabic»ش وەردەگیرێت و تێکەڵکردنی وشەی بیانی لەیەک نووسین، دیسان بۆ بەکارهێنەران زۆر باوە.

٣- ئەو زمانەی لە نووسینی دەقەکاندا بەکاردێت، زیاتر زمانێکی سادەی ئاخاوتنی گشتییە، نەک زمانێکی پاراوی نووسین. چونکە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان ڕەنگدانەوەی دەربڕینی خودیی هاووڵاتی ڕۆژنامەنووسە ئاساییەکانە.

٤- لە نووسینی سەرنج و بابەتە ڕەخنەییەکاندا، زمانی بەکارهاتوو زیاتر بە شێوازێکی هەڵچوون و زبر و توند دەردەکەوێت، کەمتر نەرمی و هێمنی پێوە دیارە.

٥- بەشی هەرە زۆری لێتوێژراوان (قوتابیانی کۆلێژی ئەدەبیات) ٤-٦ کاتژمێر فەیسبووک بەکاردێنن.

٦- بەشی هەرە زۆری قوتابیان ئاشنان بە شێوازی زمانی بەکارهاتوو لە فەیسبووک.

**ڕاسپاردەکان:**

١-توێژەران بە پێویستی دەزانن بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان زیاتر بایەخ بەزمانی کوردی و ڕێنووسی کوردی بدرێت. ئەمەش لەڕێگەی ئەنجامدانی هەڵمەتی هۆشیارکردنەوە بۆ بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان.

٢-هۆشداری بدرێتە کۆمپانیاکانی دابینکردنی هێڵی ئینتەرنێت. تاوەکو سیستمی هێڵی ئینتەرنێتەکانیان بەجۆرێک ڕێکبخەن کاتێ بەشداربوویەکی کوردزمان فەیسبووکەکەی دەکاتەوە. ڕاستەوخۆ ڕووپەڕەکەی بەزمانی کوردی بکرێتەوە.

٣-ئەنجامدانی توێژینەوەی دیکەی بەرفراوانتر بۆ زیاتر ئاشنابوون بە شێوازی زمانی بەکارهاتوو لەنێو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا لە ڕووی بنەما و پێکهاتە و بەکارهێنانییەوە.

٤-ئەنجامدانی هەڵمەتی بەرفراوانی هاوشێوەی (هاش تاگ) بۆ ئەوەی بەکارهێنەرانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی ئەلفوبێی کوردی بەکاربێنن لەکاتی نووسینی پۆست و کۆمێنتدا.

**سەرچاوەکان**


١. جمال سند السويدي: وسائل التواصل الاجتماعي ودورها في التحديات المستقبلية: من القبيلة إلى الفيسبوك وسائل التواصل الاجتماعي ودورها في التحديات المستقبلية، مركز الإمارات للدراسات والبحوث الاستراتيجية، ٢٠١٣، ص ١٦.

(٢) هەردەوان مەحموود: میدیای نوێ و کاریگەرییەکانی، بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی پرسی میدیا، ٢٠١٥.

The Arabic chat alphabet (alternatively the Franco-Arabic alphabet, or 'Arabizi' عربيــزى) https://www.iwillteachyoualanguage.com/blog/arabic-chat-alphabet

(١) محمد زكي خضر وآخرون: رصد واقع اللغة العربية في ميدان التواصل على شبكة الإنترنت والهاتف المحمول. الجامعة الاردنية. ٢٠١٤ .

**سەرچاوەکان:**

**یەکەم: بەزمانی کوردی**


١. هەردەوان مەحموود: میدیای نوێ و کاریگەرییەکانی، بڵاوکراوەکانی ڕێکخراوی پرسی میدیا، ٢٠١٥ .


**دووەم: بەزمانی عەرەبی**


٢. كولماس فلوريان: اللغة والاقتصاد، ترجمة: أحمد عوض، مراجعة: عبدالسلام رضوان. المجلس الأعلى للثقافة والفنون، الكويت، سلسلة اعلام المعرفة، ع٢٦٣، شعبان ١٤٢١هـ - نوفمبر/تشرين الثاني، ٢٠٠٠.

٣. محمد زكي خضر وآخرون: رصد واقع اللغة العربية في ميدان التواصل على شبكة الإنترنت والهاتف المحمول، الجامعة الاردنية، ٢٠١٤ .


**سێیەم: بەزمانی ئینگلیزی**


4. Brenda Danet. Susan C. Herring. The Multilingual Internet: Language. Culture. and Communication Online. Oxford University Press. 2007.
5. Fathi Arfaoui. Percentage of Internet Content for users by Language.
6. NADIA AL-FAWAZ. Purists alarmed at increasing popularity of Franco-Arabic. Published — Friday 26 December 2014.

# پاشکۆ

## فۆرمی ڕاپرسی

**پاش سڵاو و ڕێز:**

**قوتابی بەڕێز، توێژەران بە نیازن توێژینەوەیەك ئەنجام بدەن بەناونیشانی (کاریگەری بەکارهێنانی سۆشیاڵ میدیا (Social Media) لەسەر زمانی کوردی، فەیسبووک بەنموونە) وەڵامدانەوەی دروستی پرسیارەکان مایەی خزمەتکردنە بەبواری زانستی.**

**یەکەم/ ڕوونکارییە پێویستەکان**

**١- کۆلێژ: ئەدەبیات بەش: مێژوو ( ) جوگرافیا ( ) کۆمەڵناسی ( ) ( ) شوێنەوار ( ) کاری کۆمەڵایەتی ( ) فەلسەفە ( ) دەروونزانی ( ) ڕاگەیاندن ( )**

**٢- ڕەگەز: نێر ( ) مێ ( )**

**٣- تەمەن: ١٨-٢٢ ( ) ٢٣-٢٧ ( ) ٢٥- بەرەو ژوور ( )**

**٤- تا چەند تۆڕی گەیاندنی کۆمەڵایەتی ، بەتایبەت (فەیسبووك) سەرنجت ڕادەکێشێ؟**

**ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) کەم ( ) ئێجگار کەم ( )**

**٥- لە شەو و ڕۆژێکدا چەند کاتژمێر فەیسبووك بەکاردەهێنی؟**

**١-٣ کاتژمێر ( ) ٤-٦ کاتژمێر ( ) زیاتر لەشەش کاتژمێر ( )**

**٦- پێتوایە ڕاگەیاندنی کۆمەڵایەتی بۆتە هۆکارێك، کە هەموو کەس بتوانێ بەئاسانی ڕای خۆی دەرببڕێت و سەرنج لەسەر ڕای ئەوانیتر بدات؟**

**ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) کەم ( ) ئێجگار کەم ( )**

**٧- تا چەند پێتوایە ڕاگەیاندنی کۆمەڵایەتی ڕەنگدانەوەی دەربڕینی خودی هاوڵاتییە؟**

**ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) کەم ( ) ئێجگار کەم ( )**

**دووەم/ پرسیارەکانی پەیوەست بە بابەتەکەوە:**

**١- پێتوایە ڕاگەیاندنی کۆمەڵایەتی کاریگەری هەبووە بەسەر زمانی کوردییەوە؟**

**ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) کەم ( ) ئێجگار کەم ( )**

**٢- ئایا پێتوایە بەکارنەهێنانی زمانی کوردی لەلایەن هەندێ بەکارهێنەری کوردەوە لە فەیسبووك نیشانەی خۆ بەکەمزانینە و بەکەمزانینی زمانی کوردییە؟**

**ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) کەم ( ) ئێجگار کەم ( )**

**٣- تا چەند ئاشنای بە شێوازی زمانی بەکارهاتوو لە نێو میدیای کۆمەڵایەتیدا لە ڕووی بنەما و پێکهاتە و بەکارهێنانییەوە؟**

**ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) کەم ( ) ئێجگار کەم ( )**

**٤- تۆ وەك بەكارهێنەری كورد زمان ڕووكاری (Interface) میدیای كۆمەڵایەتی، بەزمانێكی دیكەی وەك: (ئینگلیزی) بەكاردەهێنی؟**

ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) كەم ( ) ئێجگار كەم ( )

**٥- تۆ وەك بەكارهێنەری كورد زمان ڕووكاری (Interface) میدیای كۆمەڵایەتی، بەزمانێكی دیكەی وەك (عەرەبی) بەكاردەهێنی؟**

ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) كەم ( ) ئێجگار كەم ( )

**٦- تۆ وەك بەكارهێنەری كورد زمان ڕووكاری (Interface) میدیای كۆمەڵایەتی بەزمانێكی دیكە بەكاردەهێنی؟ واتا بێ لە عەرەبی و ئینگلیزی؟ چونكە لە خاڵەكانی سەرەوە باسی عەرەبی و ئینگلیزی كراوە بۆ نموونە توركی، فارسی یان زمانیكی دیكە بەكاردەهێنی؟**

ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) كەم ( ) ئێجگار كەم ( )

**٧- لەگەڵ بەكارهێنانی ئەلف و بێی ئارامی (خۆمانەی كوردی)، لە نووسین سوودت لە ئەلف و بێی زمانەكانی عەرەبی و «Franco-Arabic» وەرگرتووە؟**

ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) كەم ( ) ئێجگار كەم ( )

**٨- لەگەڵ بەكارهێنانی ئەلف و بێی ئارامی (خۆمانەی كوردی)، لە نووسین سوودت لە ئەلف و بێی لاتینی وەرگرتووە؟**

ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) كەم ( ) ئێجگار كەم ( )

**٩- لەكاتی نووسینی پۆست و كۆمێنت كام ئەلفابێتا بەكاردێنی؟**

ئەلفابێتای كوردی ئارامی ( ) ئەلفابێتای عەرەبی ( ) ئەلفابێتای زانكۆ ( ) هی دیكە ( ).

**١٠- پێتوایە تێكەڵكردنی وشەی بیانی لەیەك نووسین لەناو بەكارهێنەراندا باوە؟**

ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) كەم ( ) ئێجگار كەم ( )

**١١- تا چەند پێتوایە ئەو زمانەی لە نووسینی دەقەكاندا بەكاردەبرێت، زمانێكی سادەی ئاخاوتنی گشتییە؟**

ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) كەم ( ) ئێجگار كەم ( )

**١٢- تا چەند پێتوایە ئەو زمانەی لە نوسینی دەقەكاندا بەكاردەبرێت، زمانێكی پاراوی نووسینە؟**

ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) كەم ( ) ئێجگار كەم ( )

**١٣- تا چەند بایەخدان بە ڕێنووس و ڕێزمان و خاڵبەندی لەكاتی نووسیندا، ئاستی هۆشیاری یان زمانزانینی بەكاربەر پیشاندەدات؟**

ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) كەم ( ) ئێجگار كەم ( )

**١٤. تا چەند راگەیاندنی كۆمەڵایەتی بووەتە ئامرازێكی كاریگەر بۆ دەربڕین، بەدەر لە ناوەرۆك و قووڵیی زمانەوانی و هزری؟**

ئێجگار زۆر ( ) زۆر ( ) نازانم ( ) كەم ( ) ئێجگار كەم ( )

## ملخص البحث

## تأثير استعمال (سوشيال ميديا) على اللغة الكوردية

التطورات المتواصلة للتكنولوجيا والاتصالات في جميع المجالات احدثت تغيرات ملحوظة حيث تم صياغة العديد من اللهجات ومفهوم جديد خاصة وفي احدى هذه المفاهيم الجديدة لسوشيال ميديا التي ظهرت من اواخر قرن العشرين. وبصورة عامة الغرض من سوشيال ميديا: طريق جديد للاتصال لترابط البشرية في انحاء العالم لكافة المجالات المختلفة بصورة سهلة والهدف منها السهولة في الاتصالات وزيادة العمل بها، وزيادة التفاعلية. سوشيال ميديا: هي عملية الاتصال والتواصل نتيجة تفاعل ثلاث عناصر اساسية والتي هي الكمبيوتر وشبكات التواصل وسائل الاعلام هذا البحث يأكد على لغة استخدام الفيس بوك والاهتمام بالمجال اللغوي والاملاء في الكتابة من قبل مستخدميها. تسعى لمعرفة الى أي درجة مستخدمي شبكات التواصل الاجتماعي يلتزمون مراعاة الاملاء والقواعد الخاصة باللغة الكوردية.

## Abstract

## The Impact of Using Social Media on Kurdish Language Facebook as sample

### A Descriptive Quantitative Study to a Sample of Students in College of Arts at Salahaddin University\ Erbil

A continuous development of technology and communication has been made extreme changes in many aspects. New concepts have been introduced; among them is `Social Media, which was developed by the end of the twentyth century

Social media is generally a novel way of communication where people are easily connected all over the world, no matter where or when they are connected. The most magnificent purpose is the ease in communication and increasing the interactivity among people. Therefore, it can be outlined that Social Media is the process of interaction and communication that is produced through three main sources which are (Computer, Network and Multimedia)

This study emphasises on the language that is used by facebook users and deals with the alphabet and the linguistic aspects of writing in Facebook

# محەمەد ئەمین زەکی و خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان

## (خوێندنەوەیەکی خێرا)

**محەمەد حەمەباقی**

ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی

محەمەد ئەمین زەکی (١٨٨٠ — ١٩٤٨) سەرەتای (کوردی) نووسینی، بە شیعر دەستی پێکردووە، لەم بارەیەوە (پیرەمێرد: ١٨٦٧ — ١٩٥٠) دەڵێ: سەرەتای جونبوشی (محەمەد ئەمین زەکی) بە شیعر بوو. ئەووەڵ مەنظوومەی کە لە ئەستەمووڵ نیشانی منی دا، لەوانەبوو بەچاوەوە ببێ، ئاتەشین و ڕەنگین.. دوای ئەوەی کە (نەژاد)ی کوڕم لە جەزیرەی (هەگبەلی) هاتە دنیا، ئەو قەصیدەیەکی نووسیبوو. خالید ضیا و ئەکرەم بەگی ڕەجائی زادە زۆریان پەسەندکرد. بەڵام من زۆری لەگەڵ خەریك بووم، کە لەگەڵ شیعر خەریك نەبێ. قووەی تەحریری هەڵئەقرچێ. چاك بوو شوکر وازی لەو پیشە درۆزنەی ئەو سەردەمە هێنا و دەستی دایە عیلم و فەن[1].

هەڵبەتە دەبێ بزانین کە محەمەد ئەمین زەکی، لەبەر دڵ و لەسەر تکاو داخوازیی (پیرەمێرد)، دەستبەرداری شیعر نەبوو، چونکە وەك دواتر دەزانین، لەماوەیەکی کەمی تەمەنیدا، لە شارێکی بچووکی وەك شاری (سلێمانی)یەوە، چۆتە شاری بەغداد بۆ خوێندنی (سەربازیی) و لەوێوە بۆ خوێندنی باڵاتر بۆ ئەستەمووڵی ئەو ڕۆژگارەی ساڵانی (١٨٩٨)ی پایتەختی هەموو وڵاتانی ئیسلام و خاوەنی مێژوویەکی نزیکەی (٤٥٠) ساڵ دەوڵەتداریی و لەوێش پلەی سەربازیی بەرز و بەرزتر دەکرێتەوە و گەلێ فەرمان و کاری لەشکریی پێ دەسپێردرێ، کە پلە دوای پلە و کار دوای کار، چاوی بە شارانی تازە و دنیای تازە و ئەوەندە گەشەکردوودا دەکرێتەوە، کە تیایاندا ڕادەمێنێ و هەرگیز ناتوانێ لەگەڵ وڵاتە داگیرکراوە، دواکەوتووەکەی خۆیدا بەراوردی بکات.

هەر پێوەند لەگەڵ کاری سوپاییدا، ساڵی (١٩٠٧) لە ئەستەموول بۆتە ئەندامی (لیژنەی نەخشەدانان)، بۆ دانانی نەخشەی ئەستەموول و ساڵی (١٩٠٨) بۆتە ئەندامی (لیژنەی نەخشە و دیاریکردنی سنووری تورکی — رووسی) و ساڵی (١٩١٠) بۆتە ئەندامی لیژنەی دیاریکردنی سنووری (تورکیا — بولگاریا) و دوو ساڵ لەم کارەیدا ماوەتەوە و ساڵی (١٩١٢) لەکاتی هەڵایسانی جەنگی (بالکان)دا، رەوانەی ئەوێ کراوە و دواتر ساڵی (١٩١٣) لەگەڵ هەندێ ئەفسەردا، بۆ کاری سەربازیی بۆ فرەنسا نێردراوە و ماوەی ساڵێکی تێدا ماوەتەوە.. ساڵی (١٩١٤)ش کراوەتە ئەندامی لیژنەی دیاریکردنی سنووری تورکی — رووسی و دوای تەواوکردنی کاری ئەم لیژنەیە، چۆتە (بایەزید)، تفلیس) و هەر لەم سەروبەندەدا، جەنگی یەکەمی جیهانی دەست پێدەکات و لەوێوە زۆر بە دژواریی و بەرێگەی: باکۆ، رستۆف، مۆسکۆ، پیتروگراد، فنلند، سوید دا بۆ تورکیا گەڕاوەتەوە.. ساڵی (١٩١٤)، وەك ئەرکانێکی جەنگیی، لەتیپی (١)دا دامەزراوە و لەسەر داوای مارشاڵ (ڤۆندرگۆڵتس)یش ماوەی (٣) مانگ لە (ئەیا ستڤانۆس)دا ماوەتەوە، تا لە خولی فرۆکەوانیدا بەشداریی بکات و لە دووەمین ساڵی جەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٥)، پلەی سەربازیی بەرزتر کراوەتەوە و راستەوخۆ بەشداریی بەرەکانی جەنگی کردووە و بۆ ئەرکانی جەنگیی سوپای عێراق، بۆ (سەلمان پاك) گوێزراوەتەوە و لێرەش یەکسەر بەشداریی بەرەکانی جەنگی کردووە و هەر هەمان ساڵ لەسەر داوای (مستەفا کەمال — ئەتاتورك)ی فەرماندەی سوپا، کراوەتە یاریدەدەری سەرۆکی ئەرکانی جەنگ و بۆ (حەڵەب) و (فەلەستین) نێردراوە و ساڵانی (١٩١٧ — ١٩١٨)، تا ئەوکاتەی بۆ سوپای (٣)ی سەر سنووری قەفقاسیا گوێزراوەتەوە، لەبەرەکانی جەنگدا بووە. لە کۆتایی هەمان ساڵدا بۆ (بەشی مێژووی جەنگ) گوێزراوەتەوە. هەموو ئەم کارانەیشی بەر لەوە ئەنجامداون، کە لە (٢٤ تەمووزی ١٩٢٤)دا، بەیەکجاریی بۆ وڵاتی (عێراق) گەڕاوەتەوە.

ئەم کار و ئەرکە زۆرەی لەماوەیەکی کەمی ژیانیدا، لە شاران و وڵاتانی جیاجیا و پێشکەوتووی دنیادا دیونی و لە پلەوپایەی هەستیار و باڵادا، لە ئەستۆی گرتن و بوونە مایەی ئەوەی ناسیاویی زۆرتر لەگەڵ گەورە پیاوانی جیهان و سیاسەتمەداران و گەورە فەرماندەی سەربازیی و دیپلۆماسی دەوڵەتانی:

توركیا، ئێران، رووسیا، فرەنسا، بولگاریا، ئەلمانیا، سوید دا پەیدا بكات و زمانی زۆریشیان فێر ببێ.. هەمووو ئەمانەش، دید و جیهانبینی و رۆحی ناسك و شاعیرانەی (محەمەد ئەمین زەكی)یان لە گەڕەكی (گۆیژە)ی ساكار و سادەی (سلێمانی)ی زێدەوە، بەرەو ئاسۆی فراوانتر و لێكدانەوە و بیركردنەوەی قووڵ و كراوەتر رێنوێنی كردووە و ئەو چەندین بەرنامە تازە و ئەركە هەمەجۆرە دیپلۆماسییەی لە نزیكەوە تیایاندا ژیاو راستەوخۆ ئەزموون و پیادەی كردن، هەریەكەیان بەجیا، ئیستگە و ئەزموونی نوێ بوون و هەریەكەشیان هەڵوێستە و رامانی نوێیان پێبەخشی.. چونكە كە چەندین جار لە لیژنەكانی دیاریكردنی سنووری نێوان دەوڵەتانی: توركیا – رووسیا، توركیا – بولگاریادا بووە ئەندام، نەخشەی وڵاتانی زۆری دیتن، كە سنووری جیاكراوە و قەوارەی سیاسی ددان پێدانراویان لەلایەن دەوڵەتانەوە هەیە، بەڵام نەخشەی (كوردستان)ی وڵاتەكەی ئەمیان تێدا نەبوو!.. كە خۆی وەك فەرماندەیەكی باڵای سوپای عوسمانیی، لە نزیكەوە – لە جەنگی یەكەمدا – بەرنامەی فراوانخوازیی دەوڵەتانی: عوسمانیی، رووسیا، ئەڵمانیا، فرەنسا و پەیماننامەی پشت پەردە و ژێر بەژێر نێوان ئەم وڵاتانەی بۆ داگیركردن و دابەشكردنی وڵاتان و گەلانی ناوچەكە بینی، چاكتر شارەزا و ئاگاداری دیوی ناوەوەی دەوڵەت بوو.. كە رەشەكوژیی دەیان و سەدان هەزار (ئەرمەن)ی لەلایەن سوپای عوسمانیی و بەفەرمانی دەرباری عوسمانیی و بەبەرچاوی وڵاتانی: رووسیا، ئەڵمانیا، بریتانیا، فرەنساوە بینی، لەوە گەیشت، كە داكۆكیكردن لەمافی گەلان، پرۆپاگندەی دەوڵەتانی زلهێزە، بۆ بەرژەوەندی خۆیان.. كە بانگەوازی (جیهاد) و (غەزای موقەددەس) دەوڵەتی عوسمانی – بەناو ئیسلامەوە – بینی، لەفروفێڵی درۆزنانەی دەرباری عوسمانی و هەڵخەتاندنی گەلانی ژێر دەستەی ناو قەڵەمڕەوی عوسمانی گەیشت.. ئەو جیهاد و غەزا (ناموقەددەس)ەی، بەناوی ئایینی ئیسلامەوە، بەئاگاداریی و بە بەرچاوی محەمەد ئەمین زەكی یەوە، بەخەڵكی سادە دەگەیەندران و ئەوانیش پەرۆشتر لە سوپای عوسمانیی، بەپێی جەنگەكەوە دەچوون، بەگوێرەی زانیاریی محەمەد ئەمین زەكی، جگەلە كاولكردنی وڵاتەكەی و هەڵتەكاندنی ژێرخانی ئابووریی، زیانی كوژرانی (نیو ملیۆن) كوردی ژێردەستەی لێكەوتەوە..[٢] لە كاتێكدا كە كورد لەم

جەنگەدا، نەدەسەلاتی لە بڕیاری هەلگیرسان و نە لە کوژاندنـەوە و نـەقازانجی لـە دەسـتکەوتەکانی جەنگەکـەدا هـەبوو.. لـەوە زیـاتر کـە ئەگـەر ولاتەکـەی (ئـەم)، لـەپێش هەلگیرسـانی جەنگەکـەدا، بریتـی بووبـێ لـە دوو بەشـی داگیرکـراو، ئـەوا لەدوای جەنگەکە کرایە چوار بەشی داگیرکراو و بەرەو ڕووی چـوار سیسـتەمی نـاو چوار دەولەتی جیاواز کرایـەوە و ئـەو بانگـەواز و ڕاگەیاندنانـەی لـەکات و لـەدوای جەنگەکـەش، بـۆ دیـاریکردنی چـارەنووس و مـافی گـەلانی ژێردەسـتە بـلاو دەکرانەوە، کەچی کورد لە بەروبوومی کۆنگرەی (ئاشـتی پـاریس: ١٩١٩/١/١٨) و پەیمانی (سیڤەر: ١٩٢٠/٨/١٠) و کۆنگرەی (لـۆزان: ١٩٢٣/٧/٢٤)، لەژێردەسـتەیی و داگیرکردن زیاتر، هیچی بۆ نەمایەوە.. لە حالێکدا هەر دوای بڕانەوەی جەنگەکە و بـە بەرچـاوی کـوردەوە، گـەلانی نزیـك و دراوسـێی کـورد، چـەندان دەولـەتی سەربەخۆیان بۆ دروست کـرا.. هـەموو ئـەم ڕووداوانـەش، بەهـەموویان، (محەمـەد ئـەمین زەکی)یـان کـردەوە بـە هـەویر و سـەرلەنوێ و بـەجۆرێکی دیکـە هـەلیان شـێلایەوە و وایـان لێکـرد هوشـیاریی سیاسـیی زیـاتر و قـوولتر بـێ.. نفـووزی کاریگـەریی بیـانی و پێوەندییـەکانی نێـوان دەولـەتان باشـتر تێبگـات.. لەسـەروو هەموو ئەمانەشەوە زیاتر ئاشنای هەلومەرجی نالەباری ژیـانی خـەلکی کوردسـتان بوو.

ئەم داروبارەی ژیانی (محەمەد ئەمین زەکـی لـە تورکیـا: ١٨٩٨ — ١٩٢٤) و ڕووداوەکانی ئەو قۆناغە جەنجالّ و مێژووییەی تیایدا ژیاوە، ئەگـەر وەك دەلـێن: مێـژوو زۆرجـار خـۆی دووبـارە دەکاتـەوە، تاڕادەیـەك و بەهەنـدێ جیاوازییـەوە، داروبـاری سـەرەتای ژیـانی مـیر شـەرەفخانی بدلیسـی (١٥٤٣ — ١٦٠٤)مـان بـیر دەخاتەوە، کە هەردووکیان دوای چوونە دەرەوەیان لە کوردستان و تێکەلبوونیان بە دەربار و دام و دەسگای هەردوو دەولەتی سەفەویی و عوسمانی و چـاوکرانەوە و تێکەلبوون و تێکچڕژانیان بەڕووداوگەلێکی سیاسی و سەربازیی و نێودەولەتیـدا، سـەرومڕ بیروبۆچـوونیان ئـالوگۆڕی خێـرای بەسـەردا دێـت و بـیر لەچارەنووسـی گەلەکەیان دەکەنەوە.

## زیارەتێکی ماڵباتی شەرەفخانی بدلیسی و شەرەفنامە:

لەسەروبەندی خۆئامادەکردنی دەوڵەتی عوسمانی دا، بۆ جەنگی چاڵدێران (١٥١٤)، زانای گەورە: حەکیم ئیدریس بدلیسی (؟ – ١٥٢٠)، پێشنیازی بۆ سولتان سەلیم (١٥١٢ – ١٥٢٠) کرد، دڵنەوایی میر و مەزنانی کورد بکات، بۆئەوەی لە شەڕی دژی سەفەویی، پشتیوانیی دەوڵەتی عوسمانی بکەن و لەبەرامبەردا بەڵێنیان بداتێ، هەر یەکەیان لەدەڤەری خۆیدا میرنشین پێك بهێنن و سەر بەدەوڵەتی ناوەندی عوسمانی بن.. سولتان سەلیم پێشنیازەکەی پەسەندکرد و کوردان هاوکارییەکی زۆری لەشکری عوسمانییان کرد و ئاکامیش لەشکری سەفەویی تێکشکاو دام و دەسگا و دەسەڵاتی سەفەوییان، تا ناو قووڵایی ئێران راونا. لەم هێرشەی سوپای عوسمانی دا، خودی حەکیم ئیدریس بدلیسی و (٤٦) میرە کورد، تاگرتنی (تەورێز)ی پایتەختی سەفەویی لەگەڵ سولتان سەلیم دابوون(٣).

بەڵام دوای ماوەیەك، دەوڵەتی عوسمانی هەر ئەوەندەی کاری بەکورد نەما، وردە وردە لە بەڵێنی خۆی پاشگەز بۆوە، بەتایبەتیش لەسەردەمی سولتان سلێمانی قانوونی (١٥٢٠ – ١٥٦٦)ی کوڕی سولتان سەلیم دا، کە دەستی کرد بەداگیرکردن و تەنگ پێهەڵچنینی بەرودوای میرنشینەکانی کورد و ساڵی ١٥٣٥، (وەك نموونە) میرنشینی بدلیسی داگیرکرد، کە میر شەمسەددین – باوکی (شەرەفخان) فەرمانڕەوای بوو.. میرشەمسەددین – یش هەر هەمان ساڵ بەناچاری پەنای بۆ شا تەهماسب (١٥٢٤ – ١٥٧٦)ی یەکەم برد لە تەورێز و لەو مێژووە بەدواوە، میرشەمسەددین، زۆر بەڕێزەوە دەکرێتە فەرمانڕەوای (ساراب) و (مەراغە) و دوازدەساڵ دوای ئەم پەنابردنە، (شەرەفخان) ساڵی (١٥٤٣)، لەگوندی (کەرەهرود)ی نزیك شاری (قوم) بەدنیا هاتووە و ئەگەرچی لەگەڵ بنەماڵەکەیاندا ئاوارە بووە، بەڵام وەك مندالانی (شا) و شازادە و میر و میرزادەکانی سەفەویی، لەدەرباری (شاتەهماسب)دا پەروەردە دەکرێ و هێشتا مێرد منداڵ (١١ ساڵ) دەبێ، کە ساڵی (١٥٥٤) لەجێی باوکی دەکرێتە میری (شالیان و مەحموود ئاباد و موغان و شیروان). بەمجۆرە تا ساڵی (١٥٧٨)، واتە: تا تەمەنی دەگاتە (٣٦) ساڵیی، وەك میر و فەرمانڕەوایەکی کارا و لێهاتوو،

لەچەند هەرێمێکی ئێراندا، بەرودوا فەرمانڕەوایەتی کردووە و لەتەمەنی (٣٧) ساڵیدا دووبارە بەناچاریی لەگەڵ ماڵباتی خۆیان و هۆزەکەیاندا، بۆ کوردستانی ناو قەڵەمڕەوی عوسمانی گەڕاوەتەوە و دەربارى (عوسمانی)یش پێشوازیی و رێزی زۆری لێناوە و بۆتەوە بە (میر)ی پاشالیکی (بدلیس)ی پشتاوپشت بۆ بەجێماوی.. بەڵام ساڵی (١٥٩٤) دەستبەرداری میرایەتی بۆ (شەمسەددین بەگ)ی کوڕە گەورەی دەبێ، کە وەك دیارە سەرقاڵبوونی زۆری بە نووسینەوەی (شەرەفنامە)وە، ناچاری کردووە هەموو کاتی خۆی بۆ ئەو پرۆژە گەورەیە تەرخان بکات (کە پرۆژەی عومری بووە)، چونکە هەر دوای گەڕانەوەی لەئێرانەوە بۆ (بدلیس: ١٥٧٨)، یەکسەر دەستی بەنووسینی (شەرەفنامە) کردووە[٤]، کە نووسینی هەردوو بەرگەکەی، نزیکەی (٢٠) ساڵێکی خایاندووە[٥]. هەرچەندە من پێم وایە زۆر زووتریش و پێش گەڕانەوەیشی، کەڵکەڵە و گەرای نووسینی ئەم پرۆژەیەی لە مێشکدا هەبووبێ. چونکە لەلایەکەوە زۆربەی هەر زۆری ئەو سەرچاوانەی بۆ نووسینی ئەم کارەی پشتی پێبەستوون، بەزمانی فارسی بوون و دەگونجێ هەر ئەو ساڵانەی ژیانی لەئێران، ئەو سەرچاوانەی لە کتێبخانە دەوڵەمەندەکانی سەفەوی و ئەو چەندین شارەی ئێراندا چنگ خستبن، کە تیایاندا فەرمانڕەوا بووە. لەلایەکی تریشەوە و لەو زانیارییەوە، کە هەر دوای گەڕانەوەی بۆ (بدلیس) و دەست بەکاربوونەوەی میرایەتی، ناگونجێ پرۆژەیەکی وا پڕ لە زانیاریی و پشت بەستوو بەو سەرچاوە زۆرە، بەدەم کاری زۆری رۆژانەی میرایەتییەوە بنووسرێ[٦]، چونکە (شەرەفنامە)، کە یەکەمین و تاقانە کتێبێکی مێژووییە، لە سەدەی شازدەدا، لەلایەن کوردێکەوە بەتایبەتی لەسەر مێژووی کورد نووسرابێ، هاوتەریب لەگەڵ ئەوەدا کە کتێبێکی مێژووییە، هاوکات لە کرۆکدا مانای هەست بە: (کوردبوون)ی رووناکبیرێکی هوشیارە، کە بەخەمی مێژووی نەتەوەکەیەوە بووە. ئەو هەست و خەمەی، کە نەتەوەی سەردەست، بەدرێژایی مێژوو، ئەوەندە جیاوازیی لەنێوان خۆی و گەلانی ژێر دەستدا دروست دەکات، تا نەتەوە ژێردەستەکەش جیاوازییەکانی زمان و کلتوور و جوگرافیا و مێژووی خۆی بیر دەکەوێتەوە و لەگەڵ جیاوازییەکانی داگیرکارەکەدا بەراوردی دەکات. ئەوسا ئەو خەمە، بەدوای رێگە چارە و دەرەتاندا دەگەڕێ بۆئەوەی بۆ

بەرامبەرەکەی بسەلمێنێت، کە ئەمیش مرۆڤە و زمان و کلتور و جوگرافیا و مێژووی تایبەت بەخۆی هەیە.. ئەو خەمەش لای (شەرەفخان)، لەئاکامی ئەو زنجیرە کارەسات و رووداوانەدا، دوای ژان و برك و خۆخواردنەوە و پەژارەیەکی بێبڕانەوە دێتە کوڵ، کە گەلی کورد — بنەماڵەی شەرەفخان وەك نموونەیەك — بەهیوای گەیشتن بەئازادیی، لە قۆناغێکدا هاوکاریی و پشتیوانیی دەوڵەتی (عوسمانی)یان کردووە و بەدڵ و بەگیان و پێ بەپێی لەشکری عوسمانی، لەدژی دەوڵەتی شیعە مەزهەبی سەفەویی جەنگاون. بەڵام سەرئەنجام لەماڵوێرانیی و بێ هیوایی زیاتر، هیچی تریان بۆ نەماوەتەوە. ناچار روویان لەدەوڵەتی سەفەویی کردووە و لەوێش بەهەمان ئاکام گەیشتوون.. ئەوسا تەمی نائومێدیی بەری چاوی تاریك کردوون و لای هەردوو دەوڵەتیش (عوسمانی و سەفەویی)، ئێسك گران و گومانبار هەژمارکراون و پەراوێزخراون و ناوبەناویش بە بیانووی جۆر بەجۆرەوە، تۆڵەیان لێکراوەتەوە.

شەرەفخان ئەگەرچی (٢٩) ساڵ دوای جەنگی (چاڵدێران) بەدنیا هاتووە، بەڵام رووداوەکانی جەنگەکە، لای بنەماڵەکەی خۆیان و لای جەماوەری دەوروبەری شەرەفخان و دواتریش لە پەنا بردنی شەرەفخان دا بۆ دەرباری سەفەویی، بەبەردەوامیی بەیادی شەرەفخان هێنراوەتەوە (ئەگەر نەڵێم بەچاویاندا دراوەتەوە). شەرەفخان — یش وەك رووناکبیرێکی هەڵقوڵاو و بەشداربووی راستەوخۆی کۆمەڵێك رووداوی خێرای ژیانی خۆی و پشتاوپشتی بنەماڵەکەی، کە لە ساڵی (١٣٨٤)ەوە تا رۆژگاری (شەرەفخان) فەرمانڕەوای پاشالیکی (بدلیس) بوون[٧]، لەدیوی ناوەوەی ئەو رووداوانە ورد بۆتەوە و بۆی دەرکەوتووە، ئەو ململانێ و جەنگانەی نێوان سەفەویی و عوسمانی و دەوڵەتانی پێش ئەوانیش، کە گەلانی ژێردەستەیان بەناوی پاراستنی ئیسلام و مەزهەب و شتی ترەوە خەڵەتاندووە و کردوویانن بەسووتەمەنی ململانێ و جەنگەکانیان، بەڵام لەپشت پەردەوە و لە بناواندا، داکۆکی و پاراستنی قەوارەی سیاسی و نەتەوایەتی و زمان و کلتوور و جوگرافیا و مێژووی وڵاتەکانی خۆیان مەبەست بووە.. لێرەوە شەرەفخان، بەگیانی هوشیار و ئاگادارکردنەوەی نەتەوەکەی، کە نەتەوەیەکی جیاوازە و خاوەنی زمان و کلتوور و جوگرافیا و مێژووی خۆیەتی و دەبێ

بپارێزرێ. بە پێویستی زانیوە ئەم پەیامەی، بەنووسین و لەشێوەی مێژوودا بۆ گەلەکەی و بۆ دراوسێکانی گەلەکەی بگێڕێتەوە، کە وەك دیارە ئەم پەیامەی شەرەفخان (شەرەفنامە)، لە رۆژگار و داروبارێکی ئەوپەڕی بێ هیوایی کورد دا نووسراوە. بۆیە هەر ئەو سەردەمە، کە هێشتا چاپ و چاپخانە لە کوردستان دانەکەوتووە، وەك دەرەتان و هیوا بەخشین، پێشوازییەکی خێرا و گەرمی لەلایەن خوێنەران و روناکبیرانەوە لێکراوە و هەر ئەو رۆژگارەش، نوسخەی زۆری لەلایەن خۆشنووسانەوە لەبەر نووسراوەتەوە و لەدوای نووسینەوەیشی، دەیان و سەدان ساڵ، دەستاودەست و ماڵە و ماڵ و شاران و وڵاتان گێڕدراوە و گەڕیدەکانی ئەورووپا و کوردناسانیش بەپەرۆش و تاسەوە عەڤداڵی پەیداکردنی بوون، لەوانە: ژان باتیست تاڤێرنی، کە لە ساڵەکانی (١٦٢٣ – ١٦٦٨)دا، لەیەکێك لەو شەش سەردانەی بۆ کوردستانی کردووە، سەردانی میرنشینی (بدلیس) و دیدەنی (ئەبدالڵ خان)ی میری بدلیس و نەوەی شەرەفخانی کردووە، دەستنووسی (شەرەفنامە)ی لە کتێبخانە دەوڵەمەندەکەی (ئەبدالڵ خان)دا دیتووە[٨]. ئەولیا چەلەبی – ش کە دیداری هەمان میر و هەمان کتێبخانەی کردووە، چاوی بەچەندان نوسخەی دەستنووسی (شەرەفنامە) کەوتووە. مالکۆم (١٧٦٩ – ١٨٣٣) و کلاودیوس جەیمس ریچ (١٧٨٧ – ١٨٢١)یش، کە سەردانی ئەمانوڵلاخانی گەورە (١٧٧٥ – ١٧٢٤)ی میری ئەردەڵانیان کردووە (١٨٠٩ – ١٨٢٠)، دەستنووسی (شەرەفنامە)یان لێ وەرگرتووە[٩].

★ ★ ★

محەمەد ئەمین زەکی بەرلەوەش بۆ وڵات بگەڕێتەوە (١٩٢٤)، دەیزانی (شیعر) دەرەقەتی خەم و خەونەکانی نایەت، بۆیە (وەك پێشتر وتمان) هەر لەساڵی (١٩٠٩)ەوە، سەرچاوە و زانیاریی بۆ نووسینی مێژووی کورد و کوردستان کۆ دەکردەوە. بەڵام ساڵی (١٩١٩) ماڵەکەی و کتێبخانەکەی (لە ئەستەمووڵ) دەسووتێن و دووبارە دەست بەکۆکردنەوەی سەرچاوە و زانیاریی دەکاتەوە. هەرچەندە لەهەمان ئەو ماوەیەدا، کە خۆی بۆ ئەم پرۆژە گەورەیە ئامادەکردووە (١٩٠٦ – ١٩٢٢)، هەشت – نۆ کتێبی نووسیون و بەچاپی گەیاندوون، بەڵام هەموویان بریتی بوون لەکاروباری سەربازیی و جەنگ و بیرەوەری خۆی، وەك

فەرماندەیەکی سوپای عوسمانی لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا (١٩١٤ — ١٩١٨) و هەمووشیان بەزمانی (تورکی) بوون، کە ئەمانەش نیشانەی تری دوورکەوتنەوەی (محەمەد ئەمین زەکی) بوون لە: (شیعر)...

محەمەد ئەمین زەکی درەنگتر لەو هاوڕێیانەی بۆ وڵات گەڕایەوە، کە لە ئەستەموولّ پێکەوە بوون و لەگەڵ هاتنەوەیاندا بۆ وڵات، لە پێکەوەنانی دەوڵەتی عێراق (١٩٢١)دا بەشداربوون و پلە و پۆستی باڵایان وەرگرت. محەمەد ئەمین زەکی — ش هەر زوو پلەی باڵای لە دەوڵەتی عێراقدا وەرگرت. بەڵام ئەو کار و پلە باڵایانەی بۆ ئەوەبوون، تا لەژیانی جەنجاڵی ئەستەموولّ دوور بکەوێتەوە و کەش و هەوایەکی ئارام و سەقامگرتووی بۆ برەخسێ و دەست بەپرۆژەی نووسینەوەی مێژووی کورد و کوردستان بکات، کە پرۆژەی هەموو ژیان و هەموو خەونەکانی بوو. بۆیە هەروای کرد و یەکەمین ساڵی دوای گەڕانەوەی بۆ وڵات (١٩٢٥) و بەپشتیوانیی ئەو زانیاریی و سەرچاوانەی لە وڵاتانی ئەورووپا و لە ئەرشیفی وڵاتانی دراوسێدا، دەستی خستبوون، دەست بەنووسینەوەی پرۆژەکەی دەکات و دوای (٦) ساڵ، بەرگی یەکەمی (خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان: ١٩٣١) و ساڵی (١٩٣٧)ش بەرگی دووەم تەواو دەکات. هەردوو بەرگەکەش لەلایەن ڕووناکبیرانی کوردەوە، بەتاسە و ڕێزێکی زۆرەوە، پێشوازیی و دەستخۆشیی لێدەکرێت و لەپێشیانەوە، شاعیر و ڕووناکبیری مەزن: پیرەمێرد، لە زنجیرەیەك وتاری ڕۆژنامەی (ژیان) و (ژین) و گۆڤاری (گەلاوێژ)دا، دەستخۆشیی و مشتومڕی مێژوویی لەگەڵ محەمەد ئەمین زەکی دا دادەمەزرێنێ[10]. بەدوایدا: شێخ محەمەدی خاڵ و ئوسمان سەبری، هەریەکەیان بە جۆرێك لێی دەدوێت، کە یەکەمیان لەنامەیەکی سوپاس و پێزانیندا: (ئەووڵەن بەناوی هەموو قەومی نەجیبی کوردەوە، ثانیەن بەناوی هەموو عولەما و ئودەبا و شوعەرا و مەشایخەوە، تەشەکوری مەعالی محەمەد ئەمین زەکی) دەکات[11] و لە دواییدا زەبر و ڕەنگدانەوەی (خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان)، لای لاوان و خوێندەوارانی کورد، بۆ محەمەد ئەمین زەکی باسدەکات و دەڵێ: ئەمڕۆ هەموو لاوان و خوێنەران و تێگەیشتووانی قەومەکەیشی، ئەو ئەپەرستێ و هەر یەکێك لەوان، هەیکەلێکی مەعالی ئەمین زەکی لەدڵ و دەروونی خۆیا داناوە و..[12]

دووەمیشیان: یەکەمین کوردێکە، کە نرخاندنێکی شیاوی لەبارەی هەردوو بەرگی (خۆلاسەیەکی..) بڵاوکردەوە[١٣].. پێ بەپێی ئەمانیش محەمەد عەلی عەونی، هەردوو بەرگەکەی (خۆلاسەیەکی..) بەرودوا: (١٩٣٧ و ١٩٤٥) بۆ عەرەبی تەرجەمەکردن.. کە ئەگەر هۆی ئەم پێشوازییە گەرم و خێرایەی رووناکبیرانی کورد بپرسن، دەستبەجێ لەچەند خاڵێکدا دەڵێین:

١- محەمەد ئەمین زەکی لە داوبارێکدا ئەم دوو بەرگەی مێژووی کورد و کوردستانی بەخوێنەران گەیاند، کە گەلی کورد، دوای برانەوەی جەنگی یەکەمی جیهانی، بەسۆنگەی ئەوەی لە هەموو ئەو ئاواتانەی بێبەش بوو، کە چاوەڕێی دەکردن لەرێگەی (کۆمەڵی نەتەوەکان)ەوە پێی بگات، تووشی بێ هیواییەکی یەکجار تاریک ببوو. تەقەللاکانی کوردیش خۆی، جووڵانەوەی سمکۆی شکاک (١٩١٤ — ١٩٣٠)، لە بزووتنەوەی شێخ مەحموودی حەفید (١٨٨١ — ١٩٥٦)، لە سالآنی (١٩١٩ — ١٩٢٥) و شۆڕشی شێخ سەعید (١٩٢٥) و شۆڕشی ئاگری داخ (١٩٢٧—١٩٣٠) بەڕابەرایەتی کۆمەڵەی (خۆیبوون)، کە تێشکانی هەموویان، تێشکانی رۆحی نەتەوەی کوردیان بەدوای خۆیاندا هێنا و ئەوەندەی تر، کورد خۆی بەتێشکاو و دەرکراوی مێژووی خۆی دەزانی و وای هەست دەکرد ئەو خەباتەی بۆ پاراستنی زمان و جوگرافیا و مێژووی خۆی کردووە، بە ئەنجام نەگەیشتوون، ئیتر لەمەودوا هەموو ئەو شتانەی لەبەر مەترسیدان، بەتایبەتیش کە لەم قۆناغە تاریکەدا، هیچ پشتیوان و کۆمەڵە و حیزب و رێکخراوێکی کوردی نەبوو، تا بەرگریی لەپاراستن و بووژاندنەوەی ئەو بنەما سەرەکییانەی گەلی کورد بکات.

٢- ئەو سەرچاوانەی محەمەد ئەمین زەکی، لەنووسینی مێژووەکەیدا، بۆ پشکنین و دۆزینەوە و ساغکردنەوە و سەلماندنی سەربەخۆیی زمان و جوگرافیا و مێژووی رەگەزی کورد، پشتی پێبەستوون، بەتایبەتیش ئەوانەی کوردناسان و وڵاتانی ئەوروپا، وەك مینورسکی، مارك سایکس، سپایزەر، لۆنگریك، درایڤەر، نورمان، لسترنج، هۆل، نۆلدگە و... هتد. سەرچاوەگەلێکی پڕ لەزانستی دەوڵەمەند و تازە و جێی متمانە بوون، کە زۆربەیان (لەو سەردەمەدا) نەك هەر بۆ سەر زمانی کوردی، بەڵکو بۆ زمانەکانی: عەرەبی، فارسی، تورکی — ش تەرجەمە

نەکرابوون. بۆیە ئەم زانیارییە تازانەی مێژووی (کورد و کوردستان)، راستییەکی سەلمێنراوی بۆ رووناکبیران و خوێنەرانی کورد، لەسەر مێژووی نەتەوەکەیان پشت راست کردەوە، تا بەشانازییەوە پشت بەمێژووی زانستانەیان ببەستن، کە تا ئەوکاتە (مخابن بە — شەرەفنامە — شەوە)، لە روانگە و بۆچوونی (شانامە — ی فیردەوسی: ۱۹٤۰ — ۱۰۲۰)، بە ئەفسانە هەڵنراو و بێ بنەمای زانستی و هەندێ مێژوونووسانی عەرەبی وەك: مەسعوودی، ئیبن قوتەیبە، دینەوەری و مێژوونووسانی سەرەتای ئیسلام، بنەچە و دێرینەی کوردیان بۆ سەر دێو و درنج و جنۆکە دەگێڕایەوە[١٤]. بەڵام محەمەد ئەمین زەکی، بەبڕوایەکی نەگۆڕ و پتەوەوە، ئەو بۆچوونە پووچانەی رەتکردنەوە و نەتەوەی کوردی، وەك نەتەوەیەکی دێرینە و مرۆڤی کوردیشی وەك مرۆڤێکی شکۆمەند و هاوتای هەموو مرۆڤی ئەم سەرزەمینە پێناسەکرد.

لەدوای مێژووی نووسینی (شەرەفنامە: ١٥٩٧)ەوە، تا مێژووی نووسینی هەردوو بەرگی (خۆسەلایەکی تەئریخی کورد و کوردستان: (١٩٣١، ١٩٣٧)، کە دەکاتە (٣٤١) ساڵ، واتە: نزیکەی سێ سەدەونیو، جگەلە چەند مێژوونووسێکی سەر بەمیرنشینی ئەردەڵان، کە هەموویان هەر مێژووی میرانی ئەردەڵانیان نووسیوە[١٥]، ئیتر مەلا مەحموودی بایەزیدی (١٧٩٩ — ١٨٦٩): آداب و رسومات أكرادیە و حسین حوزنی موکریانی موکریانی (١٨٩٠ — ١٩٤٧)یش مێژووەکانیان، مێژوویەکی گشتگیر و سەرومڕی دێرینە و بنەچەی کورد و کوردستان نین. بۆیە (خۆسەلایەکی تەئریخی کورد و کوردستان) ی محەمەد ئەمین زەکی، نەك هەر مەودایەکی مێژوویی سێ سەدە و نیو پڕ دەکاتەوە: بەڵکو مەودایەکی سەدان و هەزاران ساڵی نەنووسراوی کورد و کوردستان پڕ دەکاتەوە، بەتایبەتیش کە بە دیالیکت و لەناوچەیەکدا نووسراوە، کە (١٠٠) سەد ساڵ، بەر لە محەمەد ئەمین زەکی، شاعیرانی ناودار: نالی، سالم و کوردی و هاوڕێکانیان، بناغەی هەمان ئەو دیالیکتە نوێیەیان دامەزراند و شیعری نیشتمانپەروەرانەیان پێ نووسی، بەڵام ئەوانیش مەیدانی (مێژوو) یان بەچۆڵیی بەجێ هێشتبوو، کە محەمەد ئەمین زەکی ئەم کەلێنەشی پڕکردەوە.

لەبەرئەم هۆیانە، خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان، ڕووداوێکی مەزەنی مێژووییە، کە لەدوای (شەرەفنامە)وە، ڕووداوی وا پڕ ئاوازە و کاریگەر لەمێژووی ڕووناکبیریی کوردیدا ڕووی نەداوە، چونکە (وەك وتمان) لەسەردەم و قۆناغێکدا نووسرا، کە ڕۆحی نەتەوەیی کورد، لەبارێکی داهێزران و بێ هیوابیەکی نادیاردا دەژیا و ئەم مێژووە، وزە و وره و خوێنێکی تازەی پێبەخشی، تا لەبەردەم دابەشکردن و داگیرکاریی و بێبەشکردنی لەژیان و ئازادی و سەربەخۆییدا، متمانە بەخۆی پەیدا بکاتەوە و دڵنیای بکات، کە ئەمیش وەك مرۆڤ، هەموو مەرجەکانی ئەوەی تێدایە، مافی ژیانی ئازاد و سەربەخۆیی و پێکەوەنانی قەوارەی سیاسی و نیشتمانی خۆی هەبێ. ئەم متمانە پێبەخشینەوەیەش دەبێتە هەوێنی وەرسووڕانێکی نوێ لەمێژووی هەستی نەتەوەیی کوردا و ڕووداوێکی ڕووناکبیریی و مێژوویی ئەوەندە ناوازەیە، وەك چۆن لەمەیدانی جوگرافیاییدا پرۆژەی دروستکردنی شارێکی تازەی وەك نموونەی شاری بەغداد (٧٦٢ز)، یان: شاری (سلێمانی: ١٧٨٤)، وەك دوو پێویستی جوگرافیایی، بڕیاری دروستکردنیان دەدرێ و دەبنە دوو ڕووداوی تازەی جوگرافیایی و دوو شاری تازە لەسەر نەخشەی جیهان زیاد دەکەن و بۆ هەتاهەتا و هەمیشە، ناویان لەسەر نەخشەی جیهان دەمێنێتەوە. هەر بەوجۆرە (خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان)یش، ڕووداوێکی گەورەی مێژووییە.

لەجێی خۆیدایەتی لە بۆنەی ناوهێنانی ئەو (دیالیکت)ەی (خۆلاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان)ی پێ نووسراوە، بڵێم: ئەوە ئاشکرا و زانراوە، کە ئێستا بەو دیالیکتە دەڵێن: دیالیکتی کرمانجی ناوەڕاست، یان وەك لە دەمێکەوە (ئاخۆ دزکۆ: ١٨٥٣) ناوی ناوە: دیالیکتی سلێمانی[١٦]، کە دیارە مەبەستیش لە دیالیکتی سلێمانی، بەمانای ئەوەی ئەم دیالیکتە، لەدوای دروستبوونی شاری سلێمانی (١٧٨٤)ەوە، گەڵاڵە بووە و داکەوتووە و بەم پێیە ئەم پرسیارە دێتە گۆڕێ: ئەی پێش دروستبوونی شاری (سلێمانی)، دانیشتووانی (شارەزوور — شوێنی ئێستای سلێمانی)، بە چ دیالیکتێك پەیڤیون؟

وەڵامی ئەمەش دیسان زانراوە، کە دیالیکتی (گۆران) بووە. بەڵام محەمەد ئەمین زەکی نموونەیەکی زیندووی بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە باسکردووە، کە

هێشتا زمانەوانانی کورد، ئاماژەیان بەم بەڵگەیە نەکردووە. محەمەد ئەمین زەکی لەم بوارەدا و لەباسی ڕووداوەکانی لەشکرکێشی و هێرش و کاولکارییەکانی (نادر شا: ١٦٨٨ — ١٧٤٧)ی ئەفشاردا، بۆ سەر کوردستان و ناوچەکانی: شارەزوور و کەرکووك (١٧٣٢ — ١٧٤٣)دا، دەڵێ: (مەعامەلەی نادرشا، دەرهەق بەکورد، زۆر خراپ بوو و کوردەکان ئەیان بوغزاند. حەتتا دائیر بەشەڕی لەگەڵ: تۆپاڵ عوسمانی پاشا–دا، بەلەهجەی — گۆران — هەجوویەکیان بۆ هەڵبەستبوو..)[17].

بەمانایەکی تر: تا سەدەی هەڤدەش، شێوەزار و ئەدەبیاتی شارەزوور و گەرمیان و کەرکووك، هەر دیالیکتی (گۆران) بووە.

**دوا سەرنج:**

ئەو سەرچاوانەی محەمەد ئەمین زەکی بۆ نووسینی (خۆلاسەیەکی..) کۆی کردوونەتەوە، نزیکەی (٢٥٠) سەرچاوەبوون. لەناو ئەمانەدا ئاماژەمان بەهەندێ لەسەرچاوەگەلی کوردناسان و خۆرهەڵاتناسان کرد، بەلام هاوکات کەڵکی لەسەرچاوەیەکی زۆری دراوسێکانی کورد و مێژوونووسانی تورك و فارس و عەرەبیش وەرگرتووە و لەناو ئەمانەدا (وەك نموونە): سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی، تەئریخی عموومی موراد بەگ، تەئریخی نەعیما، تەئریخی جەودەت، تەئریخی عموومی ئەحمەد ڕەفیق ڕەسملی، خەریطەی عوسمانی تەئریخی، قاموس الاعلام شمس سامی، حاجی خەلیفە، تاریخ ایران باستان (حسن پرنیا — مشیر الدولە) و .. گەلێکی دیکە. بەداخەوە زانیارییەکانی (هەندێ) لەم سەرچاوانەی، بەبێ بەراورد و لێکۆڵینەوە، وەك خۆیان بۆ کتێبەکەی گواستوونەتەوە، کە بەرلە من، مامۆستایان: محەمەد جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی[18]، حیسامەددین نەقشبەندی[19]، د. کەمال فوئاد[20]، د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی[21]، د. فرست مەرعی، سەرنج و ڕاستکردنەوەیان لە ئاستیاندا نووسیوە و خۆزگەم ئەوەیە لەکاتی سەرلەنوێ لەچاپدانەوەی سەرجەمی بەرهەمەکانی محەمەد ئەمین زەکی دا، هەموو ئەو سەرنج و ڕاستکردنەوانەیان پێ زیاد بکرێ.. سەرنجێکی زۆر ورد، کە ئەو بەڕێزانە بەلایدا تێپەڕیون، مێژووی مەرگی ڕابەر و شۆڕشگێڕی ناسراو: (شێخ عوبەیدوڵلای نەهری– ١٨٣٠–١٨٨٣)یە، کە محەمەد ئەمین زەکی

لەلاپـــەڕە (٣٣٤)ی بـــەرگی یەکـــەمی مێژووەکەیـــدا، چـــەردەیەکی لـــەبارەی شۆڕشەکەیەوە باسکردووە و ئەو زانیارییانـە بـۆ ئەوکاتـە (١٩٣١)، ورد و بەکـەڵك بوون و ئاماژەی بەسەرچاوەکانی ئەم بابەتە نـەکردووە. بـەڵام کـە باسـی گـرتن و خۆ بەدەستەوەدانی شێخ عوبەیدوڵلای کردووە، نووسیویێتی: ساڵی ١٨٨٣، خـۆی بەدەستەوەدا!. لە کاتێکدا بـەگوێرەی ئـەو بەڵگـە رەسمییانـەی ئێمـە دەسـتمان کـەوتوون، دەریدەخـەن کـە شـێخ عوبەیـدوڵلا لـە (١٨٨١/١/٢١ز)دا، خـۆی بەدەسـتەوە داوە و بـەگیراویی و دەستبەسـەریی بـۆ مووسـڵ و لەوێشـەوە بـۆ: ئەسـکەندەروونە، بـەیرووت، حیجـاز، مەدینـە و تـائیف بـراوە و دوای مانـەوەی نزیکـەی دوو سـاڵ و دوو مـانگ، ڕۆژی (١٨٨٣/١٠/١٢)، لەشـاری (تـائیف) کۆچـی دوایی کردووە[٢٢].

## پەراوێز

[١] رۆژنامەی (ژین)، سلێمانی، ژمارە (٥٥٥)، ٩ی شوباتی ١٩٣٩، ل ١.

[٢] خولاسەیەکی تەئریخی کورد و کوردستان، جزمی یەکەم، ١٩٣١، بەغداد، ل ٢٥.

[٣] شەمسی محەمەد ئەسکەندەر (دکتۆر)، مێژووی کورد لەسەدەی ١٦ هەمدا، وەرگێڕانی بۆ کوردی: شوکور مستەفا، چاپەمەنی وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان، هەولێر، چاپی یەکەم، ل ١٨.

[٤] هەمان سەرچاوە، ل ٣١.

[٥] هەمان سەرچاوە، ل ٣١ — ٣٢.

[٦] جێی بیرهێنانەوەیە، کە محەمەد ئەمین زەکی—ش (٢٠) ساڵ بەر لەنووسینی (خۆلاسە — ١٩٣١)، واتە لەساڵی (١٩١٠)ەوە، دەستی بەکۆکردنەوەی سەرچاوە و زانیاریی بۆ ئەم کتێبە کردووە. بەڵام مخابن ساڵی (١٩١٩) کتێبخانە و ماڵەکەشیان سووتاوە. دووبارە دوای گەڕانەوەی بۆ عێراق (١٩٢٤) کەوتۆتەوە پەیداکردنی سەرچاوە و زانیاریی.

[٧] شەمسی ئەسکەندەر (سەرچاوەی پێشتر ناوهێنراو)، ل ٢٣.

[٨] هەمان سەرچاوە، ل ١٦.

[٩] کلودیوس جەیمس ریچ — گەشتنامەی ریچ بۆ کوردستان (١٨٢٠)، و بۆ کوردی: محەمەد حەمە باقی، چاپی پێنجەم، چاپەمەنی موکریانی، هەولێر ٢٠١٢، ٢٣٨ — ٢٤٠.

[١٠] پیرەمێرد لە ژمارەکانی رۆژنامەی (ژیان) و (ژین) و گوڤاری (گەلاوێژ)دا، ئەم وتارانەی لەبارەی (خۆلاسە..)ەوە نووسیوە:

— رۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٤٢٢، ساڵی ٩، ٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٤، ل١.

— رۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٤٢٥، ساڵی ١٠، ٥ی کانوونی دووەمی ١٩٣٥، ل ٢.

— رۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٤٢٧، ساڵی ١٠، ١٩ی کانوونی دووەمی ١٩٣٥، ل ٢.

— رۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٤٣١، ساڵی ١٠، ١٦ی شوباتی ١٩٣٥، ل ١ — ٢.

— رۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٤٣٤، ساڵی ١٠، ٢٣ی ئازاری ١٩٣٥، ل ١.

— رۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٥٠٢، ساڵی ١١، ١٤ی تشرینی یەکەمی ١٩٣٦، ل ٢.

— رۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٥٤٢، ساڵی ١٢، ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٣٧، ل ١ — ١٢.

— رۆژنامەی (ژیان)، ژمارە ٥٤٣، ساڵی ١٢، ٢٣ی تشرینی دووەمی ١٩٣٧، ل ٢.

— رۆژنامەی (ژین)، ژمارە ٥٥٥، ساڵی ١٣، ٩ی شوباتی ١٩٣٩، ل ١.

— رۆژنامەی (ژین)، ژمارە ٥٧٣، ساڵی ١٣، ٦ی تەمووزی ١٩٣٩، ل ١.

— رۆژنامەی (ژین)، ژمارە ٥٧٩، ساڵی ١، ٢٢ی ئازاری ١٩٤٥، ل ٣.

— گوڤاری (گەلاوێژ)، ژمارە (١١ — ١٢) ساڵی ٣، تشرینی دووەم — کانوونی یەکەمی ١٩٤٢، بەغداد، ل ٢١ — ٢٣.

[١١] رۆژنامەی (ژین)، سلێمانی، ژمارە ٥٧١، ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٣٩، ل ٣. هەروەها هەمان رۆژنامە، ژمارە ٥٧٢، ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٣٩، ل ٢.

[١٢] هەمان سەرچاوە.

[١٣] گوڤاری (هاوار)، ژمارە ٢٩، سێ شەمب، ١٠ی حوزەیرانی ١٩٤١، ساڵی ٩.

[١٤] شرفنامە (تاریخ مفصل کردستان)، به اهتمام ولادیمیر ولییامینیوف زرنوف، انتشارات اساطیر، چاپ اول، ١٣٧٧ هـ. ش، ص ١٢ — ١٣.

[١٥] ئەو مێژوونووسانە بریتین لە:

- یادداشتەکانی مەئموون بەگی کوڕی بێگەبەگی ئەردەڵان (١٥٧٧ن)، کە بەتەنیا ئەمیان نزیکەی (٢٥)ساڵ بەر لە (شەرەفنامە) نووسراوە.
- مەلا محەمەد شەریف (قازی ئەردەڵان): زبدة التواریخ (١٧٩٩ — ١٨٠٠).
- محەمە ئیبراهیم ئەردەڵانی: ذیل شرفنامه (١٨١٠).
- خوسرەوبەگی ئەردەڵان: لب التواریخ (١٨٣٣).
- ماهشەرەف خانم (مەستوورە: ١٨٠٥—١٨٤٧): مێژووی ئەردەڵان.
- عبدالقادر بن رستم بابانی: تاریخ و جغرافیای کردستان (١٨٦٩).
- علی اکبر وقائع نگار کردستانی: حدیقەی ناصری (١٨٩١).

[١٦] ئەلکساندەر خۆدزکۆ: چەند لێکۆڵینەوەیەکی فیلۆلۆژی دەربارەی زمانی کوردی — دیالیکتی سلێمانی —، ٢٠٠٦، بنکەی ژین، و. بۆ کوردی: د. نەجاتی عەبدوڵڵا.

[١٧] خۆلاسە.. ل ٢٠٧.

[١٨] گوڤاری رۆشنبیری نوێ، بەغداد، ژمارە ١٢٢، حوزەیرانی ١٩٨٩، ل ٧٥ — ٨١، هەروەها: مجلة المجمع العلمي العراقي — الهيئة الكردية، بغداد، المجلد ٢٧ — ٢٨، ١٩٩٨.

[١٩] گوڤاری (ژین)، سلێمانی، ژمارە (١)، تەمووزی ٢٠٠٩.

[٢٠] مقدمة الطبعة الثانية من الجزء الثاني من كتاب (خلاصة تأريخ الكرد وكردستان)، لندن، ١٩٦٨.

[٢١] گوڤاری (ژین)، سلێمانی، ژمارە (١)، القسم العربی، ٢٠٠٩، ص ٣٥١ — ٣٧٠.

[٢٢] چی لەبارەی (ئەمین زەکی بەگەوە) نووسراوە، ئامادەکردنی: رەفیق سالح، چاپەمەنی بنکەی (ژین)، سلێمانی، ٢٠١٠، ل ٣٨٦.

[٢٣] بۆ زیاتر زانیاریی لەم بارەیەوە بنوارە: محەمەد حەمەباقی، شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (١٨٨٠) لە بەڵگەنامەی قاجاری دا، چاپەمەنی موکریانی، هەولێر، ٢٠٠٠، ل ٢٥، ٢٤٧ — ٢٤٨.

سەرنج: سەیر لەوەدایە بەرێز (د. کەمال فوئاد) لەئاست مێژووی ناوبراودا، لەباتی ئەوەی راستی بکاتەوە، مێژووی مەرگی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری کردۆتە (١٨٨٨)!. لەم بارەیەوە بنوارە: چی لەبارەی (محەمەد ئەمین زەکی بەگەوە) نووسراوە، سەرچاوەی پێشتر ناوبراو، ل ٣٤٥.

## تعليمات النشر
## في مجلة الأكاديمية الكوردية

- مجلة الأكاديميّة الكورديّة: مجلّة علمية فصليّة تهتمّ بنشر البحوث العلميّة الـتي تتنـاول قضايا الكورد وكوردستان، شريطة أنْ لا تكون منشورة مـن قبـل أو مقبولـة للنشـر في مجلّة أخرى.
- لغتـا النشـر في المجلّـة همـا الكورديّـة والعربيّـة، ويمكـن نشـر بحـوث تخـصّ الكـورد وكوردستان بلغات أخرى.
- على الباحث أن يكتب على الصفحة الأولى من بحثه عنوان بحثه، اسمه، لقبه العلمـي، عنوان وظيفته، مكان عمله، بريده الإلكتروني ورقم هاتفه.
- يُعتمد المنهج العلمي في اختيار عنوان البحث ومتنه وأسلوب تنظيم المصادر والهوامش والاقتباسات، فضلاً عن كتابة البحث بلغة علميّة رصينة، وتعتذر هيئة التحرير عن نشر أيّة دراسة تهمل هذه الجوانب.
- يُلحق بالبحث ملخّص بلغتين أخريين، على أنْ لا يزيد عـن صـفحة واحـدة A4، يوضّـح فيه الباحث أهمّيّة بحثه والنتائج الرئيسة التي توصّل إليها.
- عندما يكون البحـث تحقيقـاً لمخطوطـة مـا، يجـب الالتـزام بالقواعـد والمنـاهج العلميّـة المعمول بها في هـذا المجـال، وتُرفـق بالبحـث عـدّة صـفحات مـن المخطوطـة مـع بيـان المعلومات الأساسيّة عنها والجهة التي تحتفظ بها.
- يجب كتابة البحث بحـروف اليونيكـود، وتنظـيم الهـوامش بأسـلوب هارفـارد، علـى ان يطبع عنوان البحث بحجم (١٥) واسم الباحث او الباحثين مـع العنـاوين الفرعيـة بحجـم (١٤) ويكون المتن بحجم (١٣).
- تُنظّم المصادر والمراجع كالآتي: لقب المؤلّف واسمه، التأريخ، عنوان الكتـاب، الجـزء (إنْ وُجـد)، الطبعـة، دار النشـر، المدينـة. وتُـنظّم البحـوث في المجلّـات كـالآتي: لقـب المؤلّـف واسمـه، التـأريخ، عنـوان البحـث، اسـم المجلّـة "بـين تنصيصـين"، العـدد، المدينة.
- يُرسل البحث بثلاث نسخ ورقيّة A4، وبقرص مدمج CD، على أنْ لا يزيد عدد صفحات البحث عن (٢٥) صفحة، بضمنها الصور والجداول والمصادر.

- يّعتبر البحث مقبولاً للنشر بعد تقويمه إيجابيّاً من قبل خـبراء ومحكّمـين متخصّصـين، ويزوّد الباحث بقرار من هيئة التحريـر بقبولـه، ولا يجـوز للباحـث نشـر بحثـه لاحقـاً في مكان آخر بدون موافقة خطيّة من رئيس التحرير.
- تحتفظ هيئة التحرير بحقّها في حذف أو إعادة صياغة بعض الألفاظ والتعابير بما يتلاءم مع أسلوب المجلّة في النشر، مع مراعاة عدم المساس بالأفكار الأصليّة للبحث.
- يخضع ترتيب البحوث في المجلّة وفقاً لمنهج المجلّة في التبويب، وليس لأهمّيّة البحث أو لقب الباحث العلمي.
- لا تنشر المجلّة البحوث المستلّة من رسائل الماجستير وأطاريح الدكتوراه.
- تلتزم المجلّة بتطبيق المبادئ المتعلّقة بالانتحال.
- لا تعاد البحوث المرسلة إلى المجلّة إلى أصحابها في حالة عدم الموافقة على نشرها.

# قراءة متأخرة لكتاب (عنوان المجد)

**محمد علي القرەداغي**
العضو العامل في الاكاديمية الكردية

تربطني بالاسرة الحيدرية صلة قرابة ونسب، فضلا عن صلة العلم وهذه الاسرة أغنى اسر كردستان من حيث كثرة علمائها المؤلفين، وكانت هذه الاسرة مالكةً كنزاً هائلاً من المخطوطات عبثت حوادث الدهر، وكوارث المحن، ونوائب الزمان بهذه الثروة كما فعلت بغيرها من التراث الممثل. ومن خلال معايشتي للمخططوطات، وتتبعي لأخبارها ثم الكتابة عنها وإحياؤها، أؤليت جانبا من اهتمامي بتراث الحيادرة، وأبرزت دورهم الثقافي في كردستان ومازلت.

قبل فترة من الزمن أهدى إلي صديق نسخة من كتاب: (عنوان المجد) لمؤلفه ابراهيم فصيح الحيدري، فشكرت الأخ المهدي، ووضعت الكتاب في مكان معين لعلي أرجع إليه وأطالعهُ ولم تسنح لي فرصة لذلك إلا قبل فترة. فبدأت بقراءة الكتاب من المقدمة، وقمت – كعادتي – بتسجيل الملاحظات بالقلم الاحمر على صفحات الكتاب. وبدأت ملاحظاتي تزداد كلما قلبت صفحة، وتقدمت خطوة، حتى كثرت الملاحظات بشكل ملفت، ورأيت أن هذا العمل بحاجة إلى تذكير وتوضيح لعله ينال عناية في طبعة قادمة وتتدارك الملاحظات.

**وعنوان الكتاب كما يلي:**

عنوان المجد في بيان احوال بغداد والبصرة ونجد.

تأليف ابراهيم فصيح الحيدري البغدادي ١٢٣٥– ١٣٠٠ هـ، ١٨٢٠ – ١٨٨٢م.
تحقيق معن حمدان علي، من منشورات مصر مرتضى للكتاب العراقي ١٤٣٤ هـ – ٢٠١٣م.

كما قلت إن ملاحظاتي على الكتاب كثيرة ومتنوعة، واذا تناولت الكتاب من جميع النواحي، وأبديت ملاحظاتي عليه فلربما احتجت إلى كتاب أو كراس، وأخذ منّي ومن القارىء الكريم الكثير من الوقت. لذا رأيت أن أركّز على جوانب مهمة وأكرّس جهدي لما هو ضروري من الملاحظات:

فأبدأ من كلمة او مفردة (تحقيق). هذه الكلمة او هذه المفردة قديمة ومصطلح علمي رفيع لا تعطى إلا لمن يكون عالما بفن التحقيق، متضلعاً في اساليب المحققين، سالكا درب التحقيق بمهارة وأمانة وتأنّ.

غير أنه في الآونة الأخيرة تغيرت النظرة إلى هذا المفهوم، وتساهل الناس في منح صفة المحقق لكثيرين لا تتوافر فيهم شروط نيل تلك الصفة، ولم يروا أو تناسوا ما قيل سابقا في حق فن التحقيق فاقرأ معي ما أتى به شيخ المحققين الدكتور عبدالسلام هارون بهذا الصدر:

"عرفت اذن ان التحقيق امر جليل، وانه يحتاج من الجهد والعناية إلى اكثر مما يحتاج إليه التأليف. وقديما قال الجاحظ: ((ولربما اراد مؤلف الكتاب أن يصلح تصحيفا او كلمة ساقطة، فيكون إنشاء عشر ورقات من حرّ اللفظ وشريف المعاني أيسر عليه من إتمام ذلك النقص حتى يردّه إلى موضعه من إتصال الكلام))

((إن التحقيق نتاج خلقي، لا يقوى عليه الا من وهب خلتين شديدتين: الأمانة والصبر، وهما ماهما)).

((فالكتاب المحقق هو الذي صح عنوانه، واسم مؤلفه، ونسبة الكتاب إليه، وكان متنة أقرب ما يكون إلى الصورة التي تركها مؤلفه))[1].

فكم نرى ونقرأ من طلاب الماجستير والدكتوراه يرون امر التحقيق ميسورا، فيتناولون مخطوطا في علم من العلوم ويعالجون فيه بعض الأشياء وكتابته من جديد، ووضع بعض الهوامش أسفله، ومقابلته بنسخة أو نسختين من المخطوط، ومن ثم إخراجه نصا محققا لينالون في ضوء ذلك العمل شهادة الماجستير او الدكتوراه بتقديرات عالية. وهم في الواقع لم يكونوا مؤهلين — اصلا — للشروع بذلك العمل، وليست لديهم قابليات وكفاءات لمباشرة مهمة التحقيق.من هنا أعود إلى كتاب (عنوان المجد) وتحقيق السيد معن له، هل أدّى حقا في عمله ما ينبغي عليه؟ وهل تتوافر فيه شروط التحقيق؟ وهل يعد عمله هذا تحقيقا؟

ألزم السيد معن نفسه في مقدمة عمله بأمور هي من سمات التحقيق وينبغي توافرها في عملية التحقيق، منهما:

١— ((اعتمدنا مسودة المؤلف كأصل وأشرنا إلى الاختلافات في مواضعها فيما انفردت به نسخة الاصل حصرناه بين قوسين، وما اختلفت فيه النسختان (هكذا)

